هەژمــار
٢

باكيكاريا جامعا بغدا هاتيه چاپكرن

# فەرهەنــكا كوردي ـ (القاموس الكردي)

جەگەرخوين



# FERHENGA KURDI
## ÇEGER - XWIN



رەقابە لێ تەماشاكريە
بغــداد ـ ١٩٦٢

# بەرنامە

## ١ ـ بۆچي بلەز وسفك مە ئەڤ نفشت چاپكرن ؟

هەروەكو هاتەزانين بەشەك خوەندنا كوردى دكوليا آداب دە هاتە فەكرن ، دەرسەك كورمانجي هاتە قراردان وگەلەك جهـێ سەربلندي يە ژمەرە كۆ سيداێ دەرسا كورمانجي ئەز بوم ، تەنێ دڤابو هـن نفشتـێ كورمانجي هەبن كۆ بخوەندەڤانێ خوە بدم زانين ، هەروها ل جهم من ديوانا جزيرى و(مەم وزينا) خاني وچەند ديوانێ من پەيدا دبون لـــێ خوەندەڤانێ مە بديوانا جزيرى وخاني رازي نەدبون، ژبەر كۆ تێدە عربي گەلەك هەبو • هەروها مژي نكاربو هـەر تەنێ ديوانێ خـوە بێـژم ، ژلەورا ڤەگەريامە سەر چەند ، كەڤنە نفيسارێن خوە كۆ بەرى چەند سالا لجهم من دقول وكونجێ خانيا دە هاتبونە ڤەشارتن •

هەر چقاس من سێ جارا سەرگوهەري هـەڤ كـرن وگۆهازتـن وراستكرن ژي لێ هێژي ژكەم وكورتي وچەوتيا نەڤالانە :

## ٢ ـ داخوازا مە ژچاپكرن چ بو ؟

١ ـ ژبۆ آريكاريا خوەندەڤانێ خوە بكم •

٢ ـ آريكاريا زمانزان ورێڤەكرنا ژبۆ يەكتيا زمانێ كوردي •

٣ ـ بەري كۆ ژعراقێ دەركەڤم دڤابو ڤاچەند روپەلا چاپبكم •

ژبۆ ڤي آواي هێڤيدارم كۆ مەژي كەڤرەك ژدەڤێريا يەكتيا زمانێ كوردى دابي آلي • ئەگەر چەندا كەم وكورتي تێ دە هەبن ددەمێن هيتێ دە دكارن راستبكن •

:ـ ئەڤ تشتێ كۆ مە دڤان هەردو هەژمـارێ فەرهـەنگا خـوە دە نفيسي يە نەتەنێ كوردي ئەڤە ـ نەتەنێ كورمانجي أڤە ، بەلكي نەتەنـێ تشتێ كۆ دزانم ئەڤە • بەلكي گەلەك تشت هەنە كۆنەهاتنە بيرا من،چاوا كۆ گەلەك شيوە هەنە كۆ نزانم • بەلكي آليكاري يەكە ژبۆ فەرهەنگـــا مەزن ـ فەرهەنگا كـوردى يا تـەڤايي • لجـەم من تشتێ دفەرهـەنگ

ورێزمان وهۆزانی ده بێنه چاپکرن گەم وکورت ونه تەما من ، ژبەرکو دایرۆده ئەم نکارن هەر تشتي تەمام بکن •

٣ ـ عربي وسۆراني •

هەرسێ نقشتێ من بکورمانجي هاتبون نفیساندن لێ مرۆڤێن لجنا • آلیکاري دقەرارا خوەده هێڤي کربون کۆ هه رنەبي بکەم وکورتي ئـەز هنك گۆتنێ کوردي بعەرەبي تەفسیربکم ـ ڤەوه ژێرم • چاوا کۆ هـن ژخوەندەڤانێ مه دخوەستن هن شیوەیێ سۆراني تێکـەل بکـم • ژلەورا بێ کۆ خوه کاربکم من ئەڤ بارێ ها دانه سەر ملێ خوه •

هەروەکو گەرەکه بێزانین کۆ مـدەتێ چاپـێ ژبـۆ هەرسێ نقشتا ژساله‌ك زێدەتر نەبو •

٤ ـ آلیکاریا جامعا بەغداد •

گەلەك بەختیارم کۆ جامعا بەغـداد آلیکاریـا مـن کریـه وپەسن وسپاسێ خوه ژجامعا بەغدا ره پێشکێش دکم ، لێ گەرەکه ئەم بدن زانین کۆ جامعا بەغداد (٥٠٠) دینار ژبۆ چاپکرنا سێ نقشتێ من دانه من ، لێ (٤٠٠) دینار دنقشتا یەکەم ده هاته خەرجکـرن ؟ تـەنێ ددەستێ من ده ژبۆ چاپکرنا ڤا هەردو هەژمارا (١٠٠) دینار مان ، لێ ناچاره من ژخەرجیا زارۆکێ خوه سالەکێ کێم کر وداني سەر حەقێ چاپێ •

هەر وەکو مەدێنش ده گۆتیه ، داخوازا مه نەفرێزا دنیایێ بو ، ئەز ژمال‌وپاره ره ستوخواري ودەست درێژي ناکم ، لێ مال نەبي تشتـــك پێك نایێ • کورمانج دبێژن :ـ مال قولۆچێ مێرایه •

٥ ـ شیوەیێ کورمانجي •

شیوەیێ کورمانجي گەلەك دەولەمەند وسفك ومەزنه :ـ

دەولەمەنده ، ژبەرکۆ هەمو جۆر وآوا یێ هۆزاني ـ ئەدەبي ورێزمـــان تێده پەیدا دبن • نێرومێ دجهێ گـــەرەك ده هەنـه ، شـەر ولاوك وآفیتنەسەر وچیرۆکێ رەنگارەنگ تێده پەیدا دبن •

سفکه ، ژبەرکۆ زێدە پاشگرێ بێداخـواز تێدە پەیـدا نابـن ، بەرنافێ پاشگر دکورمانجي دە نەمانە •

مەزنە ، ژبەرکۆ زمانێ کوردي وەکـە شـەرەفخان دبێـژي چار سیوەنە :ــ کورمانجي ، گۆري ، کولهۆري ، لۆري ، بەلام کورمانجي بگر سێ ، جارا ل گۆرا هەژمارا دەرەبەگي ولواء ول گۆرا هەژمارا نفوسێ کورد ژهەرسێ بەشەکانێ دي مەزنترە :ــ ئەگـەر کوردستان (٢٥) لواء بي (٢٠) ژێ کورمانجن • هەرتـەنێ حڤـدە ، حشدە لـواء دکوردستانا بن دەستێ ترکیا دەنە •

جا ئەگەر براستي دخـوازن زمـانێ کـوردي بـخوێنن ــ فێربن گەرەکە کورمانجي بزانن • نەکۆ داخوازم ئەوە شیوەکانێ دیکە بمرن نا ، بەلکی دخوازم زمانێ کوردي براستي بێ زانین •

## ٦ ــ هێڤـي •

ژهەمو خوەندڤانێ نڤشتێ خوە هێڤي دکم کۆ کەم وکورتي ونەسازي وچەوتیێ نڤشتێ من بدن زانـین وبنڤیساندن ژمـنرە بشێنن تاوەکـو دنڤشتا هەژمارا سیەم دە بەلاڤ بکم دگەل سپاس ومال‌آڤایي •

• • •

ئەڤ رەنج وستەم لمن سەراسەر
سیە سالە ژبۆ وە بومە رەنجبەر
خوارن وجي وجلك ژجەم من
بۆچي ژمەرا دبن بەدژمن ؟
هەم رۆژ وشەڤان مەسەر نەکر خەو
هەرچي ژمە هات مەکر ، مەبێ تەو ؟
دەنگێ مەبو کۆ بەرێ تە دا زۆر
ایدی چە دڤێ ژمن ؟ نەمەك کۆر !

ــ جگرخون ــ

٢٧ــ٨ــ١٩٦٢

## ( جو )

(جومك) ـ جهێ دەزگەهێ جاوە • كۆرتەكـــە جومكڤان تێدە رودني • وەهارەنگە بويەناف ژبۆوی دەزگەهی ع ( آلـــة للنسيج اليدوي ) •

(جورك) ـ ئەو پەزا كۆ هورروبێ هاڤلـــە • يانـــی بكارنايێ كۆبیی ســـەرميانـــەكی باش هورروروت وكێمبهايە • عـــ (نوع رديئي من الاغنام ) •

(جون) ـ رەنگەكە • دناف بـــەرا رەش و ســـپي دە يـــە • دبێژن :ـ سەرێ بارام جـون بويە ، يانی ســـپي كیتە ناف رەش • ع ( خليط من الاسود والابيض ) •

## ( جێ )

(جێر) ـ كـــوزە • تـــێدە آڤێ دكشینن • دەســـتك جێـرە يەكمسینە ••• هن دبێژن:ـ (جەر) • دبي ژ(گێر) هاتبي ؟ گێر ـ گێری ـ ناڤاوی فرەهە•

دبێژن ئەف دەن بگێرە ، يانی ناڤاویستورە ـ فرەهە •

(جێز) ـ كوما دەخل وزادە • دبێدە رێ دە كورمانج دبێژن :ـجێزا گەنمێ مەگەلەك مەزنـــە • ڤێ جێذێ بپیفە • ع (كومة من الحبوب) •

(جێنیك) ـ هەردو آليێ ســـەرێ مرۆڤانە • دبێژن :ـ بـــارام كەڤرەك لجێنیكا دژمندا • پاشێ بویە ناڤێ وان زێروزیڤێ كۆ ژن ددن بەرجێنیكاخوە • وە هارەنگە ژ مووێ جێنیكارە تێ گۆتن :ـ جینیك وبسك ع ( الصدغ ) •

(جێو) ـ يا (جێوی) • ئەوە كۆ دو زارۆك ، دوكار ، دو جاندار ژ دیكـــێ بزێن • دبێژن :ـ بزنامە زايە دوكار جێوی آنینە، ژنابارام دوكور جیوی آنینە • ژیەكی بەرژۆر جێوی یە •ع (التوأمان) •

## ( جي )

(جیب) ـ ناڤێ ئۆتۆمۆبیلەكە بچوكە

ناڤداره • ژئەوروپي هاتيـــه كوردي •

(جينار) ـ دراوسيه • دبي ژ(جي‌نەر) ـ جي‌گر هاتبي • ويّ چاخـێ گۆتنه‌كـــه‌كوردي يـه لێ ژ (جيران) هاتبـــي عربي يه • ع (الجار) •

(جيل) ـ گيل • ناڤي مللەتەكي يه دايرانێ ده يه • ( ابو الفداء الحموی) دبێژی :ـ فرس ـ فارس سێ مللەتن :ـ جيل ـ كورد ـ دەيلەم • لێ واديارە جيل‌ايرۆ ناڤێ (فارس ـفرس) ژخوەره ستانديه • • ع ( قوم من الفرس ) •

(جيم) ـ ناڤێ تيپەكێ‌يه • ( جيـــم وگولپەری) ناڤێ چيرۆكەكـه منـه •

(جي‌كرن) ـ يـا (بجيـــكرن) • جارەك بداخـــوازا (تحقيق) هاتيه:ـ بارام وندابوبو لێ من‌زو بجيكر ، ئەوتشتێ تەدگـــۆت مەبجيكـــر ••• هەروەهـــا بداخوازا (مكان) هاتيـه :ـ من مێڤانێ خوه هەمێ بەجي‌كرن• يانی من‌جي ژوا ره دی‌ـداني• ئەڤ(ژێدەرێ) تێ‌پە ره • ع ( بمعنى التحقيق والمكان) •

(جي‌بون) ـ ژێدەرێ تێنەپەره • لێ داخواز هەريەكه •

## ( ج ـ آ )

(جبرا) ـ ناڤێ ايلەكـه كورده بناڤ ودەنگه • ل سەرحەدايـــه ، خالدبەگێ‌جبری كۆد ســـالا ۱۹۲۵ م• هاتيه بدارڤەكـــرن ناڤداره ••ع (عشيرة كوردية) •

(جيا) ـ بسۆرانی بداخوازا جدا ـ جدوا ـ جهێ • هاتيـــه • دبێـــژن :ـ لێـك جيانابن ، ژهەڤ جدا نابن ـ جهێ نابن• (جياواز) ژۆر دەركيته • ئەمە جياوازه ـ جهێ‌يه•بكورمانجی جيا دەينه • نڤينا دەنيه • جی‌ـ جيا ـ جيكا بداخـــوازا نڤين هاتيه • چاواكۆ (جي)بداخوازا (مكان) هاتيه •

(جدوا) ـ جدا • جيا ـ جهێ هەمي

بداخوازەکێ نە • ع (بمعنى الافتراق) او الغير •

## ( ج - ێ )

(جهێ) - جيا - جدا - جدوا بداخوازە کێنە • چاوادەر باس بويە •

## ( ج - ي )

(جندى) - دبي بداخوازا تورن هاتبي • کورمانج دبێژن: - بارام وەکە جندىيەکي بۆتا يە • هەرودها دبي بداخوازا سپاه ولەشکەر هاتبي • وادیارەکۆ لەشکەرێ بۆتا گەلەک جوان وخوەشك ورندبو • ژلەورا ناڤ دار بونە • لێ دبي (جندي) ژگوندى دەرکەتبي وێ چاخێ ئەڤ گۆتن ژکوردي چۆيە عربي • گوندى لەشکەرێ دەرەبەگ و اميرا بون •

(جوردى) - ناڤێ مشکەکي ئەزنە • دبەيدەرا دە خويا د بن •

(جلفى) - ناڤێ نفشەك هەسپە • لجزیرێ پەيدا د بن •

(جوانى) - بجوکێ هەسپايە •

وهارەنگە بداخوازا خۆرتانى وگەنجي هاتيە • عط (المهرة) •

(جرجب) - ناڤێ چەمەکي يە • ژ رۆژآڤاێ باژارێ ماردين دەر دکەڤي • ع (اسم نهر في الجزيرة) •

(جڤات) - کۆمبونە • جڤينە • دبێژن: - ايشەڤ جڤات ل مالا بارامە • وها رەنگە بداخوازا (جمعية) هاتيە • (جڤاتا مللەتا - جمعية الامم) • ع ( الاجتماع والجمعية) •

(جيات) - بسۆرانى شون وجي يە • دبێژن: - بافەرهاد لە جياتي بارامبێ • يانى بەرە فەرهاد ل شونا بارام - ل جهێ بارام بێ، ژبەر بارام ڤەبێ • ع ( المكان والبدل] •

(جياواز) - بسۆرانى يە • ژجيا وجدا - جدوا - جهێ • دەرکەتيە • دبێژن: - ئەمەجياوازە • يانى ئەڤ يەکي دىيە - باشقەيە •

(جرر) - ژ (گرر) هاتيە • ڤايش وبە ربە رى يە • بارام وزۆرۆ

بهەڤ رە جرریّ دكن • يانی بەریەری ودژمنا هي‌يا هەڤ دكن • ركێ هەڤ د پەيڤن ـ دخەبتن •دبێژن:ـ چقا جرراتە نەخووشە • يانی دان وستاندن وهەڤالي‌يا تە نەخوەشە • ع [ التخاصم ] •

(جزير) ـ گزيرە • دناڤ بەرا دو سينۆرادە هنك قاد هەيە كۆ نايێ راكرن نايێ آژۆتن ، دبي چرگ نافێ وێ قادێ ـ وی سينۆری جزيرة ـ گزيرە • هەروها (گزير) نافێ‌وی مرۆڤێ كۆ دناڤ بەرا آغا و گونديا دە دچی وتێ • دتاريخێ آشور وسوريا نا دە ژ جزيرا بۆتارە تێ‌گۆتن :ـ گزارتایێ كاردۆ• يانی جزيرا كوردا • ع [ارض بين الملكين] في الارض السقى•

(جغ)ـدەنگێ بەردانا گۆلك وساك وبچوكێ سەوالايە • دبێژن:ـ جغ‌جغ ••• يانی دەركەڤن •

(جغ‌جغ)ـ وەكە گج‌گج ••• بويە ناڤ ژ بچوكێ سەوالارە ـ دەوارا رە • دبێژن :ـ جغ‌جغ دمالا بارام دە نە مايە • يانی بجارەك تالان بويە •• پەريشان ـ بەلەنگاز بويە •

(جلق)ـ كورمانج دبێژن:ـبارام بويە جلق ژمن ڤەنابي • لێ‌نزانم ژكوهاتيە •

(جوێلەك)ـبداخوازا قاتا بەلەنگازە• دناڤ گونداده (هەمپا) هەنە و(جوێلەك) هەنە • هەمپا دە ولە مەندن •لێ (جوێلەك) ئێ كۆ پەز و سەوالێ وان بهەڤ رە دبن (جۆلەك)• يانی نكارن هەريەك پەز بكرن وخوە دی بكن • ناچارە شڤانەكی دگرن و پەزێ خوە تەڤلی هە ڤدكن • ( جۆل ) بداخوازا تێكەلاوە • ع(الطبقة الفقيرة) •

(جڤينگ)ـ يا جڤينگەەجهێ كۆمبون وجڤينا جڤاتەكێ يە • (گـە) بداخوازا جي ـ شـون ـ دەر هاتيە • ع (مكان الاجتماع) •

(جل) ـ گەلەك جارا جل وبەرگ ل پەي هەڤ تێن • لێ دبي ژ عربي هاتبي •جل وبەرك ـ كنج بـــداخوازه كێ نه • ع [ الالبســـة ] •

(جن) ـ ژ (جان) هاتيه • بەجن ـ باجن ـ بەجنەوي ـ بەشنەوي نافێ ايلەكه كـــوردە دتاريخێ دە ناف دارە ل راژۆرێ شارێ ( نصێيـــين ) دكـــەڤي • د (تفسيراقـــرآنێ) دە دبێـــژن :ـ هنك ژ جنێ نصێبينێهاتنە جەم (محمد) مسلمان بونە • دبـي كوردێ بەجنەوي ـباجنی بن• چاوا دزمانێ عربی دە خويـــا دكي (جن)(الارواحالشريرة)• بەلام لەلام وانيە • نەارواحێ شريرە و نە ارواحێ رەحيمە پەيدانابن،لێ انسانێ شەرخواز وخيرخواز هەنە •

(جڤان) ـ ئەو كات وچاخ وجي ودە رە كۆ بـهەڤ رە سۆزدانە وێ دوێ چاخێ دە ول وی جي ب جڤن • ع (الموعد) •

(جڤين) ـ كۆم بونـــــه • دبێژن:ـ خەلكێ گوند ل هەڤ جڤيانـه كۆم بونه • ژێدەرێ تێ نـــه پەره • ع [التجمع] •

(جڤاندن)ـ كۆمكرنه • من خەلكێ گوند ل هەڤ جڤاندن ـ كـۆم كرن • تێ پەره •

(جهێبون) ـ جدابونه ـ جيابونـه • ژێدەرێ تێنەپەره •

(جهێكرن)ـ جدواكرنەـجياكِرنە• تێ پە رە:ـ بارام وفەرهـــــاد ژهەڤجهێ بون • مـن بارام وفەرهاد ژهەڤ جهێكرن •

(جيابون)ـ وەكە جهێ بونە • لێنە تێ پەره •

(جدوابون)ـوەكە جيابونە•تێنەپەره

(جياكردن)ـ وەكە جهێ كرنـــه • تێپەره •

(جدواكرن) ـ وەكە جهێ بونـه • تێنە پە رە •

(جهان)ـ دنيا يە• كۆما (جە)ـ گە • جي ـجەـ گە شون و دەرن • جهان بفارسي كۆمە بۆ جە •

پاشێ بو یـــه ناڤێ دنیا • عـ
[الدنیا] •

(جوان)ـ ب کورمانجی بداخوازا لاو هاتیه • بسۆرانی بـداخوازا باش هاتیه • بارام جوانه ، یاني هێژ پیر نەبویه • بارام جوانه • یاني باشه•جواني خۆرتانيیه• جواني چیلیکا مەهینێ یــــه • جوان‌رو ناڤێ ایکه‌که‌کورده ناف داره ل سینۆرێ کوردستانا ایران وعراق دکـــه‌ڤن • عـ
[ الشباب ] •

## ( چا ـ آ )

(چا) ـ ژنەوالێ بچوک تره • دبي جارنـا زوابيي وجارنا ب آف بي :ـ

بەسته　　های دەنایێ ! هایی
دە نایێ !
توکەڤۆکال دەرێ چاێ
••• بەســـتەیەک بڤي
آوی‌هەیه •
ع [المسیل] •

(چا) ـ یـــان (چاي) ـ ناف داره ، بەلاڤ بویه • ل هەردەر تێ ڤەخوارن • چای‌خانه • جهێ کۆ تێ دە چایێ دفرۆشـن • خانیێ چایێ •

(چالەپا) ـ ژچار لەپا هاتیه • یانی ل سەر چار لـــەپا دگـەری •
ژزارۆکاره تێ‌گۆتن :ـ بارام هێ ب چالەپا دچي • (لەپ) کەڤا دە ستە• دگەل‌تلیا • هن دبێژن چارلەپا • ژبۆ ســـڤکي (ر) آڤێتنه •

(چارتا)ـچارڤاته ـچارتا ـ چارآڤداه وەریسێ خوه چارتا بکـــــه چارآڤدا بدەبەر هەڤ • ئەزێ حەڤێ خوه چارتا بســـتێنم ـ چارڤاته •

(چاوا) ـ چەـآوایه • دبێژن:ـ بارام چاوایـــــه ؟ یانی بارام ب چ آوايي ـ بچ رەنگی‌یـــــه • آلاڤەکه پرسیاره • ع [ اداة للاستفهام ] •

## ( چا ـ ئه )

(چارپینه) ـ ناڤێ دیلانه کێ یـــــه • سڤکه • چار جارا پیێ خوه ل ڤادێ دخي• وهارەنگه زمرۆڤێ

حیلەبازرە تێ گۆتن :ـ بـارام چارپینەلێ دخی • یانی ل هەر آلی ـ ل هەرلاي دلیزي • ع [نوع من الرقص] •

(چاردە) ـ کەرتەکە ژمارێیە • چار و دەهە • لێ نزانم چما (ز) د چاردە ـ حڤـــدە ـ حژدە • نەهاتیە ، یارابویە • دبي ژبەر گرانی بي • ع [اربعةعشرة]•

(چارچوڤە) ـ چەمبەرا پەنجـــەرە و هن تشـــتێ دی یــە • چار ـ چڤـــە • (چڤ) قۆزی ـ خواربونە ـ ب سەرهەڤ دە ب چڤینە ـ ب سەر هەڤ دە خوار بکە • چڤێ رۆڤی ، خواری و حیلـە وقولـــە بازی نە • ع [الاطار] •

(چارگۆشـــە) ـ چار قۆزی ـ چار چڤە • گۆشە بفارسي گوهە ـ قۆزي یە :ـ گۆشـــي بە عامي مەدە ـ گوهە بەعامي مەدە • گۆشەیي ئەبرو ـ قۆزيێ أبرو یە • ع [الاطراف الاربعة ] • او ذوايا الاربعة •

(چارە) ـ دەردێ بێ چارە ـ دەردێ بێ دەرمانە ـ دەردێ بێ رێ• ترک ژی دبێژن:ـ چارە •

(چارمە)ـ ژچار هاتیە • دلیزەکـــە زارۆکادە تێ گۆتن :ـ یەکمە ـ دۆمە ـ سێمە ـ چارمە •••

(چاورمە)ـ ناڤدارە • دبێ ژترکي هاتیە زمانێ کوردی وعربي • گۆشتێ براشتی یە •

(چاڤ فرە)ـ مرۆڤێ دەست ڤەکری ـ جۆمەردە • چاڤ تەنگ برکێ وی یە • بارام چاڤ فرەیە ـ چومـــەردە • فـــەرهاد چاڤ تەنگە • چکوسەء ع (السخي)•

## ( چا ـ ێ )

(چارپێ) یانی تەبایێ سەر چارپێ ل سەر چار پیا دگەرن •دبێژن:ـ چارپێ دمالابارام دە نەمایە • لێ دبي مریشک وقاز •هەبن• ع (ذات القوائم الاربعة) •

(چاڤ رێ)ـ ئێ کۆچاڤێ وی ل ریا هنا یە • چاڤ نێریا هنادکی •ع [الانتظار] •

# (چا ــ ي)

(چاري)ــ خماري يه •چار ــچاري• بچوكێوي چاركــــه • ژن ب سەر خوەدادكن • لســــەرێ خوە گرێددن • هن دبێژن:ــ خماري •وهن دبێژن:ــ كتانــ كتانــي •( چارچــف ) ژفـر دەركەتيە • چارقۆزييـــه ــ چارگۆشەيە • (المأزر) •

(چارچي)ــ چارجي يه • چار پەر چەيە ــ چار رێيە ــ چاريانە• تركێژي ولۆ دبێژن • لێ لجەم من كوردي يە •

(چاڤبرچي)ــ ئێ كۆ تێر ناخوي • دبێژن :ــ بارامچاڤبرچييە • ياني چقابخوي تێرناخوي• ع [الذي لايشبع] •

(چاڤسۆري)ــ خورتي وگەويتييە• زۆر وســـــتەمكارييـــه • ع [الظلم والاستفزاز] •

(چاڤشكەستي)ــ ئێ ترسۆنەكە ــئێ كــــۆ چاڤێ وي ژدژمنێ وي شكەستييە • نەماكاري دەست هلێني • ع [المستكين] •

(چاڤنەباري)ــ نەخوەســـــتنــ دل نەخوازييە • ع [الحسد] •

(چاڤڤەكري)ــ ئێ هوشيارە ــ بيرە وەرە ــژيرەكە•جارنابداخوازا جۆمەردي هاتيە• ع [ الواعي المتيقظ ] •

(چاڤگرتي) ــ ئي كۆ تشـــتەكي نزاني ــ دنيا نەديتييـــه • ع (الغشيم) •

(چاندني) ــ تۆڤكرنە • دبێژن :ــ ايسال بارام گه لەكێ چاندني كريە • فەرهاد زۆرچاندنـــي كردوە • ژێدەرە ــ چاندن ــ چاندني • ع [الزراعة] •

(چاڤلدەري) ــ تۆلازييە • چاڤێ وي ل دەرە كه دييە •

(چاندي)ــ ئێ كۆ هاتيە چانـــدن • دبێژن :ــ تۆڤێتەئێ چانـدي چقايە ؟ ئێنە چاندي چقايە ؟ ع [ المزروع ] •

(چاكي) ــباشييە•كورمانج دبێژن:ــ كەفتاري چاكە ، ايشـــــكاڤول بكي دەيناكە ، هەربفيرەنگي نێچيرا كەفتاردكن •بسۆراني

بداخوازا باشه •لێ بکورمانجي
بداخوازا نیڤچه‌یه • یانی نـــه
باشه ونه خه‌رابه •ع (حسن)•
(چای) ـ ده‌رباس بویه • چا ـ چایێ
ناڤداره •
(چایچی) ـ ئێکۆ چایێ چێدکی ـ
چایێ دفرۆشي •وکه قاوه‌چي
یه • ع (قهواتی) •
(چاپ) ـ پیانه‌که • ژبۆپیڤانێیـه •
دوچاپ علبه‌کـــه • چارچاپ
ئۆلچه‌که • دبێژن:ـ لچاپا ده
ڤێ وی ! یانی ده‌ڤێ وی وه‌که
چاپێ‌یه • ع [نصف‌علب] •
بجوکێ وی چاپکه • جـارنـا
ماســــت تێ ده دمـــه‌یێنن ـ
دفرۆشن •
(چات) ـ یا چاتر • فره‌هه•دبێژن:ـ
بارام ده ڤ چاتره • یانی ده‌ڤ
مه‌زنه ـ ده‌ڤ فره هه • دبی
ژچه‌نه هاتبی •
(چاڤپیس)ـ ئێ تۆلاز و دزه • ئێ
کۆل دۆر ناموســـــا خه‌لکێ
دگـــه‌ری ـ ئێکـۆ دزي یێ
دکی • [ الدنیئی] •

(چاڤناس)ـ ئێ کۆبچاڤ خه‌لکێ
ناس دکی‌ـیان ژچاڤێ خه‌لکێ
واناس‌دکی •بارام چاڤ ناسه•
لکێ بنه‌ری واناس دکی • ع
[عراف] •
(چه‌کناس) ـئێ کۆ چه‌کا ناس‌دکی
دزانی کیژان باشــــه وکیژان
خرابه • وهاره‌نگه ئێ کـــــۆ
مرۆڤا ژی دناســـــي ژێ ره
تێ گۆتن :ـ چـه‌کناس • ع
[الخبیر] •
(چاخ) ـ ده‌مه ـ کاته • دبێژن :ـ
پارڤی‌چاخي بارام خۆرت بو •
چاخو به‌نگا بارامه ـ ده‌مـــــا
جواني یا وی یه • ع [ الحین
والوقت ] •
(چارداخ) ـ ئه‌یوان ـدۆلی‌ـصالۆنه•
(چار)کوردی • به‌لام (داخ ـ
داغ ) نزانم ژکوهاتیه • دبي
ژترکی هاتبی • ع [الصالون]•
(چارۆخ) ـ ژچـــه‌رمێ گاوگامێش
وده‌ڤا چێ دکن ودخن پیێ
خوه • چارۆخێ گـــه ماریێ
گه‌له‌ک باشن •ل شونا کالک

تێنە وەرگرتن • ع

(چار) ـ چوارە • ناڤێ ژمارەکێیە• ع [ اربعة ] •

(چارچار) ـ یەک یەک ، دۆ دۆ ، سێ‌سێ، چارچار •••

(چاتر) ـ کومانج دبێژن :ـ بارام دەڤ چاترە ـیانی دەڤ مەزنە• لێ بسورانی (چاتر) بداخوازا (چاکترە) ـ باشترە •

(چادر)ـ وەکە کۆنە ـ رەشماله • بەلام زیەمبویە ، نە زهری وموبە• پرێ جارا سپییە ، وژکۆن بچوکترە • ع (الخيمة) •

(چاکتر) ـ چاک ـ باشە • چاکترـ باشترە • بەلام لجەم کورمانجا چاک‌بداخوازا پاکە • یانی نە باش ونە خەرابە•ع (أحسن)•

(چامۆر) ـ [ قور ـ حەری ] یە • ئەگەر ژ (چا ـ مۆر) دو پارچە هاتیە ، دبی کوردی‌بی ، (چا) ژچەم بچوکترە • ( مۆر ) دبي (قور) ـحەری) بي• یانی حەریا چایێ ـ یان چراڤ •ع

[الوحل أو المستنقع] •

(چاردار)ـچاردارا باڤێ ئەمین بـە ربمال‌تێ ••• بریندارو کوشتی ل سەر دکن• چاردارن ب وەریسا گرێ ددن • ل ناڤ کورمانجا ناڤ دارە •

(چاڤ) ـچاوە • دچاڤادە چەند نفش هەنە:ـ چاڤێ‌رەش ، چاڤێ بەلەک ، چاڤێ شین ، چاڤێ زەر ، چاڤێ مێشني ••• لێ کوردا گەلەک ل سەرچاڤێ رەش وبە لەک ستران گۆتنە• ع [العين] •

(چارچاڤ) ـ مرۆڤێ هوشیارە • دبێژن:ـبارام چار چاڤە ، یانی گەلەک هوشیارە • وەکە مرۆڤەکی کۆچار چاڤێ وی هەبن • ع [مبالغة في الحذر واليقظة ] •

(چارگاڤ) ـ ناڤێ بەزە کێ یە • دبێژن:ـ هەسپێ من چارگاڤ دچي ، یانی ب هەر چار گاڤا دبەزي •بەزا چارگاڤ ناڤ دارە • ع (الركض) •

(چارچەف)ـ چار چفە ـ چارخواری یە• دو پارچە یە دوسەرێ وێ دۆخین کری نـە ژن ل نەوقا خـوە گـرێ ددن و پارچـێ ژۆری ب سەرخوە دادکن، ل شوناعبایێ کورمانج وەردگرن ـ لخوە دکن•ع (مأزر سوداء خاص بالنساء ] •

(چاق)ـ ژچۆکێ بەرژۆرە • ژبـۆ کیماسي تێ گۆتن • دبێژن :ـ تول چاتێ وی ؟ یانی نـــە خوەشک و نەوەکە ئێ خەلکێ نە • ع (فوق الرکبة في حالة الزم ] •

(چاف بەلۆق) ـ ئێ کـۆ چاقێ وی ژدەرڤەدە بلندبونـە ، یـــان گەلەک چاقێ خـــوە بەرددی مرۆڤ • ژخرابي ولۆد بێژن• ع [تأتی بمعنی الفاسق] •

(چارتاق) ـ چارقاتە • ســـەروبنێ هەڤ بونە • ئەز چارتاق ل تە بستێنم ـ یانی ئەزێ چارقات ل تە بستێنم •ع[أربعة مرات]•

(چاك) ـباشـــە ـقەنجە ـچێ یە •

دناف بەرا (چاك ـ باش ) و پیس دە پاك تێ گۆتن •بەلام لجـەم کورمانجـــا ( چاك ) بداخوازا (پاکە) •ع ( حسن ) جید •

(چالاك) ـ چالاك و چـەلـەنگ بداخوازا چاپك و پەهلەوان و ســـڤك هاتیە • چالاك و چەلەنگ جارنا لپەي هـــەڤ تێن • گەنارس و ژیهاتي یە • ع (بمعنی النشیط والبطل) •

(چاپك) ـ بچوکێ چاپە • دەرباس بویە •

(چاپك) ـ بداخوازا سڤك هاتیە :ـ سیدایێ باتی دمـەولدا کوردی دە دبێژی:ـ(چاپك و چەسپان ڤەگریا هاتە مال )• وەهارەنگە ترك ژی دبێژن :ـ (چابوك) یانی ســـڤك • لێ نزانم کێ ژکێ ستاندیە • ع (السرعة)•

(چارك) ـ بچوکێ چارە ـ بچوکێ چاری یە • دەرباس بویـــە • جارنا ژن ژمێرا رە دبێژن :ـ

چاركا من لسەرێ تەبي • ژبۆ كێماسـي ولۆ تێ گۆتن • (تصغير للمأزر) •

(چاريك) ـ چاريەكە ـ ژچارا يەكە • (الربع في الزمن) •

(چاريەك) ـ ژچارا يەكە • ژچاريك بداخوازا خـوه فرەهترە • دهەرتشتيدە تێ گۆتن • لێ ديسا بداخوازا (ربع) هاتيە ع • (الربع بصورة عامة) •

(چاريك) ـ بـداخـوازا (چارك) هاتيە •

(چارۆك) ـ وەكـە چاريكە • ژچار دەركتيە • چارك ـ چاريك ـ چارۆك • بيەك داخوازێ نە • هەمو بچوكێ (چار)ن •

(چارچك) ـ چارچار وەكە خوە ـ وەكە هەڤ • ع (المربع) •

(چاڤك) ـ گوزلك ـ پەرچاڤك • ع (النظارة ـ المنظار) •

(چاڤينوك) ـ ئێ خەلكێ چاڤينـي دكي • دبێژن :ـ چاڤێ بارا• بەرەوشێ ڤەدانە ـ بـارا• چاڤينۆكە ، يانى چاڤـێ وى بخەلكێ ڤەددن • لێ ئـەز بچاڤ باوەر ناكـم ، چاڤ نكارن بكەسي ڤەدن •

ع ـ (عين السوء ـ صاحب عين السوء) •

(چاڤ كتك) ـ چـاڤ پسيك • مرۆڤێ چاڤ شينە •

(چارلنگ) ـ چارپێيە ـ چارپايە • وكە :ـ گا ـ گامێش ـ دەڤـە ••• دولنـگ وەكـە :ـ مريشك •• لێ هنك هەنـە گەلەك لنگێ وا هەنە وەكە :ـ دوپشك ـ ژەهرمار ـ كەڤژال • ع (ذوى القوائم الاربعة) •

(چاڤ تەنگ) ـ مرۆڤێ چكوسـە • ع (البخيل) •

(چال) ـ دگوندێ بێ آڤ دە دكۆلن ژبـۆ آڤا بارانـێ تـێدە

بجڤی • خەلکێ چیا گەلەك

چالا دکۆلن • پاشێ بویە ناڤێ

دو گوندا :ـ چالا ئۆمەریا ،

**چالا هەبزینیا بچوکێ وێ**

چانکە • ع (الصهریج) •

(چال) ـ بداخوازا بەشە • دبێژن :ـ

**سوارێ هەسپەکی چالي بەشي**

**نێرە ••• چال ئەو هە سپێ**

کۆ ئەنیا وی بەشە •

ع (الاغر) •

(چام) ـ دارا چام ژسپی‌دارێ مەزن

ترە ، بەژە ، تێ کرین

**وفرۆتن • گەلەك ستور وبلند**

دبي • بازرگانی پێ دبي •

لوەلاتێ مە کێمە •

ع (شجرة تشبه الحور) •

(چارشەم) ـ کورد و فارس ب شەڤا

**دژمێرن ، لێ عرب برۆژا**

دژمێری • شەڤا چارا یە •

شەم ـ شەو ـ شەڤە •

ع (الاربعاء) •

(چاپان) ـ ناڤێ جاوەکی یە • دبي

**ژ ناڤێ چاپان ـ ژاپۆن ـ یابان**

هاتبي • گیم‌بها و بێ رومەتە •

ع (خام معروف) •

**(چاپکرن) ـ چاپکردن ـ لچاپدانە ـ**

لچاپ‌خستنە • طبع کردنە ـ

طبع کرنە ع ـ (طبع الشیء) •

(چاك‌کرن) ـ چاك‌کردنە ـ

**باش کرنە •**

ع (العمل الطیب والاحسان) •

(چاندن) ـ چاندني تۆفکرنە •

دبێژن :ـ بارام زادێ خوە ـ

**تۆڤێ خوە چاندی‌یە یاني**

**خستیە بن قادێ •**

ع (الزراعة) •

**(چاودێران) ـ چاڤ نێری‌یە •**

ع (الانتظار) •

(چارین) ـ چارینێ خەیام ـ رباعیات

خیام • ع (الرباعیات) •

(چەندا) ـ بداخوازا (مەگەر) •

هاتیە • ئەزێ هەرم چەندا

بارام ناخوازی •

ع (وان) •

## ( چە ـ ئە )

**(چەتە) ـ رێگر و تالانکەر و خون**

رێژ و شەرخوازن •

ع (قطاع الطرق) •

(چەره) ـ یان چێری • ئەو گەیایێ کۆ پەز و سەوال دخون •
ع (المرعی) •
(چەنتە) ـ هور وموریێ خوه تێ دە بجي دکن • ل شونا خورج ـ تور هاتیە • دبي ژ ئەوروپي هاتبي •
(چي) ـ چ ـ آلافەکە پرسیاری یە • چي دخوازی ـ چ دخوازی ؟
ع (اداة للاستفهام) •
(چەرخی) ـ لشونا (فرنگ ـ آنە) دپارەیێ کەڤنارە دە خویا دکي • (٥) فلس بون • چار چەرخي مەجیدیەک بون •
ع ـ (خمسة فلوس قدیمة) •
(چەفي) ـ یان کەفي • مێر ل سەرێ خوە گرێ ددن • هن دبێژن جەمەدان • ژبۆ ژنا :ـ ئەپری ـ پۆشي ـ تەمەزی •
ع (الکوفیه) •
(چەلەبي) ـ کورێ زوات و مالمەزنا یە • شعرەکە شیخرزا شاعرێ کوردێ ناڤدار لسەر جەلەبي بترکی هەیە داخوازا وی ددی خویاکرن •
ع (احفاد الامراء) •
(چەنتەلي) ـ ناڤێ نفشەک تفنگە دبن جهێ فیشەکا دە چەنتەیەک هەیە • وەک تفنگێ انگلیزی ـ روسي •
ع (نوع من السلاح) •
(چەپ) ـ دەمبەر راست دە هتیە لدەستێ چەپێ ، دەستێ • چەپ هەره ، راست هەره •
(چەپ وراست) قافیەکە ـ مەلایێ جزیری یە •دبێژن :ـ بارام چەپە • یاني بدەستێ چەپێ کار دکي •چەپ هاتیە ـ خوار هاتیە • چەپ لهەڤ دانا دەستایە • بچوکێ وی چەپکە • ع (یسار) •
(چەلپ) ـ دەنگێ لێدان و کەتن و لێخستنێ یە • گۆ چەلپ و کەت ،گۆ چەلپ وشەقامەک لێدا •
(چەلیپ) ـ دبي بداخوازا ( صلیب ) خاچ • هاتبي (چەلیپا) دشعرا جزیری دە بڤێ داخوازێ

هاتیه :ـ تەرح و سونبل بونه
رەنار و چەلیبا یەك ب یەك
لە و مە زەنار و چەلیبا یەك
تەنێ یەك جارە بە س •
هن ژ نك دێرێ فە تێن قەستا
كەنشتێ هــــن دكـن
نە ژڤانم ، نە زوانم بەر دەرێ
خەماری بەس ••••
(چەوت) ـ خوارە ـ ركە ـ مقلوبە•
چەوتە ـ نەراستە ـ شاشە •
ع (خطاء ـ غلطه) •
(چەوس) ـ چەوساندن وەكـــــو
چلپاندنە • سۆرانيیە •
ع (       ) •
(چەمچ) ـ یا چەوچ • ژدار و هاسن
و بافۆن چێدكن پێ آفــێ
ژدەنا ـ ژچەرا دەردخـــن •
بچـــوكێ وێ چەمچكـــە ـ
چۆچكە •
ع (الغرافة الصغيرة المصنوعـة
لشرب الماء) •
(چەرخ) ـ دۆلاب و گەرا دۆلابـێ
یە • چەرخا فەلەكێ نافدارە•
(چەرخچی) ئێ كو چەرخێ

چێ دكي ـ ئێ تشتا چـــەرخ
دكي • ع (       )
(چەولەخ) ـ یا چۆلەخ • هنـــك
فلەهێ بۆتا نە • بهـــەفرە
دگەریان ، كاركەربـــون •
پێشیا گۆتیه :ـ (چەولەخا هینی
كەفرا مەكن) •
(چەرد) ـ گەردە • چەرمەكـــــی
مەزن پێ آفێ ژچەما دەردخن•
عرب دبێژن :ـ كەرد • لـێ
دشعرێ كوردی دە گـەلەك
هاتیه • (سیاەچەردە) •
(چەند) ـ آلافەكە ژمـارە پرسیاری
یە • چەنـــد مرۆڤ هاتن ؟
شاگردێ خوەندەگهێ چەندن؟
ع (اداة عددی للاستفهام) •
(چەرەز) ـ دەندكن • چەرزانـدن
خوارنا دەندكا یە ـ خوارنـــا
چەرەزا یە •
(چەپەر) ـدشەرا دە كۆزكە • لـێ
دهن شونا دەسێنجە • چەپەرا
خانيیێ مە ـ سێنجا خانی یە •
چەپەرا رەزا ـ سێنجا رەزایە•
(چەر) ـ بداخوازا (چرا) هاتیــە •

دبێژن :ـ چەر دكن ؟ چـــرا وا دكن • چرا ـ چـــــی ـ چەررە چەرر بداخوازەكـــێ نه • ع (اداة للاستفهام) •

(چەور) ـ بداخوازا تەواشە ـ دۆنە• سۆرانی یە • ع (مدهن) •

(چەقچەق) ـ دەنگێ چەقچەقۆكێ یە • (چەقچەقۆك) دارەكی بچوكە • بگەوریا آش‌ڤـــــە گرێ ددن دا وەكـــو لبلب دەخل بێ خوارێ •ئەو دارك دەما لكەڤرێ آش دكەڤـــــي چەقچەق ژێ تێ • ژلـــەورا نافێ وی بویە(چەقچەقۆك)• كورد دبێژن :ـ آش چویـــە پەیی چەقچەقۆكێ كەتیە •

(چەقماق) ـ ناڤدارە • چەقماقـــێ تفنگێ نگێ وێ یە • چەقماق بێ آگـــر ڤێدخـــن چغـارا ڤێدخن • ع (قداح) •

(چەرق) ـ دەنگێ شكەستنێ یـــە • چەرقین ژیـتـــێ گۆتـــن • چەرقچەرق ولۆیە •

(چەرمەلاق) ـ ژچەرم و لاق هاتیە • چەرم ـ پیستە • لاق ئـــەو گۆشتێ كۆ نابێ خـــوارن ـ وەزا و بێ تەواش و گۆشتە • دبێژن :ـ بارام خوە كریـــە چەرمەلاق • یانی تشتەك ژێ دەرناكەڤي •

(چەلاق) ـ ئێ ـ آ كۆ گـــەنەكێ دگەری •وەكە چەلاقا دەوە ـ چەلقانـــدنا دەوە • یانـــی تەڤلیھەڤە ، كەس تشتكـــي ژێ نزاني • دبێژن :ـ آقلـــێ بارام چەلقیایە • سڤك بویە •

(چەلاق)لشونا سەرسەریێە• ع (ثرثار) •

(چەك) ـ بداخوازا (سلاح) هاتیە • چەك و بۆسات آلافێ جەنگ وشەرن • جارنا لشونا كنجـ تێ • چەكێ خوە وەرگرە ـ كنجێ خوە وەرگرە •

(چەك) ـ جارنا بداخوازا پەرا تێ• لشونا پەرا تێ • بهایـــێ وێ وەكـــە بهـــایێ پەرایـــــە • دبێژن تە ژ بانقـــێ چـــەك ستاندیە ؟ ع (صك) •

(چەپك) ـ لهەڤخستنا دەستایە • هن دبێژن :ـ چەپلك •
ع (التصفیق) •

(چەرموك) ـ باژارەكی كوردە بندەستێ تركایە •
ع (مدینة كوردیة) •

(چەولیك) ـ مێرگێ دۆرا چەمانە • هن دبێژن :ـ حاویك ـ حاوینگ • دبێ ژچۆل هاتبێ ژبەركۆ نابێ راكرن ـ آژۆتن، نەقادا كەسی‌یە ، بێ خودی یە ـ چۆلە •
ع (الارض التی تقع ضمن حدود النهر ولیست ملكا لاحد بل مشاعا بین القریة) •

(چەوكچەوك) ـ دەنگێ كوچكێ بچوكە ، دەنگی چێلیكێ تەبا یە • ع (صوت صغار الحیوانات) •

(چەنگ) باز و ملە • تقایی‌یە • ژمرۆڤ و تەبا و چفیك و وتوتكا رە تێ گۆتن • گەلەك جارا چەنگ وبازك بهەڤ رە تێن • ع (الاجنحة) •

(چەنگ) ـ خوە هلدانە ـ خوە آڤێتنە • دبێژن بارام ژجی چەنگ بو ـ خوە چەنگ كر • یانی ژجهێ خوە بلند بو چو جیكی دی قەفزی •
ع (القفز) • چەنگ كرن ژێدەرێ وی یە •

(چەنگ) ـ بداخوازا كولمە • چەنگك آڤ بدە من ، چەنگك آرد بدە رەوشێ ••• یانی كولمك آڤ، كولمك آردە • هن دبێژن :ـ (مستك) مست بداخوازا چەنگ ـ كولم هاتیە •
ع ـ (حفنة) •

(چەنەگ) ـ بداخوازا چەنگۆ یە ـ بداخوازا (چەنە) • سەرێ هەردو هەستی‌یێ رەخێ ژێری ژ دەڤێ مرۆڤ ـ جاندارە • كۆ لژێر دەڤ دجڤن • هن دبێژن :ـ زەنی • ژهەر یەك ژڤان هەستیا رە تێ گۆتن :ـ (آرگوشك) •
ع (الحنك) •

(چەلەنگ) ـ پەهلەوان ، سفك ـ گەرناس ـ ژیهاتی یە •

ع ـ (البطل) •

(چەپل) ـ مل و دەست و بازك و چەنگە •

ع (الزند او الساعد) •

(چەپەل) ـ گوری ـ كـوّتی ـ كەچەلە •

ع (الملوث از النجس) •

(چەتەل)ـسێ گوايكە•نە كوردی‌يە• لێ هاتیە ناڤ زمانێ مە •

ع (الشوك) •

(چەتل) ـ دبێژن :ـ چەتـل‌خێرە • یانی خێرەكە مـەزن ـ پر ـ زۆرە • دفـردە (چەتـــل بداخوازا گەلەك هاتیە •

ع (الكثیر) •

(چەڤەل) كوچكێ نەكەدی ـكوچكێ چولێ یە • هن دبێـژن :ـ واویك و هـن دبێـژن :ـ تۆریك •

ع (الواوی) •

(چەنگل)ـ دبێژن :ـ رەوشێ ژ بارام دەستێ هەڤ چەنگلانـدنە • وەك چەنگال دەستێ خـوە دانە ناڤ هەڤ • چەنگلانـدن زێدەرێ وی یە • دبێـژن :ـ بهەڤ بچەنگلێنە • هـن دبێژن :ـ بشەنگلێنە ، یانـی بهەڤە گـــرێدە ، وەك چەنگال باڤێژە هەڤ •

(چەنگال) ـ یا چەنگەل ـ چەنقەل • كاروان وكاركـەر باش دزانن زهاسن چێدكن وپـێ بارا باردكن ـ هل‌ددن ملێ‌خوە • لێ هن چەنگەل هەنە كـۆ ل مال تشتا بوانڤە بدارڤەدكن ـ دادلەڤێنن •

ع ( الكلاب ) •

(چەمبل) ـ دەستكێ بەرۆش وساتل و قادولك وكاخك ••• هن دبێژن :ـ دەستك • بچەمبلێ بەرۆشێ بگرە •

(چەمال) غەم و دەرد و بارگرانـي یە • دبێژن :ـ چەیە ؟ تــە چەمالا فەرهاد دایە سەر ملـێ خوە ـ یانی تە بارێ وی دایە سەر ملێ خـــوە ـ تو غەم و

دەردێ وی دخـــــــوی ـ
دكێشي •
ع ـ (تحمل هموم الناس) •
(چەوال) ـ خاش • وەكە تەلیسە •
اێ ژموو وهرییێ چێ دكن
درێژ و زرافە ، ژبۆ بـــــارە
بازرگانی ـ كاروانی پێ دكن•
ع (الگونیة ـ اكیاس) •
(چــەم) ـ ژرۆبار مەزن تـــــرە •
(رۆ) چەم ـ (بار) یا ژ بهار ،
یا ژ باران هاتیە • ئەگەرباران
نەباری ، یا نەبهاربي دبـــــي
بچكـــــــي ـ زوا ببي • لێ
چەم هەر دبی هەبي • لـــێ
گەلەك كورد هەنە كـــــــۆ
(رۆبار) لشونا چەم دبێژن •
هەروهـــــا رۆبار د دیلـۆك
وبەستێ كوردیدە ژچەم بێتـر
هاتیە :ـ
بـــەردان
فی رۆباری خومە خومە
وێ لبەر هاتی قال وقورمە
مەمكێ گەورێ سێف وخورمە
••• روبارژی نێ گۆێن •

ع (النهر) •
(چـــەم) ـ چۆیە ـ دارە • ژبـــــۆ
شەر باشە •
ع (العصي) •
(چەرم) ـ پوست • چەرمێ گـــا ،
چەرمێ ، چێلەكا •
ع (الجلد) •
(چـــەن) ـ چەنەگە ـ چەنگۆ یە •
سەرێ هردو (آرگوشكا) كـــۆ
ل بەر دەف ـ ل ژێـــــر دەف
دگهێن هەف دبي چـــــەن •
دەرباس بویە •
ع (الذقن) •
(چەنكرن) ـ چەنـــگ كـــــرنە ـ
قەفزاندنە • دەرباس بویـــە •
ژێدەرێ چەنگە • تێپەرە •
(چەنگبون) ـ ژێدەرێ تێنەپەرە •
داخوازا وان یەكە •
(چەقچقاندن) ـ ئەوە كۆ دوكەفــرا
لهەف خي چەقچـــەق ژێ
بێ •
(چەنگلاندن) ـ دەرباس بویـــــە •
ژێدەرێ چەنگلە • چەنگلاندن
ئەوە كۆ چەنگێ خوە وەكـــە

چه‌نگالا بـخن ناف هه‌ف •
(چه‌لپاندن) ـ حه‌رماندن نجس کرنا
تشته‌کـی یـــه • دبێـژن :ـ
کوچکێ ماستێ‌مه چه‌لپاندیـــه
نجس کـ یه‌حه‌رماندیه •
ع (ولوغ الكلب) •
(چه‌لپزانـــــدن) ـ دشاقۆلــێ ده
چه‌لپزاندن هه‌یه دنقکـــێ‌ده
هه‌یه • چوک لسه‌ر شاقولێ
دانی لێ چه‌لپزی ، یانـــــي
نه‌گرت • تفنگا من چه‌لپزی •
آگر فێ‌نه‌که‌ت ، یا فیشـه‌ک
نه‌ته‌قیا •
(چه‌لقاندن) ـ لهـــه‌ف که‌تـــن ـ
هه‌ف‌خستنا آف وهه‌مي تشـتێ
رۆنه :ـ گه‌ورێ ماستێ خـوه
چه‌لقاندیه • چـه‌لق بێلـــێ
آفێ دکه‌فـــن • چـه‌لیق ـ
چه‌لق • چه‌لاق ـ گـه‌رۆک
ژفر ده‌رکه‌تیه •
ع (صوت الامواج) •
(چه‌وچه‌و) ـ یاشه‌وشه‌و • کـورت
وپستا ناف گوندایه • دبێژن :ـ
چه‌وچه‌و بناف گوند که‌تیـــه
لێ نزانم چیه ؟ یان شه‌وشه‌و
بناف بازێر که‌تیه ••• یانـي
تشته‌کی بدزی هه‌یـه خـه‌لک
ژهه‌ف ره دبێژن لێ نزانـــم
چیه • ع (الوشوشة) •

## ( چ ـ آ )

( چـرا ) ـ آلافه‌که پرســـياره •
دبێژن :ـ چرا بارام غه‌یدیه ؟
بۆچي بارام تۆره بویه ؟
ع (اداة للاستفهام) •
( چـرا ) ـ شه‌ماله ـ رۆناهي یه •
به‌رێ ژ کاخک چێ دکرن ،
لێ پاشێ ژته‌نه‌که چێ‌کرن •
دۆنێ گه‌نه‌ک و گاز تێ ده‌فتیل
دشه‌وتي •
ع (السراج) •
( چقـا ) ـ بداخوازا چـه‌قه‌ده‌ره •
چه‌قیاسه • ژکوردی وعربـي
گهایه هـــه‌ف • الافه‌کـــه
پرسیاری‌یه • چقا پـــه‌زێ وه
هه‌یه ؟ چقا سوالێ وه هه‌نه ؟
چقا جـــاو ژوه‌ره دفـــێ ؟
ده‌مه‌وداده بداخوازا چه‌قه‌ده‌ره•
ع (أداة للاستفهام) •

(چکا) ـ بداخوازا (هەلا) هاتیە • ژبۆ هوشیاری وبانگە • دبێژن :ـ چکا وەرە بێ بارام چەکریە ؟ تێدە هنەك پرسیاری هەیە • •
ع ـ (اداة للنداء والاستفهام)•

(چما) ـ وەکە (چرا) هاتیە • دبێژن :ـ چما بارام هاتیە گرتن ؟ چما نەسرین ژخوەندەگەهێ هاتیە ؟
ع (اداة للاستفهام) •

(چیا) ـ ل شونا (کێو ـ کوە) هاتیە • بەلام شاخ ـ کوپ زنار ••• پەرەچەپەرچێ چیا نە ناڤەکي تەڤایێ‌یە •
ع (الجبل) •

## ( چ ـ ئە )

(چرچرە) ـ ئەومرۆڤێ کۆگەلەك دەرەوا دکی ـ دچرێني •
ع (المبالغ في الكذب) •

( چرە ) ـ (چەرە) ـ بداخوازا ( چرا ) هاتنە • دەرباس بویە•

(چغارە) ـ جگارە ـ سکارە • بداخوازەکێ‌نە • ناڤ‌دارە •

ع (السجائر) •

( چلە ) ـ دزڤستانێ دە (٢٠) رۆژ ژکانونا یەکەم و(٢٠) رۆژ ژکانونا دوەم دبن چل رۆژ ناڤێ ڤا چل رۆژا چلەیە ـ چلەئێ رڤستانی یە • چلێ هاڤینی ژی ولۆیە • یانی (٢٠) ژ تەباغ و (٢٠) ژ تەموزێ چلێ هاڤیني یە • دڤان هەردو چلا دە رۆژێ بناف و دەنگن • دزڤستانێ دە گەلەك سار و دهاڤینێ دە گەلەك گەرمن •
ع (اربعينية الشتاء والصيف)•

(چل‌پەرە) ـ ناڤێ گیایەکي یە • لێ ل‌جەم من (چار پەرە یە) بویە چل پەرە • ژبەرکو پەلێ وی چار پەرچەیە ـ نەچل پەرچە یە •
ع (اسم نبات) •

(چفتە) ـ تفنگا نێچیر وراوە •
ع (بندقية الصيد) •

## ( چ ـ ئۆ )

(چنۆ) ـ آلاڤەکە پرسیارە • خەلکێ

کورداغێ دبێژن • چه - پرسیاره • تۆ - تۆن • بداخوازا رەنگه - توزه •
ع (اداة للاستفهام) •

(چرتۆڤرتۆ) - مرۆڤێ دەرەوین کۆ کەس پێ باوەر ناکي • وهارەنگه ناڤێ چیرۆکەکێ یه•
ع (الرجل السفیه) •

(چکۆ) - آلاڤەکه (ئەگەري - شەرتی) یه • دبێژن :- چکۆ بارام چویه ئەز ناچم •

(چلۆ) - آلاڤەکه پرسیاره چلۆ فەرهاد بتەنێ زۆرا دوهەزار لەشکرێ دژمن بریه ؟ چلۆ ئەمێ ژبن دەستێ دژمن دەرکەڤن ؟
ع (أداة للاستفهام) •

( چلۆ ) - بەلێ دارانه • پێشیا گۆتیه :- کۆ رێ بەرێ مه عەلۆ بي وێ خوارنا مه چلۆ بي • لێ چلۆ هەر تەنێ ژبەلێ دارا بەروی ومازی ره تێ گۆتن • ژڤانێ دی ره • دبێژن :- پەلێ دارێ •
ع (اوراق شجرة البلوط) •

## ( چ - ئي )

(چری) - لجەم بۆتا بداخوازا پائیزه • چریا پێشي ، چریا ناڤي ، چریا پاشي • بەلام پائیز خوه شتره •

(چلپی) - پەژکێ دارانه : - سترانەك دبێژی :-

لێ لێ جانی ! بەرفا گۆندێ
مه گرانه
لێ لێ جانی ! کوباری ! چلپی
و دارێ سالێ دبن دە مانه •••

## ( چ - ێ )

(چچێ) - چچکه - مەمکه • ژبۆ زارۆکا ره ولۆ تێ گۆتن •

(چرێ) - لیزەکه کوردی یه • دوبەندییە• قۆمك تێدەهەیه پوچکرن تێدە هەیه •

(چپ) - دەنگێ دلۆپێ آڤێ یه •

(چپچپۆ) ناڤێ شونەکێ یه • لچۆلا هەسارێیه • ژبەرکۆ

چپچپ ژآفیێ تــێ نافیێ ویێ بویه چپچپۆ •
ع (صوت نقاط الماء) •

(چپ) ـ رابونا سفك و بلــەزە • بارام گۆ چپ و رابو سەرخوە
ع (القیام بسرعة) •

(چلپ) ـ وەكە (چپ) ژبۆ سفكــی یە • بارام گۆ چلپ و رابــو سەرخوە • چلپاندن برینــا پەژالوكێ دارایــە • چــاوا ژبۆ خاپاندن تێ • دبێژن :ـ بــارام چەند دینــار ژ زۆرۆ چلپاندن • یانی ئەو خاپاند •
ع (الحیل) •

(چت) ـ رابونا ل سەر سەرێ خوە یە • دلیزا كاب و خلچـا دە خویا دكی • دبێژن :ـ كابا من چت رابو • خلچێ من چــت هاتیە •
ع (القیام علی رأسه) في بعض الالعاب •

(چرت) ـ دەنگێ چرانــدنێ یە • كراسێ بارام گۆ چــرت و چریا • (چرتێ) تێ گۆتن ژ وێ ژنكا كۆ وەكە كوچكــا گەلەك دگەری ل مال نامێنی رە تێ گۆتن •

(چفت) ـ بێقدۆشە • دبێژن :ـبارام چفتە ایرۆ هاتە مالامەو گایێمە مر • فەرها د چفتە ئەف سەرێ سێ ژنا دخوی • ع (النحس)•

(چفت) ـ بداخوازا جۆتە ـ زۆیە • ایرۆ بارام چفتەك كـــــەو گرتیە ـ جۆتەك كەو گرتیە• چفت چفــت وەرن ـ جــۆت وەرن • ع (الزوج ـ اثنان) •

(چروس)ـ رۆناهی یە • بچوكێ وێ چروسكە • آگرەك ژ دورڤە دچرسێنی • یانی رۆناهیا وی خویا دكی• ژدورڤە چروسكێ آگــرەكی خویــا دكن • ع (البصیص ـ الومیض) •

(چقاس)ـ چقا یە ـ چە قەدەرە ـچە قیاسە • ژ (چە قاس) بداخوازا (قاس) یا كوردی هاتیـــــە • دبێــژن :ـ قاســــكێ وەرە

مالا مه‌ـ ده‌مه‌كێ ـ بارام چقاس
لمـــالا وه مايـــه ؟ ع (أداة
للاستفهام) •

(چكوس)ـ مرۆڤێ ده‌ست گرتێ ،دران
دڤركێ ده‌يه • دبێژن :ـ بارام
گه‌له‌ك چكوســـه ـ يانـــي
گه‌له‌ك ده‌ست گرتى يـــــه ـ
چاڤ‌ته‌نگه • ع (البخيل) •

(چچ)ـ چچك ـ چچێ• مه‌مكـــه •
ده‌رباس بويه • ع (الثدى) •

(چراخ)ـ يا چراغ • رۆناهيا سه‌رێ
دارا يه • ع (الشعلة) •

(چرالخ)ـ يا چرالغ • داره‌كه سه‌رێ
وى دكوتن و آگر ڤێ دخن •ل
جه‌م مه گه‌ياك هه‌يه نافێ وى
چلالخ ـ چرالغ • دڤێ بابه‌تێ
ده بكار تێ • ع (المشعل) •

(چزز)ـ ده‌نگێ شه‌وتاندنێ يـــــه •
چزين ژێده‌رێ وى يــــه •
دبێژن :ـ مه گۆ شـــتێ خوه
دانى سه‌ر سێلێ گۆ چزز •••
يا چزين ژێ هات •يان چزچز
ژێ هات•ع (صوت‌شوى‌اللحم)

(چر) ـ ده‌ما شير ژ گوهانا تێ خوار
بچـــر تێ هـــه‌ر تيرێژه‌ك
چره‌كـــه • دبێژن :ـ چره‌ك
شير بده كورێ خوه •

(چر) ـ بســـــه‌ر هه‌ڤده هاتيـه
گۆڤاشتن • دبێژن :ـ ئـــه‌ڤ
په‌نيرێ مه چر بويه •يانى نايێ
خوارن •چروك ـ چكوسه •

(چرن)ـ ده‌نگێ چراندنا تشته‌كى يه•
جاوێ مه گۆ چرر•••وچريا ـ
ژهه‌ڤ چو ـ قه‌تيا •

(چرچر)ـ ده‌نگێ مرۆڤا يه • ئێ بێ
داخواز وبادى‌هه‌وا يه• دبێژن
:ـ چه چرچرا بارامه ؟ يانى
بده‌ره‌وا دكى چرچر ـ گۆتنێ
بێ‌داخوازا ـ بێ‌كار دبێژى •ع
(الكلام الفارغ) •

(چڤر)ـ دبي ژ (چه‌ور)هاتبي•خوارنا
گه‌له‌ك بته‌واشه •ع (المدهون)

(چنار)ـ وه‌كه سپي‌داره ـوه‌كـــه
(چامه) •ل‌به‌ر آڤا چێ دبي •
ع ( نوع من الحور ) •

(چراڤ)ـ آڤا كۆ دناڤ چامۆرێ ده

چر بویه • ع (المستنقع) •

(چڤ)ـ خاپ وقولەبازی یە • رۆڤي ب چڤا بناڤ و دەنگە • دبێژن :ـچڤێ وی وەکە چڤێ رۆڤي نە • ع (الخداع والحیل) •

(چڤ)ـ یا (چڤـچڤ) دەنگێ گولە بەرکا یـــە • دبێژن :ـ بـو چڤـچڤا گولا دەسەر مەرە • (چڤین) ژی تێ گـۆتن • ع (صوت الرصاص) •

(چق)ـ دەنگێ شکەستنێ یە• دارێ گۆ چق و شکەست •وهارەنگە چریق ژی تێ گۆتن •

(چقچق)ـ دەنگێ قەلاندنێ یە• من گۆشتێ خوە خستە ناڤ رون وبو چقچقا رون وقەلیـــا • چقچق ژێ تێ ـ یانی دقەلی• ع (صوت قلي الدهن) •

(چرق)ـ دەنگێ شکەستنێ یە •وەکە (چق) هاتیە • چرقچرق ژی تێ گۆتن• (قرچ)ژي ولۆیە• قرچین ژێ هات ـ چرقین ژێ هات یەکن • ع (صوت کسـر الاشجار والاخشاب ) •

(چریق)ـ دەنگێ لێدانێ یە • بارام گۆ چریق و زلاك لفـەرهاد خست •

(چك)ـ دهەمبەر پك دە هاتیە•دنیزا کابا دە خویا دکی • دبێژن :ـ کابا بارام چکە • یانی ل سەر پشتێ کەتیە • (پکە) لســەر زك هاتیە •

(چكچك) ـ دەنگێ ساعتێ یـــە • دبێژن :ـ چكچك ژساعەتـا بارام تێ• هەموتشــــتێ کۆ بمەکینەیە چكچك ژێ تێ• ع (صوت آلات المکائن) •

(چچك)ـ چچـ مەمك ـ هنگل ـ گوهان • هــەمو بداخوازەکێ نە • لێ وەکە هەڤنایێ گۆتن هەر یەك دجێنادە تێ گۆتن:ـ گوهانـ ژبۆ تەبا یە:ـگوهانێ، مێشـــنێ ، کۆهـــانــێ چێلەکێ ••• هنگلێ هەبانێ • جارنا ژبۆ کێماسی ژبــۆ ژنا ژی تێ:ـ گۆتن هنگلـێ خــوە

بنخومێنه ـ مەمكێ خـوه
بنخومێنه • ع (الثدی) •

(چرك)ـ مەكيناكه ـ آلافەكـه پێ
پەمبو دچركێنن ـ تۆڤ ژناڤ
دەردخن• چركڤان ـ چركچی
ئێ كۆ چركێ دگەرێني • ع
(مكينة حلاجة القطن) •

(چرك)ـ بداخوازا زێـدە هاتیه •
دبێژن :ـ بارام ايرۆ كربـو
چركا گۆشت ـ گۆشت كربـو
چرك • يانـي زۆر ـ بـو ـ
گەلەك ـ گۆشت داني بو •
ع ( بمعنى الكثرة ) •

(چوركـ)ـدەنگێ بـهەڤ خوەراندنا
درانايە• دبێژن :ـ بارام درانێ
خوە لڤـەرهاد دچوركێني ـ
بسەرهەڤ دە دگوڤێشـي ـ
دخوەرێني• ع (قض الاسنان)•

(چريك)ـ دەنگێ چوك و چڤيكـا
يە • بو چريكچريكا چوكا •
ع (صوتالطيور) •

(چرچرك)ـ ناڤێ تەباكی بچوك و
پيسه • ع (الصراصير) •

(چروك)ـ چكوسه • ع (البخيل)•

(چلك) ـ بارەكێ پچوكه • چلكك
گەنمێ مه هەيه • يانى بارەكی
بچوك ژگەنم لجەم مه هەيه•
دبي ژ(چل) هاتبي • يانی تێرا
چل رۆژي دكی • ع ( مقدار
صغير من الحبوب ) •

(چلەك)ـ مرۆڤێ بێنەفسه •چلەك
ژچل بداخوازا نەفس هاتيه •
چل ـ نەفسـه • چل ناڤـێ
بارچەمكێ يه • (چلەدانك) ـ
(معدة) • يه • ع (الطفيلي) •

(چلاك)ـ دارەكه •سەريكێ وی ب
چقلي يه • خۆرت و مرۆڤێ
ژخوه حسكری دخن دەستـێ
خـوه • هنك رەنگ دكن و
هنك بزێر و زيڤ دخەملێنن
•ايرۆ سەردار و سەرگەڤازێ
لەشكەر دخن دەستێ خوه •ع
(عصى منقوش او مصبوغبايدی
الرجال) •

(چڤيك) ـ ژچـوك مـەزنتره •
گەلەك جاران ل پەيي هەڤ

تێـن • چـوك وچڤیك • ع (الطیـــور الصغیرة اكبر مـن العصافیر ) •

(چرگ)ـ زورچكه ـ گهیایێ بتۆف وهور وكورته •لمێرگا شـین تێ • ع (حشائش) •

(چرنگ)ـ دهنگـێ لێدان ودهنگـێ گوهه • چرنگین ـ چرنگێني تێ گۆتن •

(چنگ)ـ وهكه چرنگه•دهنگێ زیف وزێر وصفره • ع ( كلمـــة صوتية ) •

(چل)ـ كارتهك ژمارێ یه • (٣٠ ـ چل ـ ٥٠) • چل زێر ـ چل رۆژـ چل مێرـ چل شهف••• دناڤبهرا سیه و پێنجي ده یه • ع ( اربعون ) •

(چل)ـبلاما قهلهو • ناڤێ بارچهمكێ یه •هن دبێژن:ـ چلا مههیرێ •ژبهر كۆ ایڤارا خوه داڤێژي ناڤ مههیرێ • ع (الخفاشة) •

(چل)ـ نهفسه• چلهكه ـ نهفسهكه• چلهدان(معدة) یه ـزكه• بارام

چلهكه ـ دزهكه • نهفسهكه • دزییێ دكی ، خوارنا خهلكێ دخوی•ع (الطفیلي والحرامي)•

(چم) ـ سهرێ چیا ـ پۆزێ كابـێ چمـه • (چم) ناڤێ چیاكـــی لژێرێ (ههسارێ)یه • چـم و هۆپ دبهر ههف دهنـــه ع (القمة) في الجبل •

(چلم)ـ زۆخ و گهرێز و لیكه • ع (وسخ الانف ) •

(چن)ـ وهكه چمه • سهرێ پۆزێ چیێ ـ سهرێ پۆزێ كابێ چن تێ گۆتن •

(چنچن)ـ پۆل پۆله ـ گازندهنه • دبێژن :ـ چه چنچنا ته یـه ؟ بۆچي ئهوهنده گازنده ئهكي ؟ ع (زيادة التشكي او شـــكوی بدون سبب ) •

(چرپاندن) ـ پاچلپاندن • نفشهك ژخاپ و دزی و قولهبازی یه• دهرباس بویه •

(چرین)ـ ژێدهرێ تێنهپهره•جاوێ مه چریا ـ من چاو چراند •

چرین - چراندن •

(چرکاندن)- پاقژکرنا پەمبو ب چرکێ یە •• مە پەمبوێ خوە چرکاندـ مە حەب ژێ دەرخستن • چرك آلاڤێ چرکاندنە • ع (الحلج) •

(چڤاندن)- خواربون - خوارکرنە• ئەڤ چەرمێ مە ب سەر هەڤ دە چڤیا یە ••من ئەو ب سەر هەڤ دە چڤاند • ژێدەرێ تێ پەرە • ع (التقلص) •

(چڤین)- ژێدەرێ تێ نەپەرە• کرناوی چڤیا یە - دچڤی - دێ ب چڤی •••• من ئەو چڤاند کرنا تێ پەرە بۆرییە •

(چفراندن)- نچ و پیژن • وەکە مرۆڤ چفاراکێ ب یەکی ڤە دەینی • ع (التحریض) •

(چقاندن) - دلیزا کابا دە • فەن و خاپەکە - حیلەیەکە • ع (حیلة في لعبة) •

(چقچقاندن)- شەوتاندنا ژێدەیە درون دە • هەن دبێژن قچقچاندن •

(چکاندن)- خستنا تشتکی دقادێ دە• ڤی داری ب چکێ نە • ب حەناڤ قادێ • ع (غرس الشيء في الارض) •

(چکچکاندن) - خوە راپێچانە • دبێژن :- بارام درەختا دە خوە چکچکاندی یە - خوە پێچایە• پێك هاتیە - خەملی یە • ع ( مدجج بالسلاح او شمر ساعده ) •

(چلڤراندن) - چراندنا ژێدەیە • کراسێ بارام چلڤریە - ژێدە چریا یە • نەما بکار تێ • ژێدەرێ تێ پەرە • من کراسێ بارام چلڤراند •

(چلڤرین) - ژێدەرێ تێ نەپەرە • کراسێ بارام چلڤریە •

(چلپاندن) - ژێکرنا سەرێ دار و پەژالوکا یە • دبێژن :- سەرێ ڤا دارا ب چلپینە • من سەرێ دارا- پەژالوکێ دارا چلپاندنە•

(چلپین)ـ زێدەرێ تێ‌نەپەرە • نەف دار بخوە چلپیانە •

(چلپاندن)ـ فن و خاپ و قولەبازی نە • بارام چەنـــد قروش ژ فەرهاد چلپاند نە •

(چلکانـــدن)ـ دەما آف دچالا دە ـ دبیرادە کێم دبي ژن دبێژن :ـ ئەم ژخوەرە آفێ دچلکێنن • یانی هندك ژێ دەردخن •

(چلکاندن)ـ دلیزەکـــە کوردی دە (داربەلك) دەخـــویـــادکی • دبێژن :ـ تە نەچلکاندیە •یانی تە دارێ خوە لێ نە خستیە •

(چنین)ـ پالە یادەخل و زادە • بچنەـ پالەیێ بکە ـ بدرو ـ ببرە •. ع (الحصاد) •

(چوین) ـ چون • رۆشتنە •ژێدەرێ تێ‌پەر (شاندنــە) • دبێژن :ـ بارام چو ـ من بارام شـــاند • ژبەرکۆ نکارن بێژن :ـ مـــن بارام چاند • ژبەرکۆ چاندني تۆفکرنە•ژبۆناکۆ بهەف شاش نەبن دفردە (چ) بویە (ش) • ع (الذهاب) •

(چۆخ‌سۆرا) ـ ائیکەکـــە کوردە • ژکۆچەرێ میرایە • وهارەنگە ل رۆژآفایێ زۆرێ (ماردین) بنافێ چۆخ‌سـۆرا بافکـــەك دوملي هەیە :ـ

**بافێ خێرۆ :ـ**

تەرکا بافێ خێرۆ ناکم حەتا
تەرەسێ چۆخ‌سـۆرا و
شەمرەخیا لمـــن وبافێ
خێرۆ ل دیاربـــەکـــرا
شەوتي نەکن گلي •••

ع (عشیرة کوردیة) •

(چۆخ‌رەشا)ـ نافێ ائیلەکە کوردە لێ نزانم ل کو دکەفن •ع (عشیرة کوردیة) •

(چۆمەرا)ـ نافێ ائیلەکە کوردە لناف هەفیرکا یە• دێراچۆمـــەرا راسەرێ شارێ ( قامشلۆکێ ) یـــە •

(چۆ)ـ دارەکە •بدەستێ خوە دکرن پێ شەر دکن • پێشیا گۆتیە :ـ ـهەچي چـوێ وی ســـتورە

آرڤانێ وی هوره •
ـچۆ ژ جەنەتێ هاتیە •

بارام بزۆرچۆنە مافێ خوه ـ حەقێ خوه ستاند • یا بچوێ زۆرێ ـبدارێ زۆرێ حەقێ خوه ستاند :ـ چۆ زچۆ ڤەدگەری• ع (العصي) •

(چۆ) ـ یا (چۆچۆ) دەنگێ آزۆتنا کەرا یە •چۆچۆ !یانی هەرە• دبي ژ(چەلۆ) یا هندی هاتبي • زمانێ هندی گەلەك کوردي تێدە هەیە • ژبەر کۆ کوردی ژ هندی هاتیە • زاز دبێژن :ـ بچۆ•سورانێ برۆ کورمانجی هەرە•

(چۆپی) ـگۆڤەندەکە بەلایی چەپڤە دچن ـدەرۆن • نفشـــەك ژگۆڤەندا کوردی‌یە • جارنـا ئێ پێشـــي چوەك دخي بن چەنگێ خوه ودگەرێ • دبي ژچـــەپي هاتبي ،یان ژ چۆبي هاتبي •یاني بەلایي چەپڤـــە دچن ، یـــان چۆ دخن بـن

چەنگێ خوه • ع (نوع مـــن الرقص الکردی ) •

(چۆت) ـ پاچەکي فرەهە بـــە کنجـــێ خۆە دە وەردگری - بچوکێ وی چۆتکە • دبـــي دکۆکـــا خوەدە بداخـــوە چۆخك هاتبـــي • ع (ملبوس کوردی) کالقطنی •

(چۆپ) ـ بداخوازا چۆیە • دەربـ بویە •

(چۆرس) ـ بداخوازا زمان نەخوشە •دبێژن:ـگۆتنێ بارام چۆرســ ـنەخوەشن ـ دەڤەرونە • • ع (الکلام البذيء) •

(چۆچ) ـ بزارافێ زارۆکا (چۆچ) کەرە • ولۆ ژوارە تێ گۆتن • رەوشێ ژکورێ خوەرە دبێژی :ـوەرە ل چۆچێ ســوار بە ـ وەرە تە ل چۆچێ سوارکـــ یانی تە ل کەرێ سوارکم •

(چۆخ) ـ قماشـــەکی گران‌بهایـە ژهری چێ دکن تاخم و پاتۆ و گەلەك تشتێ دی ژێ چێ

دكن • ناڤداره • ع (چوخ)•

(چۆتر) ـ چۆتێ ژهەڤده كـەتي يه ـ چۆتێ رزيايه •ع الخرق البالية) •

(چۆگ) ـ ئەژنۆيه ـ كابه • چۆگا خوه دا ئەردێ ـ كابا خوه دا ڤادێ • بارام سەرێ خوه داني سەر چۆگا ديا خـوه • ع (الكعب ـ الركبة) •

( چۆل ) ـ ڤالا يه ـ دەشته • چۆلا هەسارێ ـ دەشتا وێ يه • چۆل و چيا ـ دەشت و چيا نه • بسۆراني دبێژن :ـ چول بويه ـ ڤالا بويه • ع (الصحراء) •

( چوتل ) ـ يان (چۆتلمه) ـ خوارنه كه ژەهرييي‌يه • يـەك بانگ دكي و دبێژی :ـ وا بارام ! بارام بغەيد بەرسڤا وی ددی و دبێژی :ـ وەی چۆتلمه • يانی قوزلقـورت ـ ژەهـر دگۆتنا ته ده ـ يا ژتەره بي • ع (نوع من السم او شـيء مسموم ) •

(چۆن) ـ سۆراني‌يه • بداخـوازا چاوا ـ چلۆ هاتيـه • بارام چـۆن دەرۆ بۆ زاخـۆ ؟ چۆن ئەبي گەرناس بەتەنيـا شەر بكی ؟ ع (اداة للاستفهام) •

## ( چو • • • )

(چوقلي) ـ گولي شـاخ وسەرچلێ دارا نه • چوقلي‌يێ دارێ ـ گولي‌يێ وێ نه • بسۆراني دبێـژن :ـ سەرچـل • بكورمانجي چلي ژی تـێ گۆتن • ع (اغصان) •

(چوچ) ـ رونشتنا زارۆكا لسـەر قونێ يه • دێ ژ بچوكـێ خوەره ولۆ دبێژی :ـ كورێم ـ يا كـەچام ! چوچێ كـه ـ رونه •

(چور) ـ رەڤاندن وتالانه • دكابـا ده چور رەڤاندنا كابا يـه • دتالان وشەراده چور تالانكرنه دبێژن :ـ چـوره مال مێرێ

چێ كۆ ژخـوەرد تشتـكى بگرى ... ع (النهيب) .

(چور) چوركَ بچوكـێ وى يه . پەزا چوركَ ـ پەزا هوركه .
ع (نوع ردىء من الاغنام) .

(چورچـور) ـ بچـوكێ وى چورچوركه .
ع (آلة موسيقية قديمة تشـبه الكمان) .

(چوز) ـ ژێدەرێ وى چوزيـن . دەنگێ زكه ژبر چێنـا يه . چوزچوز وەكـه چـوزه . دبێژن:ـ چوزچوز ژزكێ مـن تێ . يانى گـەلەك برچى بومه . يا چوزين ژ دلێ مـن تێ .
ع (الشعور بالجوع) او حركة في البطن ـ صوت تـدل على الجوع .

(چوك) ـ ژچڤيك بچوك تره .
ع (العصافير) .

(چوچك) ـ بداخـوازا چوك و بچوك هاتيه .

(چون) ـ چوين رۆشتنه .ژێدەرن. لێ كۆم ژى ولۆ تێ :ـ بارا، وفەرهاد چون . ئـەم چون ـ ئەم چوين .
ع (الذهاب) .

## ( چي ـ ئۆ )

(چيكۆ) ـ بەرنافـەكي نەناسه . چومه مالا چيكۆ ـ چومه مالا ئەوكۆ . ژبونێرايه .

(چيكێ) ـ چيكێ ئەوكێ . ژبـۆ مێيانه :ـ چيكێ ـ ئەوكێ .
ع (اسم مبهم) .

(چيپ) ـ روت ـ تازى . چيپ لاخ ـ چيپ تازى .
ع (مجرد) .

(چيپ) ـ بداخوازا (چيم) هاتيه .
ع (السيقان) .

(چيت) ـ نفشەك خامه ـ جـاوه . رەنگ دكن .
ع (نوع من الاقمشة الخفيفة).

(چيت) ـ پەردا‌كه ژ (زلك) چـێ دكن . ددن بەر كۆنێ خـوه ـ ددن بەر رەخـێ مالێ ـ

رەخێ ژنا ـ ددن دۆر نڤینێ خوە دا چاخێ رازانێ خەلک وان نەبینی • پەردە ژهری و موو و جاوە • پەردێ ددن پاش‌چیتێ دکونا دە چیت و پەردە گەلەک خویا دکن ـ بهەڤرە داتینن • بەلام پەردە دناڤ مالا دە بێ‌چیتە • هەروەها لسەر خانی‌یا چیت بێ پەردەیە •

ع (حائل منقوش ومربوط بالخيوط بين جانب الرجال والنساء) •

(چیچەلاس) ـ هورک و وەزایە •

ع (الصغير الضعيف) •

(چیپلاخ) ـ روت و تازی یە •

ع (عريان ـ مجرد)•

(چیر) ـ یا چیرچیر • دەنگێ بهەڤ خوەراندنە ـ زۆرلێ‌هاتنە •

ع (كلمة صوتية) •

(چیر) ـ دژون و گوتن وخەبەرن• دبێژن :ـ بارام چیری فەرهاد دکی ـ دژونا ژێرە ددي •

ع (الشتائم) •

(چیز) ـ دەنگێ دیکێ قەلە ـ دەنگێ چیز • نیشانا شەکەستنا چیزۆکە • دەما دو دیک ـ دو چڤیک پەڤدچن ئێ کۆ درەڤي ـ دشکێ ـ قەلس دبي دکی چیزچیز•چیزۆک ئەو مرۆڤێ کۆ زو ژمەیدانێ درەڤي ـ خوە نادی ناف شەر ، دوری سیاسەتێ دچی •

ع (الانهزامى) •

(چیڤ) ـ دەنگێ چێلیکێ مریشک و چوک و چڤیکا یە • بەلام

د (کلچیڤ) دە بداخوازا چاف هاتیە •

ع (صوت فروخ الطيور) •

(چیق) ـ نافێ چڤیکە کی‌یە •

(چیک) ـ وەکە ئەوک • نافەکی نەناسە • ژبۆنێرا چیکۆ ـ وژبۆ مێ‌یا چیکێ هاتنە • دەرباس بونە •

(چیک) ـ پرێسکێ آگرن • چیکێ پەمبو • ئەوێ کۆ ژبەر کەڤان

دیەقزن • دبێژن :ـ کـوری بارام چیـك ژێ ناچن ـ بێ آگره ـ مێراني بێ نابي • ع (الشرارة) •

(چیكچیك) ـ لوبلوب ـ گازنده• مرۆڤـێ کۆدکی چیكچیك ـ چیكچیك ژێ تێ گەلەك پەریشان بویه• تشتەك ددەستێ وی دە نەمایه • ع (التشكی) •

(چیرۆك) ـ بجـوکێ (چیره) • جارنا چیرۆك و چیڤـانۆك بهەڤره و لپـەی هەڤتێن • دبێژن :ـ ئەڤ چه چـیرۆك و چیڤانۆکن؟ دبي ژ(جڤانۆك) هاتبي ئۆك ژبۆ پربونـه • ع (القصة) •

(چیڤانۆك) ـ لپەي چیرۆك تێ • ئەگەر ژ(جڤانۆك) هاتبـي بچوکێ جڤانه ـ کۆمبونـه • دەما ئەم بێژن :ـ ئەڤ چـه چیرۆك و چیڤانۆکن ؟ ـ یاني چه اخبارو اجتماعن ؟

(چیل) ـ بۆزێ سپیـه • گەلەك سپیـي یا وی فەکـریـە • دبێژن :ـ سوارێ هەسپەکـي چیلي بۆزی سپي یه • ع (الابیض الناصع) •

(چیم) ـ چیپ چیپلاخ ـچیپتازی• روته • دبێژن :ـ بچیپێ وی بگره و باڤێره دەرڤه • تـو لچیپێ وی ـ تەشکێ وی • بچیمێ وی بگره بچیـێ وی بگره ـ بتەشـکێ وی بگـره ـ چیمێ وی لهـەڤ دحەربلن • ع (السیقان) •

(چیم) ـ جرگ • زچیمەن هاتیه :ـ من چەند چیم ژ گزێرێ آڤـ خوه راکرن یانی چەند پارچه ژچیمەنا سینۆرێ آڤیا خـوه راکرن •

(چین) ـ پارچه •چینچین ـ پەرچه پەرچه :ـ

شعرا جزیری

چینچین کرن زولفێ سیا
کەسكئەتلەسا دیباقەبا
ایدی نیشان نابن خویا

تێکەل کرن بادێ سەبا ...
ع (القطعة) .

(چین) - وەلاتەکە ناڤدارە .
ع (الصين) .

(چیمەن) - مێـــرگ و گــەیا و بوهشتە . مێرگ و گولـزار و چیمەن لبەی هەڤ تێن .
ع (الروضة) .

## ( چێ .. )

(چێ) - باشە - چاکـــە . چێ‌تر - باشەترە - چاکتـــرە :- بارام مرۆڤەکي چێیە - پەیاکـــی باشە پیاویکی چاکە .
ع (الطيب - جيد - حسن)

## ( چێ - ی )

(چێری) - یان چەرە . چێراندنا پەز و سەوالا یە :- ایسال چێری‌یا پەزێ مە گەلەک خوەشـە . ئەز سەوالێ خوە لبەر چـەم دچێرێنم . هەسپێ مـــن دچێری . من‌هەسپێ خـــوە چێراند .
ع (المرعى) .

(چێلي) - بچوکێ هـــن تەبا نە . چیلی‌یێ مارا چیـلی‌یێ تەیرا ، چیلی‌یێ مشکا ، ... لهێـلا (آمودە - عامـودە عامودێ) ژ زارۆکێ مرۆڤا رە هەم تــێ گۆتن :- چێلي.

(چێکرۆخ) - جـــارنا بداخـــوازا (کرۆکە) و جارنا بداخـــوازا پێکراوە .
ع (بمعنى الصانع والمصنوع).

(چێتر) ژچێ هاتیە . چاکتــــرە - باشترە . (تر) آلافەکە . ژبۆ بێ‌تری وکێم‌تری هاتیە :-بارام ژ فەرهاد چێ‌ترە . زێدە ترە بڤەنجیا خوە . بــــــارام ژفەرهــاد - کێم‌تــرە کن‌ترە دبەژنا خوە دە .
ع (احسن - اجود) .

(چێلەک) - دەمبـــەر (گـــا) دە هاتیە . چێلەک - مانگایــە . بەلام مانگا نەراستە . ژبەرکو (گا) مێ نابي، هەر دبي نێر بي. لێ ئەڤ چەوتی دزمانێ مەدە هێ رانەبویــە . لێکولینەک

دور و درێژ ژ زمانێ کوردی ره گه‌ره‌که •
ع (البقرة) •

(چێلیك) ـ بچوکێ تلور و چفیك و چوکا نه • گه‌له‌ک جـــارا ته‌ڤاي تێ • بچوکێ چێلی یه• (چێلك) گونده‌کـــه ل‌نـــاڤ هه‌ڤێرکایه • (چێله‌ك) ناڤـێ دوگوندا ل‌ژێـرێ شــــارێ قامشلونه •
ع (فروخ) •

(چێل) ـ مه‌زنێ چێله‌که • ده‌مـــا ژن با دکن چێله‌کێ دبێژن :ـ چێلێ ! چێلێ ••• نابێژن :ـ چێله‌کێ • ژله‌ورا چێلـه‌ک بچوکێ چێله • چارنا (چێـل) بداخوازا (چێر) تێ هن دبێژن :ـ تو چێل بارام دکی ؟ یانی تو چێر بارام دکی •

(چێرکرن)ـ دژون کرنـه • دژون کردنه • قسه‌یێ خه‌راین • ع (الشتائم) •

(چێکرن)ـ باش‌کرنه ـچاك‌کردنه •درســـت‌کرنه • ع ( الخلق والتصنیع والابداع ) •

(چێبون)ـ ژێده‌رێ تێ‌نـــه‌په‌ره • چاك‌بونه •

## ( ح ـ آ )

(حا) ـ هن دبێژن :ـ حاحا ـ ژبـۆ تـــاز وپێ که‌نینه • تێ‌گۆتن ژوی مرۆڤێ کـۆ نکـــاری آرمانجا خوه پێك بێنی و خوه به‌لك دکی • ـحاـ وێ ره‌مۆ ژمه‌ره تالانا بێنی ؟ یانی نه‌بارێ وی‌یه لێ خوه لێ دکی به‌لا • حاحاـــوێ فاتێ ژمه‌ره تو کورا نه‌ینی ؟ یانی فاتێ نه‌ئه‌و ژنه کۆ بی دیا کورا ـکورا بێنی •

(حه‌تا) ـ هه‌تا • ژعربی هاتیه •(تا ـ هه‌تا ـ حه‌تا) بداخوازه کێ‌نه• تێده داویا کاره‌کی ـ تشتکی هه‌یه • چوم حه‌تا زاخۆ •

(حه‌وتا)ـ حفتێ یه • ل‌ناڤ سۆرا ولۆ تێ گۆتن •

(حه‌شتا)ـ بداخواز حه‌شتێ هاتیه •

(حه‌سنێ‌موسا)ـ ناڤێ ســــترانه‌کـــه

كورمانجي‌يه • دقاوانا ده هاتيه گۆتن •

(حه‌يده‌را) ـ ناڤێ ائێله‌كه كورده ناڤداره • دكه‌ڤي ناڤ بـه‌را كوردستانا بن‌ده‌ستێ ايـران وكوردستانا بن‌ده‌ستێ تركا •

(حه‌سه‌نا) ـ ائێله‌كه كورده ناڤداره دكه‌ڤي كوردستانا زۆري • ل‌هێلا بازارێ موشێ دكه‌ڤي•

## ( ح ـ ئه )

(حڤده) ـ حه‌فت و ده‌هـه • ناڤێ ژماره‌كێ يه ـ كارته‌ك ژماره• ع ( سبعة عشر ) •

(حشده) ـ حه‌شـت وده‌هـه • كارته‌ك ژماره• ع(ثمانية‌عشر)

(حنه) ـ ناڤداره • ژن ومێر ل پۆر و ده‌ستێ خوه دكن •

## ( ح ـ ئێ )

(حنێ) ـ ناڤێ به‌ستاكه كورمانجي‌يه• كه‌تيه ڤاوانا •

(حه‌ڤتێ) ـ كارته‌ك ژماره ـ حه‌وتا يه • كورمانج ولۆ دبێژن •

(حه‌شتێ) ـ كارته‌ك ژماره ـ حه‌شتايه • گورمانج ولۆ دبێژن •

## ( ح ـ ئي )

(حت‌حتي) ـ خوه‌شك وسـور وگه‌وره •دبه‌ستا(كه‌زي‌زه‌رێ) ده هاتيه :ـ

(حه‌ري) ـ چامۆره • كـورمانـج دبێژن :ـ (كۆ كه‌ر كه‌تـه حه‌ري‌يێ وێ خوه‌دي بگري ب‌ته‌ري‌يێ ) •

(حپ) ـ آلافه‌كه ژبۆ ته‌عجبه •ده‌ما لنگـێ مرۆڤ دكـه‌ڤي ناڤ حه‌ري و چامۆرێ دبێژي :ـ حپ ؟ ع ( اداة للتعجب ) •

(حرحپ) ـ وه‌كه (حپ) تێ گۆتن•

(حرپ) ـ يا حرپ‌حرپ • ئه‌و چون وته‌ڤگه‌را مرۆڤێ سـتوره ـ مرۆڤێ قه‌له‌وه • جارنا ژبۆ ژنا قه‌له‌و ره تێ گۆتن :ـ حرپێ• چاوا كۆ ژمرۆڤێ قه‌لـه‌وره حرپۆ تێ گۆتن •

## ( ح ـ ت )

(حەفت) ـ کارتەک ژمارە • بداخوازا ( حەوت ) هاتیە •

(حەشت) ـ کارتەک ژمارە • هن دبێژن :ـ هەشت •

(حوت) ـ ماسيێ مەزنە • عرب ولۆ دبێژن • لێ جارنا کورمانج لشونا دێو ـ حوت • دبێژن:ـ حوتێ حەفت سەري •

(حیت) ـ بزنا رەش ومو درێژە • حیتک بچوکێ وێیە •

(حەمس‌حەمس) ـ لکەفنەبازارێ دارێ ول سەرێ(دزێ‌ـکەلێ) سارنجێ آفێ هەنە ژوا رە دبێژن :ـ (حەمس‌حەمسک) ـ آفگیرە •

(حەیاس) ـ یا حەیاسە •کەمیەرەکە ژن ددن پشتا خوە •

(حێج) ـ هارودینە • ژ ( دەفە ـ حوشتر ) و گامێشا رە تێ گۆتن • وهارەنگە ژمرۆڤارە تێ گۆتن :ـ بارام حێج بویە ـ هارودین بویە •

(حج) ـبداخوازا (خورتـ بـەقوة) هاتیە •دبێژن :ـ بحجِ لێ‌خە! یانی خورت ـ بەقوت لێ‌خە •

(حەفسەد) ـ حەفتسەدە • کارتەک ژمارە • لێ پاشێ بویە نافێ ژنا • ع (سبعمأة) •

(حەش‌سەد) ـ حەشتسەدە • کارتە ژماری یە • ( ثمان مائة ) •

(حەزار) ـ هەزارە • کارتەک ژمارە •پاشێ هەزارێ بویە نافێ ژنا• ع ( الف ) •

(حرحر) ـ کەنێ زێدەیە • دبێژن:ـ بو حرحراکەنێ رەوشێ • لناف کوردا کەنێ بحرحر نەباشە • ع (القهقهة ) •

(حاش) ـ آلافەکە بانگێ یە • ژ بزنا رە تێ گۆتن • یانی راوەستە• دبێژن :ـ حاش حاش ••• فیرێ !

(حەوش) ـ لپێش خانی جیکی ڤالا یە • سەوال ویەزێ خوە تێدە بجی دکن • دبي ژهەفشي هاتبي •

(حەیف) ـ تۆلە • بارام حەیفا خوە هلانی ـ تۆلا خوە ستاند • ع ( الثأر ) •

(حۆق‌حۆق) ـ حیق‌حیق • کـــەنێ نەباشە • ژگەویتی چێ‌دبی ، یان ژنەباشی ـ نەقـەنجی چێ دبی • دبێژن :ـ گـــەورێ حۆق‌حۆق ژێ‌تێ • دبـــی ژدەنگێ پەز دەرکەتبی • دەما گۆنێ پەز تێ حۆق‌حۆق ژوان تێ • وهارەنگـــە حیق‌حیق ژدەنگێ کەرا دەرکەتیە •

(حەنەک) ـ گالتە ویێ کەنینە •

(حارک) ـ نافێ گەیاکـي یـــە • بجوانی تێ خوارن • سەوال بخوارنا وی گەلـەک قەلەو دبن •

(حادحادک) ـ دارەکە ل سینۆر و سێنجێ آفیا تێ چاندن •بدرەهە

(حۆفک) ـمەرکەزا لیستکێ یە •هن دبێژن :ـ قۆمک • ع (مرکز الالعاب ) •

(حەفت‌رەنگ) ـ نافێ قماشەکی یە • ع (اسم لبعض الاقمشة ) •

(حەرمەل) ـ نافێ گەیاکي یە • ژبۆ (با) • نەخوەشیا با (بکارتێ) •

(حەودەل) ـ گەبۆلەکە ژ شـــیرانی چێ‌دکن • ع (المحلبية) •

آورەک :ـ ئەف (ح) دکۆکا خود دە نە کوردی‌یە ژلـــەورا دبێنێ کێم‌وەشەیە •

## ( خا ـ آ )

(خالدا) ـ یا خالتا • نافێ ایلەکـــە کوردە مەزەنە • ایزیدی نە • دبی ژ خالدێوی ـ کالـــدێوی ئێ کەفنارە بن کۆ دکوردستانێ‌دە فەرمانداری‌یەک لدار خستنە • ع (عشیرةکوردية) •

(خوا) ـخوەدا •بەلام دفردە (خـو) یەک تەفگەرێ تێنە خوەندن لجیگەیێ (خا) هاتنە گوتن • ژلەورا مە دفردە نفیسي نـە • لێ دکۆکا خوەدە (خوەدا)یە• بکورمانجي ( خـــوەدا) ئەوێ کۆ خوە ـ دایە • یانی ئێ کۆ خوە آنیە هەبونێ ـ خوە پەیدا

كريه •ع (اى‌هو خالق‌نفسه)•
بكورمانجي خوه‌دا ـ خوه‌دێ•
بلام بسۆرانی(خوا) دبێژن•
ع (الاله ـ الرب) •

(خواركا) ـ نافێ آيله‌كه كورده •
ع (عشيرة كوردية ) •

## ( خا ـ ئه )

(خاسه) ـ نافێ جاوه‌كی يه •
ع (اسم لنوع من الخام) •

(خواجه) ـ ئه‌فه‌ندی يه • دبي ژ
فارسي هاتبي • ع (السيد) •

(خاليچه) ـ خاولی يه • گران بها يه•
لمالا رادخن • ايران
بچێكرنا وا نافداره • لێ
ايرۆ لگه‌له‌ك جها چێ دبن •
راژۆرێ كوردستانێ خاليچا
باش چێ دكن •
ع (سجادة) •

(خوارده) ـ مرۆفێ مه‌رده • ئێ
چاففه‌كری ـ جۆمه‌رده •
يانی گه‌له‌ك دكاری ئه‌راقێ
فه‌خوی •



(خامه) ـ نوگهايي • دبێژن :ـ بارام
خامه • يانی هێ باش نه‌بويه
مرۆف ـ هێ بيره‌وه‌ر نه‌بويه•
يانی هێ خافه ـ نه‌گهايه •
بسۆراني خاوه •
ع (غير ناضج) غير بالغ •

(خانه) ـ دهه‌ژمارێ ده مالكه‌كه ـ
جهێ ره‌قه‌مه‌كێ يه • دبي
ژ(خان ـ خانی) هاتبي •
هه‌روه‌كو (١) ألیف دخانا
يه‌كه‌م ده يه‌كه • دخانا دوه‌م
ده (١٠) ده‌هه • دخانا سيه‌م
ده ١٠٠ سه‌ده • دخانا چاره‌م
ده ١٠٠٠ هه‌زاره هه‌روها •••

(خوانه) ـ كوردێ شامێ ژ
(سفرێ) ره دبێژن • دبي
ژفارسي وكوردی ده‌ركه‌تبي •
جهێ (خوارنی) يه •
ع (الصفرة) •

## ( خا ـ ئي )

(خاتي) ـ نافێ ملەته‌كی يه كو
دتاريخێ ده كوردستان دناف
خونێ ده هشتيه • تالان

وكوشــــتن وسەرگێژیيەكە
مــەزن چێكريــــە • ژناڤــێ
(خات) وا دیاره كــۆ ترك
بن •
ع (اسم قــوم هاجــم على
كوردستان قبل الاسلام) •
(خاتی) ـ جارنا ل شــونا (خالتیك)
تێ گۆتن دكۆكا خــــوه ده
عربيیه • ژ (خالتي) هاتیه •
ع (الخالة) •
(خانچی) ـ خوەدیێ خانێ یــه •
یا ئێ ل بەر خانــــێ یه •
دكەڤاره ده خان ل شــــونا
(ئۆتیل) وكاراج بو • قاتـــا
ژێرین جهێ سەوال وقاتـــا
ژۆرین جهێ مرۆڤــا بو •
(خان) ـ خانچي •
(خانی) ـ ناڤو دەنگێ شاعرەكــی
ناڤداریێ كوردە كۆ دوەلات
پارێزی ده یەكەم مرۆڤــــە
دكوردســــتانێ ده تاریــخ و
ژینگاریا سەیدایێ (خانـــی)
دناڤ روپەلێ تاریخا مێــژوێ
كورد و هۆزاني ده جیكـــی

بلند گرتیه • دەما ( خانــی )
بناڤێ وەلاتپارێزی گــــازی
دكر ل(فرانسا) بكێرا ول دێر
وكەنشتا زكێ هەڤ دچراندن•
لێ مەخابن ! ملەتێ كورد نــە
شیار وآگادار بو بهائێ نڤیسینا
خانی نزانبو • بەر بنــەوالا
بندەستی ڤە بەرژێر دبو •
ع (اسم اعظم شاعر كوردی)•
(خانی) ـ خانو • ماله • خانيیــێ
من ـ خانوێ من ـ مالا منه •
ژ(خان) هاتیه • بداخــــوازا
مەزن هاتیه ع (البيت) •
(خوارزی) ـ خوارزا ـ خوشكەزا ـ
خواهەرزاده یه • خــوهـ ـ
خوشكه • (زان) چێبونــه ـ
زاین ـ زێدەبونه • (زایــن)
ـ (الولادة) • دســۆرانی ده
خوشكەزام ـ كور كــــەچ
پێكڤه دكەڤن بەر • ژلــەورا
ئەگەر بێژی :ـ خوشــكەزام
مردوه • كەس نزانی ئــەو
خوشكەزا نێره یان مــێیه •

لێ دکورمانجـــی ده • ( آ )
ژبۆ (مێ) و (ئێ) ژبۆ نێـره
:ـ خوارزیا من خوارزيیـێ
من • وهارەنگـــه بـــرازا ـ
برازي •

ع (اولاد الاخت) •

(خالي) ـ (خاليچه) یه • دبي (چه)
ژبۆ بچوکی هاتبي • وەکه :ـ
باخ ـ باغ ـ باخچه ـ باغچه•

(خاولي) ـ پەشگـــیر ـ دەستمال ـ
مەرحەمه یه • (لێ) دبـــي
ژترکی هاتبي • ع (المنشفة) •

(خاکی) ـ رەنگەکه • وەکه رەنگێ
خاکه ـ آخـــــــه • (خاك)
بفارسي بداخوازا آخـــــه •
سۆری ژی ولۆ دبێژن •
ع (لون ترابي) •

(خاکي) ـ نافێ قماشەکه کۆ رەنگێ
وی وەکه خاك ـ آخه •
ع (نوع من الاقمشة) •

## ( خا ـ ئێ )

(خاتێ) ـ ژخاتون هاتیه • نافـــێ
ژنایه • (خاتۆ) ژی تـــــێ
گۆتن •

(خوارزێ) ـ ژخوارزي ـ هاتیه •
مندالێ خوشکه ـ خوشـــکه
زایه •

(خانێ) ـ ژ(خان) بداخوازا مەزن •
هاتیه • نافێ ژنا یه (خانـــێ
ژی تێ گۆتن •

(خانمێ) ـ ژخانم هاتیه • ژنا مەزن ـ
(بانۆ) یه • بویه نافێ ژنێ •
خانمکێ ـ بچوکێ وێ یه •
جارنا خانمۆکێ تێ گۆتن •

(خانکێ) ـ بچوکێ (خان) بداخوازا
خانيیێ مەزن هاتیه • نافـــێ
گوندایه •

## ( خا ـ ئو )

(خواردو) ـ کرۆکه ـ ئەو مرۆفێ
کۆ خواریه ـ خـــــواردوه •
سۆرانيیه •

(خوارو) ـ دهەمیـــــەر ژۆرو ده
هاتیه • سۆرانیيه •

(خانو) ـ خانيیه • سۆرانیيه •

## ( خا ـ ئو )

(خاتو) ـ ژ خاتون • هاتیه • نافێ ژنایه •

(خاچو) ـ ژخاچ • هاتیه • نافێ مێرایه • فله لخوه دکن •

(خالو) ـ ژ (خال) هاتیه • برایێ دێیه • خالێ من برایێ دیا منه • ژعربي هاتیه •

(خاشو) ـ دبي ژ(خاش) ـ چەوال • یان ژخاشیک ـ گارس هاتبي• بویه نافێ مروڤا •

•••

(خاپ) ـ فەن و حیله وقوله بازی نه :ـ بارام فەرهاد خاپاندیه • حیله لێ کریه • ئەو ژرێ بریه ـ فەن لێ کریه •
ع (الحیل والخدع) •

(خواس) ـ مروڤێ بێ پێلاڤه :ـ بارام پیخواسه پێێ وی تازی نه ـ تشتک نەختیه پێێ خوه :ـ بارام پێخواسه • دزو مێرکوژ وتالانکەر وتەشقەلەچی یه •
ع (قبضای) •

(خاچ) ـ (صلیب)ه • خاچپەرەس ـ خاچحەبینه • ئێ کو ژ خاچ ـ ژ صلیب حەسدکی ـ دحەبێني ـ دپەرەسي • خوەش دڤێ ـ ئێ کو خاچ خوشویستێوی یه •
ع (الصلیبي) •

(خاخ) ـ دچیروکا ده دبێژن :ـ هێ ژنوڤه سەرێ وي کەته (خاخێ) گران • یانی کەته ناف سەرێهاتیێ گران • دنەخشا ده دبێژن :ـ گەورێ تەڤنا خوه چێکریه لێ (خاخ) ژێ بردانه • یانی تشتێ هێژا وکەس نەدی تێده چێکرنه •
ع (بمعنی العجائب والغرائب)

(خار) ـ ستریێ گولانه • دبي تەڤایي بي بەلام ژفارسي هاتیه• دکورمانجي ده هەر نەنێ دهوزان وشعرێ ده هاتیه • خارێ گول •
ع (الشوك) •

(خوار) ـ دهەمبەر راست ده هاتیه

:ـ ئەڤ دار خوارە ، یانی نە راستە • خوە خوار بکە • خواری ژێدەرە • هەن دبێژن :ـ خوارایی ـ خواریتی • ع (المائل) •

(خاش) ـ وەکە چەواله لێ پاریەك زراڤ ترە • زهری ومو چێ دکن • خاشۆ بویە نافێ مرۆڤا • خاشیك نافێ هنەك ژ گارسە •

ع (کیس طویل یستعمل للتعبئة والحمولة) •

(خاڤ) ـ خام ـ خاوە :ـ گۆشتێ مە خاڤە هێ نە پژیایە • ئەڤ (تا) خاڤە • هێ نە هاتیە بادان •

ع (غیر مستوی) •

(خازۆق) ـ آلافەکی کوشتنێ یە • شیشەکە زراڤ وسەرتوژە • دخن ناڤ هندروێ مرۆڤا تا وەکو دەرەنگ بمری •

ع (آلة قدیمة للاعدام) •

(خوارك) ـ ددرانێ سەوالا دە نفشەك دران نافێ وان خوارکە • لێ چاوا دبێژن :ـ گا خوارکێ خوە دستن حەفتا دە دەردخن • هێ گایێ مە خوارکێ خوە دەرنەخستنە • یانی هێژ جوانە •

ع (نوع من اسنان بعض الحیوانات کالثور مثلا) •

(خاپینۆك) ـ ئەو مرۆڤێ کۆ خەلکێ دخاپینێ • ئێ کۆ گەلەك خاپ لجەم هەنە •

ع (الحیال) •

(خاسوك) ـ مرۆڤێ کۆ خوە نادی جهێ بترس • ع (إنتهازي) •

(خاشیك) ـ نفشەك گارسە • نانێ خوارن • (پاچیك) ژ خاشیك پاکترە • جارنا ژنەچاری پاچیك تێ خوارن •

ع (نوع من الذرة) •

(خاڤك) ـ دزێرێ ئور دە چەرمەك هەیە گەلەك تەنکە • نافێ

وى خاڤكه • دبێژن :ـ بارام
خه‌نجه‌ره‌ك ل‌خاڤكا ئوریێ
فه‌رهاد خست •

ع (الجانب الاسفل من البطن)

(خالتیك) ـ ژعربي هاتیه • خوشكا
دیا مرۆڤه • ع (خالته) •

(خال) ـ ژعربي هاتیه • برایێ دیا
مرۆڤه •

(خام) ـ خاڤ ـ خ اوه چه تشتێ
نه‌گهایي خامه ـ خاڤه ـخاوه•

(خانم) ـ بانویه ـ ژنا دناڤ مالێ
ده ـ دناڤ ائیلێ ده مه‌زنه •
خاتونه • خانمۆكێ • خانمكێ
بچوكێ وێ نه • بونه ناڤێ
ژنا • ع (الست) •

(خان) ـ بداخوازا مه‌زن هاتیه •
خانێ بدلیسي میرێ به‌دلیسی‌یه
نیره •

(خان) ـ خانێ‌یێ مه‌زنه • مێ یه •
خانا مه مه‌زنه • لێ كـو
بێژن :ـ خانێ مه یانی میرێ
مه ـ مه‌زنێ مه •

(خانه‌دان) ـ مال‌مه‌زنه ـ ئێ كـو
گه‌له‌ك (خان) ژمالا وا
رابونه یا گه‌له‌ك خوارنێ
ددن • (خوارن‌دان) ـ دیسا
بداخوازا مالامه‌زنه •
ع (العائلة العریقة) •

(خاپاندن) ـ ژێده‌ره • (خاپ)
ده‌رباس بویه • بداخوازا
(حیله) یه • خاپاندن
ژێده‌رێ تێپه‌ره • (خاپینۆك)
كرۆكه •

(خوارن) ـ خواردنه • به‌لام ئه‌ڤ
(د) دسورانی ده زێده هاتیه •
دبي ژ فارسي هاتبي یان
ژكورمانجی هاتبي راكرن •
ئه‌ڤ تیا (د) دكرنێ ده
دكورمانجی ده په‌یدا نابي
:ـ بردن ، خواردن ، كردن
••• بجاره‌ك (د)تێ آڤتن•
ع (الاكل) •

(خواركرن) ـ ژێده‌رێ تێپه‌ره •
خواربون ژێده‌رێ تێنه‌په‌ره •
(خواري) كۆكا ژێده‌ره •
ع (المصدر المتعدی من الانحناء

او التمايل) •

(ژخواربون) ـ ژێدەرێ تێ نەپەرە • ژخواری هاتیە •

(خەباتکـــرن) ـ (خەبات) نضالە • خباتکرن ژێدەرێ تێپـەرە • دکۆکا خودە بداخوازا کارە • ع (النضال والعمل) •

(خواسبون) ـ ژێدەرێ خواســـە • تێ نەپەرە •

(خواسکرن) ـ ژێدەرێ خواسـە • تێ پەرە •

(خوازگین) ـ ئێ کۆ دچن بوکـــێ دخـــوازن • ژێـــدەرێ وی خواستنە ، خوەستنە • ع (الذين يخطبون العروسة)•

## ( خه ـ آ )

(خەسما) ـ دکورمانجی دە بداخوازا (خاصة) هاتیـــە • خانـــي دبێژی :ـ

خەسما دفي عصری دە کـــۆ
هەمیان
معشوق وحبیبە بۆ مە هەمیان•

یانی (خاصة) ، یا زێدەتر دفي (عصری) دە ـدعصرێ (خانی) دە کۆ (هەمیان) ـ مالـــێ دنیایي :ـ زیف وزێر دلدارە بۆ مە (هەمیمان) ـ بۆ کـــوژ هەمیان ـ تەڤا ـ پیکڤـــە ـ پێکوە • بەلام دعصرێ مە دە ـ دقرنێ بیستەم دە (هـــەمیێ (مەعبودە) بۆمە هەمیان • تێ دڤێ بێتە زانین کۆ (هـەمیێ بدەستێ مە ـ بدەستێ مرۆف هاتیە چێکرن ، ژلەورا بـــێ رومەتە ، وژهەرتشتي مەزنتر مرۆڤە • کۆ مرۆڤ بخوازێ دکاری هەر تشتی بکی • تێ مەخابن هێ مرۆڤ نەگهایە • هێ مرۆڤ خوە ناس نەکریە ، بپێشدە چویە لێ کۆر وبـــێ مژی یە • لســـەر (هەمیێ ئەڤ تالان وکوشتن وشـوات چێ دبن • ع (خاصة) •

(خوەدا) ـ خوەدێ ـ خوا ـ خود بداخوازا (اله) هاتیە • هـــ دبێژن :ـ خولا ـ خورا •
ع (اله) •

(خەرزا) ـ یان (غەرزا) • نافـــێ دەرەبەگی‌یەکە کـــــوردە لراژۆرێ چـــەمێ ( دجلە ) دکەڤی • (زۆقەید) و (زەوق) و (حەزۆ) و ( گـــوردلان ) بازارێ نافداری خـــەرزانە • وەلاتێ خـــەرزا گـــەلەك خۆشە • دبێژن :ـ

عەینك وعەیندار ، پیکەنـــد ومنار

خوەشترن ژپای تەختا خونکار •

(خوەزکا) ـ خوەزیکا • آلاڤ ویـــا گۆتنێ بداخـــوازا (خوەزی) نە • هن دبێژن :ـ خوزیـــا هەمو ژ(خوەزی) دەرکەتنە •

ع (أداة للتمني) •

خوزیکا ـ خوەزیا

بداخوازا خوەزکا هاتنە •

(خوەشکا) ـ (خوەشك) بداخـــوازا (جوان ـ دەلال ـ رند) هاتیە • باشێ بویـــە نافـــێ ژنـــا • (خوەشکۆ) بویە نافێ مێرا •

(خەلەجا) ـ نافێ ایلەکە کـــوردە •

لراژێرێ بازارێ ( ماردین ) دکەڤی •

ع (اسم عشیرة کوردیة جنوب ماردین) •

(خوەندا) ـ ئەو مرۆڤێ کۆ خوەندی یە ـ خوەندەوارە ـ خوەنـــدە ڤانە •

ع (المثقف) او القاریء •

(خوەندەگا) ـ گها خوەندنێ یـــە ـ جهێ خوەندنێ یە •

ع (المدرسة) •

## ( خه ـ ئۆ )

(خوەدۆ) ! ـ نافـــێ خـــــوەدێ ـ ناوی‌خوایە • د رەوشا بانگـــێ دە ولۆ تێ گۆتن •

(خوەدی‌ۆو) ـ وەکە خـــــوەدۆ • دبانگێ دە تێ گۆتن •

ع (کلاهما بمعنی یارب !) •

(خوەدانۆ)

(خوەدیکۆ) ـ هـــەمو بیـــەك داخـــوازێ نـــە • بـــەلام (خوەدان) بداخوازا (خوەدی) ـ (صاحب) هاتیە •خوەدانـــۆ

ژ(خوەدان) هاتیه •نەژخوەدێ هاتیه • خوەدێ ـ (رب) بەلام خوەدي ـ (صاحب)ە •

(خەمۆ) ـ الاڤەكـــه تێ ده غیـــد وپرسیاری هەیه •

(خوەدۆ) ـ ناڤێ خوەدێ یه •

## ( خه ـ ئو )

(خەسو) ـ ژبۆ مێر دیا ژنێ یه • بەلام (خەسو) ژبۆ ژنێ دایكا مێره • خەسوا رەوشـــێ دیا مێرێ وێ یه • خەسوا فەرهاد دایكا ژنا وی یه • دنـــاڤ كوردا ده گەلەك سەرپێهاتـــی لسەر بوك وخەسوێ هەنه •

ع (حماة) •

(خوەرو) ـ ساده یه ـ یەك رو یه• ئەم خوەرونـــــه • یانـــی بیانی‌یـــەك ـ بێگانەیـــەك دناڤ مه ده نینه •

ع (الصافی) •

(خەوتو) ـ بسۆرانی بداخـــــوازا نڤستی ـ نوستی ـ رازایـــی هاتیه • كرۆكه • (خەوتـن)

ژێدەرێ وی یه • لـــێ لنڤ كورمانجا ژ (خـــەو) پێڤه • وشه ژێ دەرناكەڤن • دبێژن :ـ بارام كەتیه خەو • دخەو دەیه • خەوا بارام تێ• خەوا بارام نایێ • بەلام (كـــرن) ژێ دەرناكەڤن • ع (النائم) •

## ( خه ـ ئي )

(خوەدی) ـ خوەدان • بداخـــوازا (صاحب) ـ مالك • هاتـــه دبێژن :ـ خوەدی‌یێ مریـــــ كۆره • ئەم بێ خوەدی وبـێ خوەدان مانه • دڤرده دبـــي

(خوەدان) بداخـــــوازا ( رب ) هاتبي • خوەدانێ ڤێ زەڤي بێ بارامه •

ع (الصاحب او الرب) •

(خوەزی) ـ ژبۆ تشتێ كۆ بدەستێ مرۆڤ ناكەڤي • بەلام هێڤی ـ هێوا ژبۆ تشتێ كـــۆ درسته بگهێ دەستێ مرۆڤ •كورمانج دبێژن :ـ

ـ (كەس بخوەزیا ناگـــری

باقیٚ کەزیا )
خوەزکا ـ خوزیکا ـ خوەزیا
ئەڤ بداخوازا خوەزی هاتنه
ع (اداة او کلمة للتمنی) •

(خەرجی) ـ (مصروفا) کۆخەرج
دکن • جارنا لشونا راتب ـ
معاش هاتیه • خەرجیراه ـ
خەرجیا ریٚ یه •
ع (المصروف) •

(خوەشی) ـ خۆشي ، دهەمبەر
نەخوەشی ده هاتیه • جارنا
بداخوازا ساغي هاتیه :ـ بەره
سەریٚ ته خوەشبی • یانی
ساغبي • لیٚ بریٚ جارا دتام
وزوق ده خویادکی :ـ گرارا
وه خوەشه ، ئەڤ سیٚڤ
خوەشه ایشەڤ خوەشه • دلیٚ
رەوشیٚ خوەشه • بەلام دبي
هیٚ فرەتربي •
ع (الذوق والسعادة والبقاء) •

(خوەلي) ـ خۆله • دکورمانجی ده
(خوەلي) ـ آری یه • پشتی
ترافا آگر سار دبي دبي خوەلي
بەلام وا دیاره کۆ بسۆراني

بداخوازا آخه • لیٚ هەروەکۆ
لپەیي هەڤ تیٚن :ـ خاك
وخۆل ـ آخ وخوەلي • دیار
دبي کۆ درسته دهەردو
شیواده بیەك داخوازیٚ بن•
ع (الرماد) •

## ( خه ـ ئه )

(خەرته) ـ جۆتکرنا بیٚهاڤله •
دبیٚژن :ـ مه شوڤا خوه خەرته
کریه •

(خوەره) ـ مرۆڤیٚ کۆ گەلەك
خوارنیٚ دخوی • ئەڤ خوەره
یه ـ گەلەك خورانیٚ دخوی•
ئەڤ سەوال خوەره یه ـ
گەلەك خورانیٚ دخوی •
ع (الاکول) •

(خوەنده) ـ یان خوەندا • دەرباس
بو یه • مرۆڤیٚ کۆ خوەندی
یه ـ خوەندەواره ـ
خوەندەڤانه • ع (المثقف) •

(خوەشه) ـ ژخوەشی هاتیه •
دەرباس بویه • یان خۆشه •

خوەشي ژێدەرە •

(خەرگەلە) ـ جهێ کۆمبونا خەلکێ یە • یان ب‌خوە کۆم وجڤینە• ددیوانا جزیری دە هاتیــە • یانی (گەل خربویە) ل‌شونەکێ دفردە (گەل) بداخـوازا کۆم و جڤاتە ـ بداخـوازا (شعبە) لێ (خر) بداخوازا کۆم بونە• یانی ملەت کۆم بویە •
ع (التجمع) •

(خەلوەخانە) ـ ژعربي وکـوردی گهایە هـــەف :ـ (خەلوە) عربي‌یە •لێ (خانە) کوردی‌یە، جهێ ئۆل پەرستێ کوردایە • دخەلوەخانێ دە گونەهێ خوە تێنن بیراخوە ونفسـا خـوە پاک وپاقژ دکن •
ع (الخلوة) في التعبد •

(خوەنە) ـ آلافەکـــە • تــێ دە پرسیاری وغید هەیە • وەکـە (خەمۆ) یە •
ع (أداة للاستفهام) •

(خەزرات) ـ بداخوازا نەجـارە •
دبي زعربي هاتبـــي • یان ژ(خەرتە) هاتبـي خەرتـە دەرباس بویە بداخوازا کارێ نەباشە ، دجوتکرن دە جوتکرن نەباشـە یان ژ (خرت‌خرت) هاتیە • وێ چاخێ دەنگـــي یە ـ کوردی‌یە • (خەریتک) ئەو تشتێ کــێ مـرۆڤ دخەرتینی • خەریتکا بنـێ بەروشێ • ع (نجار) •

(خەرپێت) ـ باژارەکـــی کــوردە دکەڤي رۆژ آڤایێ (آمـــەد دیاربەکەر) • ایرۆ لبـــەر (خەرپێت) باژارێ (العزیـز) آڤابویە •
ع (مدینة کوردیة غربـــي دیار بکر) •

(خەرت‌پرت) ـ

(خەلات) ـ باژارێ خـــەلاتێ • سیبانێ خەلاتــێ • عــرب دبێـــژن :ـ (أخـــلاط) • باژارەکی کوردستانا بن‌دەستێ ترکیا یە • نێزیکی گۆلا وانی

يه • سيانێ خه‌لاتێ دچيرۆكا
(سيامه‌د) و (خه‌جێ) ده
ناڤداره • دبێژن :ـ هه‌ردەم
به‌رف لسه‌ر هه‌يه •
ع (مدينة كوردية على بحيرة
وان) •

(خه‌لات) ـ دياری‌يه • زعربي
هاتيه (خلعة) يه •

(خه‌بات) ـ كاره ـ كيفه‌راته ـ
نضاله • خباتكرن ژێده‌رێ
تێبه‌ره • ع (النضال) •

(خه‌ريت) ـ دمرۆڤا ده بداخوازا
ڤيت ومه‌زن وگرسه • دبێژن
:ـ يه‌كێ بارام چه خه‌ريتاكي
مێرايه ؟ يانى چه مه‌زنه ـ چه
گرسه •
ع (الرجل القوى الضخم) •

(خه‌ريت) ـ ئه‌و تشتێ كۆ تێ
خه‌رتاندن • بجوكێ وى
(خه‌ريتك)ه •

(خه‌س) ـ ناڤداره تێ خوارن •
ته‌نێ كوردێ ايزيدى دژمنێ
خه‌سێ نه • دبێژن كۆ يه‌كي
ئۆل‌په‌ره‌سێ قه‌نجێ خوه‌دێ
دناڤ خه‌سا ده هاتيه كوشتن
خوينا وى لخه‌سێ كه‌تيه
ژمه‌ره خوارنا وێ نه‌درسته •
ده‌ما نفرا لهه‌ڤ دكن دبێژن
:ـ وه‌ى خه‌سا موصلێ دمانێ
كه‌تۆ ! ئه‌گه‌ر (خه‌س) دچالا
آڤێ كه‌ڤي ژێ ڤه‌ناخون •
ع (معروف) •

(خه‌ج) ـ ناڤێ ژنا يه •
(خه‌ج‌وسيامه‌ند) سه‌رێهاتى
يه‌كه ناڤداره • لسيانێ
خه‌لاتێ چێبويه •
ع (اسم معشوقة) في قصة
كوردية رائعة قديمة •

(خه‌رج) ـ خه‌راج پێش وڤێرگو
وضريبة يه • جارنا بداخوازا
حه‌ق تێ • دبێژن :ـ خه‌رجێ
بارام ئه‌ڤه ـ حه‌قێ وى ئه‌ڤه •
خه‌رجێ خوه دايه ـ پێشا
خوه دايه •

(خه‌راج) ـ وه‌كه (خه‌رجه) •
جزيرى دبێژى :ـ(ژئه‌سپه‌هان
تێتن خه‌راج) •

(خەليج) ـ ئەو جهێ كۆ آقا دەريـا بناف قادێ دچرێني •
ع (معروف) •

(خەرزاد) ـ نافـێ سـەرداره‌كي كورده بـائيلا خوەفه تێكەلـي ائيلا شەمەرێ عرب بونه • دبي (خرسات) ژ(خرزاد) مابن •
ع (امير كوردى اختلط مـع عشيرته بعشيرة شمر العربية) •

(خەز) ـ نافێ ائيله‌كه تركه بخوين خوارى دتاريخێ ده ناف‌دارن• كورد ژدەستێ وان گـەلەك سەرگێژى وپەريشانى ديه •

(خەنز) ـ ل‌كۆرا كۆ هاتيه بهيستـن بداخوازا (گەني) هاتيـــه • لهێـــلا بازارێ ( مەلەتيا ) مرديسي ولۆ دبێژن •
ع (المتعفن) •

(خوەبەر) ـ ژبەرخـــوه :ـ بارام خوەبەر هاتيـە ، يانى كەسـي ژێره نەگوتيه هــــەره ـ ژبەرخوه هاتيه •
ع (من عنده) •

(خوەسەر) ـ ســـەربخـــوه • خوەسەرهاتيه ، يا سەربخـوه هاتيه • يانى بتەنێ هاتيـــه • بێ‌كۆ كەس ڤێره بێ •
ع (مستقلا) •

(خەزور) ـ خەزورێ ژنێ بافـــێ مێرێ وێ يه • خەزورێ مێر بافـێ ژنا وى يـــــه • بارام خەزورێ رەوشێ يه ـ بافـێ مێـــرێ وێ يـــــه • زۆرۆ خەزورێ فەرهاده ـ بافێ ژنـا وى يه • ع (حم) •

(خوشتر) ـ خوەش ـ خوەشـــــي دەرباس بونه • خوەشتر ژبـۆ زێدەبونه ، يانى زێده خوەشه• (تر) آلافه‌كه ژبۆ زێدەبـــون هاتيه دڤردە گەره‌كــــە خوەش هەبي تا بكارن بێــــژن :ـ خوەشتر • ژبۆكۆم خوەشترين دبێژن :ـ خوەشترين • يانى ئەگەر ( خوەشـــــي ) تـەك بي خوەشتر تێ گۆتن • لـــێ كۆ خوەشى گـــەلك بـــن خوەشتر وخوەشـــترين تـێ گۆتن • لێ خوەشترين زێده

دفارسي ده هه‌يه • ژبه‌ركـۆ
ترين دفارسي گه‌له‌ك هاتيه •
ع ( احلى ) •

(خوه‌ش‌مێر) ـ مرۆڤـێ باشـــه • دشه‌راده خوه‌ش‌مێر گه‌لـه‌ك هاتيه • بداخوازا گـــه‌رناس هاتيه • ع (البطل) •

(خه‌نجه‌ر) ـ نـــاڤداره • دبـــي ژ(خون‌گه‌ر) هاتبي • لێ عرب ژى ولۆ دبێژن • به‌لام بعربي كوردى‌يه • ع (معروف) •

(خه‌وار) ـ ئێ كۆ گه‌له‌ك خـــه‌و دكي • ع (كثير النوم) •

(خه‌يار) ـ ناڤداره •

(خوه‌ش) ـ (٣) دهه‌رتشتى‌ده ســێ كارت هه‌نه :ـ خوه‌ش ـ پاك ـ نه‌خوه‌ش •
ع (الحلو ...) •

(خه‌رتوش) ـ نه‌كوردى يـــه • لێ هاتيه كوردى • وه‌ك (ده‌سته) هاتيه :ـ خه‌رتوشه‌ك پاكێت، خه‌رتوشـــه‌ك چخات • يانى ده‌ستاك • ع (معروف) •

(خوه‌شاڤ) ـ يا خوه‌شـــاب • آڤـا خوه‌شه ـ خۆش آوه ـ آوى خۆشه • ژمه‌ويژا چێدكن •

(خوه‌شناڤ) ـ (خوشـــناو) • ناڤێ ائێله‌كـــه كورده ل‌راژۆرێ (هه‌ولێر ـ اربيل ) دكه‌ڤى •
ع (عشيرة كوردية شمالي اربيل)

(خه‌نده‌ق) ـ ڤادێ دكۆلن ل‌هاوير باژار وگوند وآسێ‌گها تا وه‌كو دژمن ب‌سوارى نكاربن تێ‌ره ده‌رباس بن • عربا ژكوردى وفارسي ستاندنه • ســـه‌لمان الفارسي ل‌هاوير شارێ (مدينه) چێ‌كريه • ع (معروف) •

(خه‌ناق) ـ گه‌رده‌نه • بارام ب‌خه‌ناڤا فه‌رهاد گرت •دبي ژخه‌نقاندن هاتبي • ژبه‌ركۆ گه‌رده‌ن جهێ خه‌نقاندنه بويـــه خه‌ناق • ع (العنق) •

(خوه‌ســـــه‌ك) ـ ئێ كۆ گه‌له‌ك

دخوازي ،وه‌كه پارسه‌كه • ع (السائل) •

(خه‌سه‌ك) ـ ئێ كۆ سه‌والا دخه‌سێني • به‌رێ مه‌زنا كۆله ژی دخه‌ساندن • لێ دبي ژ عربي هاتبي ع (خصي) •

(خوه‌ره‌ك) ـ خوه‌رۆك • ئێ گه‌له‌ك خوارنێ دخون • سه‌والا خوه‌ره‌ك باشه • لێ مرۆڤێ خوه‌ره‌ك نه‌گه‌له‌ك باشه • ع ( اكول )

(خه‌ريك) ـ ب‌سۆراني بداخوازا (مشغول) هاتيه •

(خوه‌شك) ـ جوان ورند ونازدار ودل‌بره • بارام خوه‌شكه ـ جوانه • نازدار خوه‌شكه ـ جوانه ـ رنده ـ دلبره ••••• ( الجميل ـ الجميلة ) •

(خوه‌شكۆك) ـ زێده خوه‌شكه • (ئۆك) ژبۆ بچوكی ـ شيراني هاتيه • وه‌كه : پچكۆك ـ كه‌چكۆك ـ شێرين كۆك•• ع ( فيها الجمال مع التحبب )•

(خه‌فالۆك) ـ پرێ جارا دپرچا سه‌رێيا ده تێ گۆتن • ده‌ما مو له‌هه‌ف دگه‌رن ـ له‌هه‌ف دجڤن وه‌كه چه‌نگالا دبن ژوان‌ره دبێژن :ـ خه‌فالۆك‌ـ دبي (خه‌فال) ژێ‌هه‌بي •به‌لام من نه‌بهيستی يه •• ع ( حلقات الشعر ) •

(خه‌له‌ك) ژ گوستيلێ زراڤ تره • دخن تليێ خوه • دزه‌نجيرا ده ب‌هه‌ڤه‌گرێداي نه ••ع(الحلقة)

(خه‌ليلۆك) ـ ناڤێ گه‌ياكي يه • وه‌كه گێزه‌رێ به • ل‌چۆلێ شين دبي ، زارۆك دچن ودخون •هن دبێژن:ـ(لۆڤك) ••ع(نوع‌من الحشائش كالجزر)

(خه‌رده‌ل) ـناڤێ گه‌ياكی يه•ل‌چۆلێ شين دبي • دبه‌سته‌ئێ كوردی ده هاتيه •

توب كوليلكا خه‌رده‌لێ •
لێ‌نوفا !
ل‌قه‌رمان وچه‌نه‌لێ •••
لێ‌نوفا !

(خه‌فال) ـ دبي مه‌زنێ خه‌فالۆك بي

•لێ دکورمانجیدە من نەبهیستی یە•لێ ژبەرکۆ خەڤالۆك هەیە دبي (خەڤال) ژي هەبي •

(خەشول) ـ شیرکێ خەشولێ دژوارە • مێشێ هنگوڤ ژێ حەس دکن • کورمانج دخن ناڤ دمسێ • رەنگێ پەلێ وێ زەرە • لچۆلێ گەلەك چێ دبي • ع (نبات تحبها النحلة)•

(خەیام) ـ ناڤدارەکی ایرانيیە ناڤدا وشاعر وفەیلەسوفە •ناڤێ وی (عمرە) •

(خەم) ـ لشونا (غەم) تێ گۆتن • (غەمگیر) ئێ کۆ خەما دگری ـ هلدگری • (خەمخوار) ئێ خەما دخوی کرۆکن • ع (الحزن) •

(خەشم) ـ ستەم وزۆروزولم • فارسيیەلێدشعرو خوشخوانێ کوردی دە گەلەك هاتیە • ع (الظلم والتعسف) •

(خوەستن) ـ یا خواستن •ژێدەرە • (خوەستەك) کرۆکە •داخواز (مطله بە) • ع (الطلب) •

(خوەشکرن) ـ ژێدەرێ تێپەرە • (خوەشي)ژێدەرێ تێنەپەرە:ـ آگر خوەشەمن آگر خوەش کریە •ئەڤ خوارن خوەش چێ بویە ـ من ئەڤ خوارن خوەش چێ کریە • چقا ژێدەرێ کۆ دکرنا تێنەپەرێ وی دە (بو) ـ (بون) بێ • ب (کر) ـ (کرن) دبي تێپەر •

(خوندن) ـ ئەوە کۆ مرۆڤەك بکاری بنڤیسی وبخۆیني• جارنا بداخوازا ( عزیمە ) تێ دبێژن :ـ ایشەڤ بارام لجەم مەڤەخوەندی یە ـ معزومە • خوەندا ـ خوەندەوار ـ خواەندەڤان بداخوازا (مثقف) هاتە • ع (الدراسة والثقافة والتعلیم ) •

(خەون) ـ دیتنا دخەوێ دە یە • ئەڤگەر ودیتنا کۆ مرۆڤ د(خەو) دە دکی ودبێني ناڤێ وێ خەونە • ع ( الاحلام والمنام •

(خەوتن) ـ بسۆراني لشونا (خەو) تێ • بـــەلام ئەڤ زێـدەر دکورمانجی دە پەیدا نابي ، جا نزانم زفارسـي هاتیە ، یـــان کورمانجا وندا کریە • نفستن ـنۆستن ورازان ـ راکەتن • لشونا (خەوتن) تێنە گۆتن • :ـبارام خەوتیا یە ،یان خەوتیە •نایێ گۆتن • ع (النوم) •

(خەوخاندن) ـ ئـــەوە کۆ مرۆڤ دگەل یەکی قسە بکی تا وەکو خەوا وی بێ • یاني گێژکرنە •من بارام خەوخاندیە ـمن ئەو گێژ کریە • ع ( •••• )

(خوەهە) ـ خوشکە دبێژ خواهــەر هاتبی • خوەها براستی ئـەوە کۆ ژدێ وبـاڤ یان ژیەکـي ژهەردوا بي • دەستە خـوەهـ ئەوەکۆ ژن ومێرەک دەسـتێ خوە بدن هەڤ وبێژن :ـ ب زایرۆێێڤە مارا مە لهــــەڤ نەدرستە ، ئەم بونـــە خوەهە وبرا ، یان دیا یەکێ ژوان ئێ دی دپێسیرا خـوە رە دەرباس بکی • وێ چاخێ دبن خوەهـ وبرا • ع (الاخت) •

(خەو) ـ خەوتن ـ رازان ـ راکەتن ـ نفســـتن ـ نۆســـتن • بداخوازەکێنە • تەنێ خەوتن دکورمانجی دە نایێ چـــاوا دەرباس بویە • ع (النوم) •

## ( خۆ ـ )

(خۆ) ـبداخوازا (طبیعة) هاتیە• کورد گەلەک دڤردە کور پێژني نە• خۆ ـ خوا ـ خوێ ـ خۆرت ـ خورت هەمو تێزیکی هەڤـن ع (الطبیعة) •

(خۆ) ـ یان (خوە) دعربي دە لجهێ (نفس ـ ذاة ـ الشـــخصیة ) هاتیـــە • بارام بخوە هات • بنفسە بارام بخوەیە ـبشخصە بذاتە • نەبەرنافە چاوا هاتیـــە گۆتن • ع (الشخصیة ـ الذاة ـ النفسیة ) •

(خۆزکا) ـ خوەزیکا ـ خوەزکا خوەزیا بـــداخوازا (خوەزی) هاتە ••دەرباس بویە ••خوەستنا

داخواز وآرمانجێ کۆدژواره پێک بێن یاپێکنائێن • بەلام هێڤی ـ هێوا ـ خوەستنا وان داخوازێن کۆ نەدژواره پێکهاتنا وان • ع ( التمنى) مثل (ليت) •

(خۆخا) ـ ژ (خۆخ) دەرکتیە • ناڤێ ژنایە •

(خۆجا) ـیان خۆجەل‌شونا سەیدا ـ ماموستا تێ گۆتن • (خواجە) ل‌شونا (ئەفەندی سەید ) تێ گۆتن • ع (الاستاذ) •

(خۆرتاني) ـ جواني یە • بارام خۆرتە ـ جوانە ـ جێهلە ـ گەنجە ـ لاوە •

(خۆمالي) ـ ژخۆمال دەرکەتیە • ئەڤ تشت خۆمالە ـ خۆمالي یە • یاني ل مالا مە هەیە یان مالێ مەیە • ع ( في الاشیاء وبمعنى الوطنية ) •

(خۆب) ـ فارسي‌یە لێ دشعرو خوشخوانێ کوردی دە گەلەک هاتیە •بداخوازا جوان وخوەشک ورند ودەلالە :ـ

گەر خۆب وپەری‌زادە

نەزەرکم تەبەسم ئەز •

(خۆرت) ـ لاوە ـ گەنجە • بارام هێ خۆرتە • یانی هێژ لاوە ـ هێژ گەنجە • خۆرتاني لاوینی یە • ع (الشباب) •

(خۆخ) ـ ناڤێ بەرەکي دارایە • ترش وشیرینە ، ژهنجاسێ مەزن‌تر ودآلیکی وێ دە قەلشەک هەیە ل‌ناف کوردا ناف‌دارە • خۆخا بویە ناڤێ هەسپەکی • بویە ناڤێ ژنا • ع (معروف) •

(خۆشاف) ـ خۆشاب ـ خۆشاوە • خۆش آڤە ـ خۆش ـ آوە • آڤا خۆشە • ژ مەویژا چێدکن •ع (خوشاب)أو عصير الزبيب)

(خۆل) ـ بسۆراني آخا هورە • لێ بکورمانجي (خۆلی ـخوەلی) • ژآگر چێدبی •خوەلی‌یا آگرە •ع (الرماد) أو التراب •

(خۆپان) ـ وێران وکاولە ـ کاڤلە •

دبێژن :ـ وەی مال خۆپان :ـ
مال کاڤل ـ کاول خۆپانــۆ !
گوندۆ ! ـ ویرانۆ ـ کاولۆ ـ
کاڤلۆ • ع (الخراب والمهجور
والخاوی) •

## ( خێ ـ )

(خێرکا) ـ ئێلەک ژ کۆچــــەرێ
میرایە • ع (عشیرة کوردیـة
من عشائر المیران ) •
(خێلي) ـ بەربو یە ـ ئەو ســــوار
وپەیا وژن ومێرێ کۆ دگەل
بوکێ دچن •ئەم گەلەک جارا
دبێژن :ـ بەربــو ـ بەربوک
لێ جارنا (خێلي وبەربـــو )
لپاش هەڤ تێن • ع (الجموع
التی ترافــق العروس الی بیت
العریس سواء من بیت الی بیت
أو من قریة الی قریة ) •
(خوێت)ـ ئێلەکەمەزنە کــوردە ل
راژۆێ بـەدلیس دکــەڤي •
( کــەلاخۆیتێ ) ناڤــداره
حاجیموســـیبەگێ خوێتي
بناڤ ودەنگە ستران لســـەر
هاتــە چێکـــرن • حاجي ل

تربەســـپي مر وبـرایێ وی
**نۆحبـــەگ ل بارزان هــات**
کوشتن • ع (عشیرة کوردیة)•
(خێرخواز) ـ ئەو مرۆڤێ کۆ هـەر
دەم دناڤ خـەلکێ دە خێرێ
دخوازی ـ ناخوازی شــــەر
چێبي • خێرخوا ـ خێرخواز
بداخوازەکی نە •ع (المصلح)•
(خێز) ـ ناڤێ کشاندنا خەتەکێ یە:ـ
خێزەک نڤیساندن ـخەتەکە•
خێزاکابا ـ لێزەکە :ـ
ـجزیر خێزا کابایـــە
رێزا ناڤێ ئەز وتۆ
ـدەق بدەســتێ نەیار•
زۆزۆ دچن ئەز وتۆ •••
(خێزک) ـ بچوکێ خێزە •(خێزێ)
ناڤێ ڤێ لیستکێ یە •ع(الخط)
(خێر) ـ دهەمبەر شەردە هاتیــە •
بداخوازا قەنجي‌یــە • خێرۆ
بویە ناڤێ مرۆڤا ـ مێراەخێریا
ناڤێ ژنایە • (الخیر) والاعمال
الحسنة •
(خوێر) ـ بــــەجنەخوێر • ناڤــێ
کەڤنـــەبازارەکی کوردە •

ل ناڤ هەڤێرکــــا و ل زۆرێ بازارێ نصێبين دکەڤي • ايلا بەجنەوی ـ بەشتەوی ـ باجنی دڤێ ناڤێ دەبو •

(خێرکەر) ـ ئێ کــــۆ خێرا دکی • کرۆکە • خێرێ کــەر ـ ئێ خێر پێ هاتيە کرن •پێکراوە• ع (عامل الخير ـ فاعل الخير )

(خێزک) ـ پچوکێ خێزە •دەرباس بويە •

(خێزان) ـ زار وزيچ وکوفلــەتێ مرۆڤايە • ع (العائلة ) •

## ( خو ـ آ )

(خودا) ـ خوەدا ـ خوەدێ ـ خوايە بێتر فارس (خـــودا) دبێژن • بداخوازا ( خوە ــدا ) يە ع (اله ـ خالق نفسه )•

(خويا) ـ دياره ـآشکەرا ـئەشکەرا يە • چيايێ سەفين زمەڤـــە خويايە ـ دياره ـ ئەشکەرايە ـ پەندی‌يە • ع (الظاهر) المبين•

## (خو ـ ي)

(خوي) ـ دبێژن :ـمرۆڤ خوی دکی ل بارام بنەری ـ شەرم دکی ، هەردەم لێ بنەری ـ نێ تەماشا بکي • ع (التمنی) •

(خورتي) زۆردەستي ـ بـەقوەت • بارام خورتــــە ـ بقوەتــە زۆردەستە • بـخورتي ئــەم حەقێ خوە دخوازن •بـەقوەت ايمە مافێ خۆمان ئەيەوێن • ع (القوة) •

(خوکی) ـ بێشەکە ، يان پەيمانەکە• دناڤ بــــەرا کـورد وعربێ جزيرێ و عربێ‌شەمـــەر دە هاتيە لدارخستن •ســـالێ هەرعشيرەک گەرەکــە هن دخل وزاد بدی شێخێ شەمەرا •دهەمبەر ڤێ دە چــەدزی ژ وێ عشيرێ ببي ئەو شـــێخ گەرەکە بدی ، يان بێني • لێ پشتی ابراهيم پاشا خورتبـــو ئەڤ پەيمان شکانـــــد وژوێ رۆژێ کوردا نەدا شەمەرا • ع (الخوة) •

(خوسي) ـ بەربەياني لســەر روێ قادێ وەکــــە بەرفا هـــور

خۆنافه‌ك هاتیه خوار ئه‌م زۆێ
خونافێ ره دبێژن :ـ خوس ـ
خویســـــي •یاني وه‌كه خوێ
لسه‌ر قادێ هاتیه به‌لاڤ كرن•
(آفي)وه‌كه خویسي یه • به‌لام
(آفي) وه‌كه خوێ سپي خویـا
ناكي • ع (نوع من الندا) •

# ( خو ـ ئه )

(خورده) ـ هوره ژخورد ـ هورد ـ
هور • هاتیه • په‌رێ خـــوه
خورده بكه•هور بكه•(خورده
آلاڤ) ـ آلاڤــێ هـــــورن
كچكه‌نه • خورده دكورتان ده
•ئه‌و هور وموریێ كـۆ دخن
ناڤ كورتان • (خـــــورد)
ـبداخوازا خوارن ـ خواردن
هاتیه • دبێژن :ـ شه‌كر نــه
خوردێ شڤانا یه ـ نه خوارنا
شڤانا یه • خه‌لكێ به‌غدا ژی
دبێژن :ـ خورده ـ بداخوازا
هور • ع (الفراطة) •
(خورمه) ـ ناڤداره • گه‌لـــه‌ك
نفشێ خورما هه‌نه كۆ ئـــه‌م
نزانن•خورمێ ایرانێ گه‌له‌ك
هور وخوه‌شـــن •بازرگانـــی
بخورما دكن • سه‌رمیانه‌كێ
مه‌زنه :ـ خستاوی ، زهدي ••

(خوله) ـ دزاراڤێ خه‌لكـێ بآرارێ
(ســــــلیماني) ده •بداخواز
(محمود) تێ گۆتن • بـــه‌لا•
تشته‌كی غه‌ریبه •هیچ دۆستانی
دناڤ به‌را (محمود) و (خوله)
ده په‌یدا نابي • ژبه‌رڤي قاسي
نزانم داخواز چي یه •
(خوێ) ـ ناڤداره • ع (الملح) •
(خوپ) ـ ده‌نگێ تشته‌كی كۆ بخي
خوار ده • وه‌كه خلچه‌كی ـ
سنگه‌كی •دبێژي :ـ گۆ خوپ
وچو خوار •ع (كلمةصوتیة)•
(خوپ‌خوپ) ـ وه‌كـــه (خوم‌خوم)
ده‌نگێ آڤێ یه • ع ( صـــوت
المیاه ـ خریر ) •
(خورت) ـ بقوة خورتـــي ـ قـــوة
ده‌رباس بویـــه ژێـــده‌ره • ع
(القوی) •
(خورس) ـ ناڤێ نه‌واله‌كێ یه چه‌ند
گوندێ خوه‌ش وشیناهي وآڤـا

تێ ده نه • دکەڤي رۆژآڤايێ
(ماردين) • خورســــا ناڤێ
ناڤداره • زەرىيێ (مالا گالۆ )
كۆ دسترانا ده ناڤــــدارن ژ
خەلكێ خورســـا ناڤێ نه •
كورمانج دبێژن :ـ بپرســـێ
مرۆڤ دگهێ خورســـێ • ع
(وادى الخبورس تقـــع غربي
ماردين ) •

(خورج) ـ بچوكێ وێ خورجكه •
ژتيـــرێ بچـــوك تـــره •
(خورجەزين)سوار لپاش زين
گرێ ددن خوارن وهـــــور
وموريێ خوه دخنێ •

(خورد) ـ بداخوازا (خـــوارن) ـ
خواردن • هاتيه • شەكر نـــه
خوردێ شڤانا يه • نەخوارنـا
شڤانا يه • دكورمانجي ده هەر
تەنێ ئەڤ خويا دكي • دبـي
بداخوازا بابەت هاتبي • شەكر
نه خوردێ شڤانا يه ـ نەبابەتێ
شڤانا يه • ئەڤتشت نەخوردێ
بارامه ـ نەبابەتێ بارامه • ع
(اللياقة) •

(خوز) ـ خوار وتەواندى يه •قەوس
وچڤاندى يه • ع (قوس) •

(خوش) ـ يا خوشخوش • دەنگێ
**آڤێ يه • (خوشين) دەنگێ آڤ**
وبا يه • بەلام ( خشخش )
دەنگێ خشينه ـ چوينا لسەر
زكه • ع (صوت الماء) •

(خمار) ـ خومـارى • چارك • ع
(غطاء المرأة) •

**(خوناف)ـ بارانەكه هوره نەرمـه •**
**لسەر خونافێ بەسته هاتـــــه**
چێكرن :ـ

خوناف بارى نعمته
روكێ ئەردێ كر خەته•
بەسته •

خونافێ پاشێ بويه ناڤێ ژنا •
بەستاك لسەر خونافێ هاتيـه
چێكرن :ـ

خوناف خـــوناف خـــوناف
خوناف
لێ گەورێ خونافێ !
م ژته پيڤه كەسك ناڤێ
لێ گەورێ خونافێ ! ••••

(خورجك) ـ بچوكێ خورجـێ يه • دەرباس بويه •

(خوشك) ـ خواك ـ خواهەر بداخوازەكێ • { خواهەر فارسي يه • بەلام خوشكك ـ خوەه ـ خواك كوردی نه •
(خوەشك) ـ جوان ودەلال ورنده • هن دبێژن :ـ خوێشك ـ خويشك •
ع (الاخت) •

(خومخوم) ـ دەنگێ آڤ گرانه • دبێژن :ـ خومخوما آڤێ يه • پاشێ خومخوم بويه ناڤێ ژنا وبەستاك لسەر هاتيه چێگرن :ـ
بەسته
خوم خومێ (تورا بانێ)
كەڤوكال سەرێ بانێ •••

(تورابانێ) ـ دڤرده زازاكی ـ دوملی يه • گازي دكم بو تو ـ (يانێ) ـ بانگ بو تو ـ ته ـ تو يه • (را) بداخوازا (بو) هاتيه • يانی بوتو بانگ

ئەكەم • بادكم ته ـ گتو ته دكم • ع (خرير المياه) •

(خومين) ـ وەكه خومخوم هاتيه •

(خورتكرن)ـ ژێدەرێ تێپەرە • بارام خورت بو ـ من بـ خورت كر •

(خورتبون) ـ ژێدەرێ تێنەپەرە • ع (التقوية) •

(خوشين) ـ دەنگێ آڤێ يه • وەك خوش خوشه • بەلام خوشين ژخومين بچوكترە يانی آڤ كو خومخوم ـ خومين ژێ تێ ژآڤا كو خوش خوش ـ خوشين ژێ تێ مەزنترە • يـ دەنگێ خومين ژدەنگێ خوشين گرانترە •

ع (صوت المياه) •

(خوين) ـ خوێن ـ خون • بداخوازەكێ هاتنه • بەلا دكوكا خوه ده (خون) • • خوين وخوين • بدەفخوازی هاتنه • ع (الدم) •

## ( خ ـ آ )

(خیا) ـ ئێله‌که کوردە مەزنـه • ل هێلا راژۆرێ خەرزا دکەڤی •
ع (عشيرة) •

(خنه)ْ ـ حنه يه • لێ بينا فارسی ژێ تێ • ژبەرکو پرێ کـوردا دبێژن :ـ حنه •

(خنێ) بويه ناڤێ ژنا و (خنۆ) بويـه ناڤێ مێرا •لێ خنۆ ناڤێ ژنـا يه •بەلام ئەڤ (خنۆ) درسته کۆ ژ (خوناف) دەرکەتبي •
ع • (حنه) •

(خرێ) ـ ناڤێ لێزەکێ يه ـ يا ناڤێ گالتاکێ يه • هەڤدی تام ددن•

(خرۆ) ناڤێ گوندەکی يـــه دکــــەڤی رۆژآڤایێ چـۆلا (هەساریێ)• ناڤ ئێلا(هەبزبني ـ هازبنی) ده يه •

(خرنوب) ـ يا خـەرنوب • ناڤــێ گەیاکێ ، یا دارەکه هوره کۆ هن بەرک لێ دکەڤن زارۆک بشیناهی ڤاشـلێ وێ دفرکێنن ودخـــوت • نـــاڤـێ وان (حەس‌مەسوك) ن • بــەلام وەهارەنگه ناڤێ دارەکه مەزنه بێ‌بەرە •هەردوژی بستری‌نه •ع (نـــوع من الحشـــائش والاشجار ) •

(خرپ) ـ خستنا تشتەکی دڤادێ دە• دەنگێ خستنا تشتەکی دڤـادێ ده يان دتشتەکی ده ناڤێ وێ خرپه • جارنا ژبۆ بررين تێ گۆتن :ـ بــارام گـۆ خرپ وژێ‌کر • ع (صوت القطع) •

(خرت) ـ يا (خرت‌خرت) دەنگــێ کۆلانا مشکه • يان تەڤایي يە• ديوارکۆلان و دارکۆلانه • ع (صوتية) •

(خِشت) ـسنگەکی هاسنی سەرتوژە• بدەستێ دەرویشا دکەڤي •بێ ڤەن و خاپا ل نەزانا دکـــن ودبێژن :ـ ئەم ل خوە دخن •
ع (کالحربة بيد الدراويش) •

(خشت‌خشت) ـ دەنگێ چوينا تەبا ، مرۆڤا يــه کۆ دناڤ پوش و چلۆ و دار و دەڤيا رە دچن • خشت‌خشتا مارە ، خشت‌خشتا

مشكه ، خشت‌خشتا بارامه ••
ع (كلمة صوتية عند المشي او
المرور بين الهشيم) •
(خلت) ـ نافێ ته‌باكى بچوكه مشكه،
يا وه‌كه مشكه • دناڤ قادێ ده
كونێ دورو درێژ چێ‌دكى •
ئه‌م دبێژنێ (خلتێ‌كۆر) •ولۆ
ده‌نگ دايه كۆرێ چاڤــــه •
كورمانج دبێژن :ــ خلت آخێ
دكۆلى ول سه‌رێ خوه دكي •
ع (الجربوع) •
(خنوس) ـ بازاره‌كـي كـــورده ل
راژۆرێ كوردستانا بن‌ده‌ستێ
تركيا دكه‌ڤي • (ده‌شتاخنوسێ)
بده‌وله‌مه‌ندى وخوشي ده‌نگ
دايـــه • چيايێ (بين‌گــۆل)
دبه‌رده‌يه •دسترانا عه‌يشانێ ده
تێ گۆتن :ــ عه‌يشان حه‌يران
خنـوس خوشـــه بين‌گـــۆل
دبه‌رده • ع (مدينة كوردية‌في
شمال بدليس) •
(خنێس) ـ نافێ چه‌مه‌كى يه •ته‌ڤلى
چـــه‌مێ جه‌قجـــه‌ق دبـي •
بازارێ (نصێبين) دكـه‌ڤي ناڤ

هه‌ردو چه‌ما • ع (اسم نهـــر
تمر غربي نصيبين) •
(خج) ـ گۆلكه • ده‌ما گازى دكـن
گۆلكێ دبێژن : خج‌خـج•••
ياني وه‌ره يا ده‌ركه‌ڤه •
(خلچ) ـ يا (علـچ) ژ سنگ بچوك
تره ـزراڤ‌تره • زارۆك پێ
دليزن •
(خز) ـ ياخزخز ـ خزين • ده‌نگێ
برينا جام و برره‌كێ يه • • ع
(صوت القطع) •
(خر)ـ نافێ گه‌ياكى بن شێرين‌وه‌كه
گێزه‌رێ يه • ل‌چۆلێ شين تێ
و تێ خوارن • ره‌نگێ بنێ‌وێ
زه‌ره •ع (نوع من الحشائش
كالجزر) •
(خر) ـ كوم‌بونه • سۆرا دبێژن:ـ
خربونه ـ كوم‌بونه ـ چڤيانه•
(خرگه‌له) ژڤر ده‌ركه‌تيه • • ع
(الجمع او الاجتماع) •
(خر) ـ ده‌حف‌دانـــــه ـ تام‌دانه •
دبێژن :ــ خركێ بده بارام •
يانى تام‌بده • خرێ كۆ نافێ
ليزه‌كێ‌يه ژڤر ده‌ركه‌تيه • • ع

(الازدحام والدعم) •

(خر) ـ گۆتنەکە دەنگی‌یە • گۆ خر و دخەورە چو • گۆ خـــر و هاتە خوار •••

(خرخر) ـ دەنگێ گۆ دخـــەودە زمرۆڤ دەردکەڤی • خرریـن ژی تێ گۆتن •خرخرا بارمە• بارام دخەودە گەلەک خرخر دکی • ل‌بەر مرنێ (خرخر) گەلەک خویا دکی کورمانـج دبێژن :ـ مرن‌مرنە لێ‌خرخر ج ( •• ) منـــە • دبێژن :ـ خررینا بەر مرنێ •ع(الشخير)

(خشر) ـ هەمو تشتێ گرێدای بۆ نافە ژزێروزیف نافێ وی خشرە• کورمانج دبێژن :ـ خشروخال :ـرەوشێ دبن خشــــروخالێ خوەدە نکـــاری رابي • ع (المجوهرات او الحلي) •

(خرجر) ـ دبي ژکوردی وعربـي هاتبي هەف :ـ خر کوردی‌یە• بەلام (جر) دبـي ژ عربـــي هاتبي • پێکفــە بویە نافـــێ

سەرگێـژی ـ بـەربـەري ـ دوبەندی •••

ع (العراك والجدال) •

(خش) ـ چوینا دناف پوش وبەلاخ ودار وبـــەردە • وەکــە ( خشت‌خشت ) هاتیە • دبي (خش‌خش) ژ( خشت‌خشت ) مەزن‌تربي (خشین) ژی تـــێ گۆتن • خشین ژێدەرە •

(خرپش) ـ تەڤگەرا درەشێدە یە • چە خرپشـا بارامە ؟ بـــارام خرپشي سەرلاشێ فەرهـاد • بـــارام روێ رەوشـــــێ خرپشاندی‌یە • بتەینوکـتێ خوە خەربوشک ژێ دانـە ـ خوین‌کریە •

ع (العمل في الظلام وبـدون هوادة وشق الوجه بالاظافر) •

(خرنەق) ـ بچوکێ کەرۆشکێ یە• ع (صغار الارانب) •

(خردەق) ـ یان خوردەق •نفشەک ژگولە وبەرکێ تفنگێ کەفتارە ـ کورمانجی‌یە • دایـــرۆدە

ژبەرکێ چفتا رە تێ گۆتن • ع (خردەق) •

(خرتك) ـ نافـەكي كونـدرە • تێخوارن • هوردكن ودناف مێكـا دە دبێـژن دبژێنن ـ دقەلێنن • ع (نوع من القرع)•

(خرتك) ـ گركا بنێ آفێ يـە • خەريتكا بنێ بەرۆشـێ يە • دآفێ دە وەكە پرك ـ دردی هاتيە •

ع (ما يتجمع من الاوساخ في الكوز والدن) •••

(خرەك) ـ لەق و سستە • باش نەهاتيە گرێدان ـ شداندن • يان جهێ وي فرەهـ بويـە ـ هەڤدی خوارنە • خرخر دكي • ع (عندما نسمع صوتا من البراغي نعـرف اما بسبب التركيب او التآكـل) فخرەك يطلق على هذه المعاني •

(خرخرك) ـ يا خرخـرۆك ـ خرخرۆنەك • وەكە زەنگێ بچوك بزارۆك وباربـرو بەرخك وهن تەبايێ دی ژی ڤەدكن ، دەنگـێ خرخر ـ خررين ژ وا تێ •

ع (اجراس صغيرة تعلق عادة على اكتاف الصغار من الانسان والحيوانات) •

( خرەك ) ـ يـا خرينـەك ـ خرۆنەك • نافێ وێ قادێ ـ وێ زەڤي يێـە كۆ تێدە كەڤر وزوغور هەبن •

ع ( الارض المحجـرة ) الحجرية •

(خلخال) ـ يا خرخال • ژزيـف وزێر چێ دكن ژن دخـن لنگێ خوە • بەرێ دخستن لنگێ هەسپێ مەزنا • (خلخال ـ خرخال) ژ دەنگێ (خـر) و(خل) دەركەتنە • عرب ژی دبێژن :ـ خلخال •

ع (معروف) •

(خرام) ـ قادا خرۆنەكە ـ بكەڤر

وبەر وكوچ وزوغوزە • بەلام

(خرام) ژخرۆنەك ـ خرەك بێتر بكەڤرە •

ع (الارض الحجرى الجبلى)•

(خرمخرم) ـ دەنگێ خوارنا پەز وسەوئاله :ـ خرم خرما گايێ مەيە ايمێ خوە دخوي ـ خرمخرما پەزە كاينا خوە دكى •

ع (صوت اكل الدواب) •

(خزم) ـ بسۆرانى بداخوازا مرۆڤ ـ خوەدى هاتيە :ـ بارام خزمي‌نا زدارە • مرۆڤێ وێيە ـ خوەدى‌يێ وێيە • خزمايەتي ـ مرۆڤانى يە •

ع (الاهل) •

(خزێم) ـ ژ زێروزيڤ چێدكن ومورك وكەڤرێ گران‌بها تێدە بجێ دكن وژن دخن پۆزێ خوە :ـ خزێما حەيرانا من گەورە چێ مەكە

بەرە نەگرى هنارێ دوا چۆني

ماچا •••

(خرين) ـ ژێدەرێ خرخرە • دەرباس بويە :ـ تەركا دەلالێ مالێ‌ناكم •

خەتا آخرێ دەورێ ، خرينا بەر مرنێ •

## ( خي ـ )

(خيپ) ـ وەكە (كەلەم)ە • بەلام كەلەم سەرێ وى هاتيە توژكرن لێ خيپ سەرێ وى بخوە توژەيانى ستري‌يەكى مەزنە • خيەك كەتە لنگێ ـ پێ‌يێ بارام • كەلەمەك كەتە پێ‌يێ بارام • دبي ژ دەنگێ خوپ ـ خرپ هاتبي •

ع (كبير الاشواك) •

(خيت) ـ خيتك بجوكێ وێيە • واديارە بداخوازا پێك‌هاتن ـ خوەش‌كرن هاتيە • ذەمنا مرۆڤەك كارەكى دكى ونابي سەرى ، يا پێك ناێني دبێژن:ـ كرە خيت ولسەر هەڤ دانى•

جارنا دبێژن :ـ دنيا خيت بيت بويه •
ع (الاصلاح او الاتمام) ؟

(خيزخيز) ـ خيـز ـ خيـزخيز • دەنگـەكە زفركـێ تێ ، زبررينێ تێ ژگەلەك تشتـا تێ • لێ گەلەك جارا دبێژن :ـ خيزخيز لفركا وى كەتيە•
ع (كلمة صوتية) •

(خوين خوار) ـ زۆركەر ـ مێركوژ وتالانگەرە •
ع (شارب الدماء) •

(خوين سار) ـ مرۆڤێ خوين سـار گران وبێجوانى وخوەشكايى وديدارە • بارام خوين سارە • روێ وى نەخوەشە ـ نەدەف بكەن وروگەشە •
ع (البشع) •

(خوين دار) ـ يان خوينى • ئـەو مرۆڤێ كۆ خوينەك دستوێ وى دە بي • ع (قاتل) •

(خوين ريژ) ـ وەكە خوين خـوار تێ گوتن • ع (سفاك) •

(خوين مژ) ـ ئێ مالێ هەر كە سي دخوى • ع (مصاص الدماء) •

(خيش) ـ دليزتكا زارۆكا دە تـێ گۆتن بارام قانێ خوه خيشـن كرن ـ يانى خوه ژدەينـا پاقژ كرە• ع (تصفية الحساب)•

(خوينگ) ـ خوشك ـ خـواك ـ خوەهـ • بداخوازەكێ هاتنە دەرباس بويه • ع (الاخت) •

هن دبێـژن :ـ خوەهنگ :ـ كاميران بەگ دهـاوارێ دە دبێژى :ـ ززۆزانا هـــات قولنگ • خەبـەر آنــي ز خوەهنگ•دبێن رابە داوەتە••

(خوين) ـ خۆيـــن ـ خـون • بداخوازەكێ نــە • دەرباس بويه • ع (الدم) •

(خافەدان) ـ خۆارنـەكـە : دان وگۆشتە •

## ( دا ـ آ )

( دا ) ـ داک ـ دایکێ ـ داد ـ دێ ـ دایێ ـ دادێ • بداخوازاکێ نه • جارنا (دیا) تێ گۆتن :ـ دیا بارام مریه ـ دیا فەرهـاد چویه بازێر • دبانگـــێ ده دبێـژی :ـ دا ـ وادا! داد ! وادا ! دایێ ! وادایـێ ! •• دادێ دایکـــێ ـ وادای ـ وادایکێ ! ع (الام) •

(دادا) ـ بداخـــوازا (دا) ـ. دایک هاتیه • دادێ ژی تێ گۆتن • ع (الام) •

(دارا) ـ بازارەکی ـ یا کەڤنـــه بازارەکی کوردە • دکەڤـــي ناڤ بەرا (ماردین) و (نصیبین) راژۆرێ شـارێ (آمـــوده ـ عامودێ) یه • چیرۆکا رەشوێ داری ژڤي بازاری ـ ژڤـــي گونـدی دەرکەتیـه (دارێ ـ دارا) بداخوازەکێ نه •

ژ آڤانی یێ ملکێ دارا یه •

ع (مدینة کوردیة) تقع بین ماردین ونصیبین •

(داسنا) ـ ناڤـــێ ایلە کە کـــوردە ایزیدی یه • دەرەبەگی یـەک لدارخستیه • پای تەختـا وان بازارێ (دهـوک) لراژۆرێ بازارێ (موصل) دکەڤي •

ع (عشیرة کوردیة یزیدیـــة اسست امارة في دهوك) •

(داسکا) ـ ایلە کە کوردە ایزیدی یه • ل (سەنجار ـ شەنگـــال) و لناڤ هەڤیرکا پەیدا دبن •

ع (عشیرة کوردیة یزیدیة في سنجار وطور عابدین) •

• • •

(دانە) ـ لب ، حـــەب ـ دانه • بداخوازەکێ نـه • بـــەلام (حەب) ژعربي هاتیه • لــێ (لب) درسته کـــوردی بي • جانەگەر راسته ( پەیغامبەر ) گۆتیه :ـ (عنب اکل دو لـب دو لب) • بکوردی گۆتیه • ع (حبة) •

(دايه) ـ نافــێ وێ پیرەژنێ يه •
كۆ دگل كەچەكێ دمێنـــي
وآليكاريا وێ دكي ـأتابەگيیا
كەچێ مەزنا دكي :ـ مەدايـه
شاندە ئێفبرجا بەلــەك دا
ئەو كەچێ بيني •

ع (العجوزة او المرأة الموكلـة
بامور بنات الاشراف) •

(دامه) ـ يا دام • ليزەكه نافداره •
لكوردستانێ گەلەك پەيـــدا
دبي • كورديه ژبەركۆ آغـا
وكەيه وبەرك • تێدە پەيدا
دبن • ع (لعبةمشهورة) •

• • •

(دادۆ) ـ دبانگێدە نافێ دايكـــه •
دادێ ـ داد •بداخوازەكێنه•

(دادێ) ـ وەكـــه (دادۆ) هاتيه •
دايـــێ ـ دادێ ـ دا •
بداخوازەكێنه •

(دانو) ـ دەما سافار دكەلێنن•ژێرە
دبێژن :ـ دانو • وەهارەنگـه
خوارنەك هەيـــه نافێ وێ

(دانو) يــه • ژ دان و نۆك
وپێفاز چێدكن جارنا كۆشت
وغارك وهن تشتا دخـــــن
ناف • كورد دبێژن :ـ بەرفێ
مەدن تيا ، دانوا مەدن برچيا •

(دراوسي) ـ جيرانــه ـ جـیناره ـ
جینەره • ع (الجار) •

(داوي) ـ پاشــي يه • داو قراغێ ـ
ليفێ بــــەرگ :ـ كراس ـ
خەفتـــان ••• داوي ـ پاشي
يه • ع (آخر او النهاية) •

• • •

(داراب) ـ نافێ سێ پادشـــــاهێ
كوردێ كه فناره يه • ئەگـەر
كەياني برا كوردبــن • (دار)
بداخوازا (حكم) ـ صاحـــب
هاتيه • كورد دبێژن :ـ دار ژ
جنـــەتێ هاتيـــه • (دار)
بداخوازا چۆ يه • كـــورد
دبێژن :ـ كەسێ چـوێ وی
ستوره آرفانێ وی هوره •
ع (اسم لثلاثة ملوك مـــن
الكيانية) •

(داوەت) ـ گۆڤەنـــــد ودیـــلان وشاهی‌یە • دبـي ژ (دعوت) هاتبي • بەلام بویە • کوردی•

ع (الرقص والافراح) •

(داربەست) ـ چەند دارن بوەریسا بهەڤە گرێ ددن و مریـــا ـ کوشتیا ـ بریندارا پـــێ رادکن :ـ (داربەستا) باڤـــێ ئەمین بەرب مال‌تێ) •

(داس) ـ آلاڤەکـــە • ژ (هاسن ـ آسن) چێ دکن • پـــێ دارا دپەژلینن ـ پێ پالەیێ دکن • بەلام داسێ پالەیێ ژ داســێ برینێ ـ پەژلاندنێ‌مەزن تــر وتەنگ‌تر وتوژترن •

ع (المنجل) •

(دانس) ـ ئەوروپی‌یە • بەلام بویە تەڤایـــــی • دیلانەکـــە ژن ومێردەستێ هەڤ دگرن جارنا سینگا خوە ددن هەڤ ودیلانێ دکن • ع (معروف) •

(داخ) ـ داغە • داغکرن شەوتاندنـا لاشێ جانـدارە • بسۆزانـی (داخ) بداخـــوازا (حسرت) هاتیە •

ع (الکی ـ الکو) حــــرق الجسم بالنار والحدید •

(دار) ـ بەری هەرتشتی بداخــوازا درەختە•دکورمانجی دەکۆ تێ بررین تێر دبي :ـ دارا مە ـ دارێ مە • (دار) بـــداخوازا (حکمە) فەرمانداری یـــــە • ناڤێ (دارا) ژدار هاتیــــە • (دزدار) حاکم القلعـة • دار بداخوازا (صاحب) هاتیــە • (بەیرەقدار) خوەدانێ بەیرەقێ (دکاندار) ـ خوەدانێ دکانێ•

ع (الشجرة) •

(دار) ـ بداخوازا (حکم) • هاتیە • دزدار ـ حاکـم القلعة • دار ژبهشتێ هاتیە • حکمێ عـادل ژبهشتێ هاتیە • ناڤێ ملک‌دارا ژڤر دەرکەتیە •

ع ـ (الحکم ـ حاکم) •

(دار) ـ بداخوازا خوەدی هاتیە :ـ

بەیرەقدار ـ خوەدانێ بەیرەقێ • دکاندار ـ خوەدانێ دکانێ •
ع ـ (صاحب) •

(داد) ـ هاوار وقیرزین وفریاد وفیغانە :ـ کەس بدادا مە نەپرست
گلە و دادی چەکەت ؟
دڤەردە کورد. و فارس هەمپارن •

(دامان) ـ رهێ لاشێ جاندوان •
ع (الاوعیة الدمویة) •

(دامار) ـ ئێ دیا مرۆڤ مار دکی ـ زرباڤە • یان ئێ کو مرۆڤ دیا وی مار دکی ـ کورێ ژنا مرۆڤ • (داماری) تێ گۆتن •
ع ـ (ابن الزوجة) •

(داردار) ـ بچوکێ وێ (داردارۆک) هاتیە • ئەو دارە کو دچوقلیێ وێ دە مەویژا بدارڤە دکن • دمشتاخا دە چێدکن • ژهەر نفشێ مەویژا بەرێ وێ ڤە دکن • دخەملێنن • ژبۆزارۆکا چێدکن • لێ خویایە ژبۆ کو خەلک زانبن چەند نفشێ مەویژێ وی هنە •
ع (شجرة صغیرة مزینة بالزبیب) •

(داوەر) ـ بداخوازا (خوەدێ) ـ خالق • هاتیە • دشعری کوردیدە هاتیە • کورد وفارس هەمپارن :ـ جزیری دبێژی :ـ
ـ (حکمتی داوەرە ئو تو ژ حکمتی داوەر مەکە بەحث) •

(داخواز) ـ (معنی ومقصد ومطلب) •
داخوازا بارام پێکنایێ ـ داخوازا من ئەڤە •••
جزیری دبێژی :ـ
محبوبی ددل بت مەب داخوازی چە حاجەت ؟
عنقا بخوە بێتن فەرو پەروازی چە حاجەت ؟

نەی دورە حبیبا دە کو فریاد

وفيفان كن •
وێ گوهـ ل ضميرو دلـه
آوازى چه حاجەت ؟

(داباش) ـ (بەحث) وقسەكرنا ژتشتەكى يە :ـ ايرۆ ل ديوانخانێ داباشا كوشتنا فەرهاد دانى‌بون • يەك دپرسى و دبێژى :ـ هون ل ڤر چه دبێژن ؟ دبەرسڤا وى ده دبێژن :ـ داباشا رەشۆيە ـ ئەم بەحثا رەشۆ دكن ـ ژرەشۆ دپەيڤن ـ قسەدكن •
ع (البحث) •

(دانەپاش) ـ ئەوە كو مرۆڤ سۆزەك بمرۆڤەكێ رە بدى وپاشێ نەبێ سەرى خوه بدى پاش • ع (التهرب) •

(داڤ) ـ دام ـ داو • بچوكێ وێ داڤكه • چوك كەتيه داڤێ •
ع (الشبكة) •

(دانخاف) ـ ناڤێ خوارنەكێيە • هن دبێژن :ـ خافەدان • ژلەورا شيخ‌عبدالرحمن ئێ آختبه گۆتيه :ـ
دانەخاف وخافەدان وسەربزێر هنگێ بۆمه ئەز ژوان نابيمه تێر
لێ چه بێژم پەسنێ ترشا باميا تێ هەبي يەك پەرچه گۆشتێ شاميا ••••

ئەڤ خوارن وەكه هەليسەيه • دانه وگۆشت دخن ناڤ وباش دكەلێنن •

(دانق) ـ ژ(دانك) ـ دانه • دەركەتيه • ناڤێ پەراكى كەڤناره ـ دەما عباسيا يه • درسته زكوردى وفارسي ستاندبن • ع (معروف) •

(داك) ـ بداخوازا (دێ) ـ دايك•
هاتيه ع (الام) •

(دايك) ـ بداخوازا (دێ)ـ داك)•
ع (الام) •

(دارك) ـ بچوكێ داره • گەلەك جارا ژبۆ زاڤا چێدكن • دبێژن :ـ داركا زاڤێ •

داره‌كي كنجا بسه‌رفه دكن
ول هاوير گۆڤه‌ندێ دكن ــ يا
دگه‌رن •
ع (شجرة العريس) •

(دال) ــ نافێ تيا (د)ه • شاعر
قۆزيێ برهێ يارا خوه وه‌كه
(د) دكن ودبێژن :ــ وه‌ك
چۆگان ودال •

(داندۆل) ــ دبي ژ (داندۆر) هاتبي •
ده‌ما (زارۆك ــ مندال) دگه‌ل
هه‌ڤالێ خوه دچن مالا وى ،
ديا وى ژێ دپرسي ودبێژي
:ــ ئه‌ڤ چه داندۆله ؟ ــ
داندۆره • يانى ئه‌ڤ چيه ته
دايه دۆرا خوه ؟ دايرۆده
دروسته بداخوازا (مظاهره)
بێ ع (المظاهرة والتجمع) •

(داهۆل) ــ نافێ ده‌فى يه • لێ
نافێ ده‌ف ژ داهۆلێ فره‌هـ
تره • ژبه‌ر كۆ داهۆل هه‌ر
ته‌نێ ژبۆ گۆڤه‌ندێ دده‌ستێ
جه‌نگه‌نا ده هه‌يه • به‌لام
(ده‌ف) ــ ده‌فك بچوكێ وێ

يه گه‌له‌ك نفشێ وێ هه‌نه •
عربانه ژى :كه‌ڤى بن نافێ ده‌ف،
لێ ناكه‌ڤي بن (داهۆل) •
ع (الطبول ــ طبل) •

(دام) ــ ليزه‌كه ــ دامه‌يه • ده‌رباس
بويه • دام بداخوازا داڤ
هاتيه • ده‌رباس بويه •

(دان) ــ دانه ــ حه‌ب ــ لب •
ده‌رباس بونه • دفرده (دان)
گه‌نمێ كه‌لاندى يه ــ كوتاى ــ
دانويه • لێ بخوه ژ دانه
ــ ده‌ركه‌تيه •
ع (الحب المطبوخ) والمدوقوق •

(دان) ــ داين • ئه‌وه كو مرۆڤ
نشته‌كى بدى يه‌كى •
ع (العطاء) •

(دان) ــ بداخوازا (دران) هاتيه •
هن دبێژن :ــ ددان •
ع (الاسنان) •

(دانه‌به‌ردان) ــ من ژنا باراى
دابه‌ردان •

(داكرن) ـ زێدەرێ تێپــــەرە ـ دەرباسە :ـ رەوشێ دەوێ‌خوە داكر ـ یانی ژ مەشكێ بەردا بەرۆشێ ـ مەخمـــەرێ ••• بارام آڤ بفەرهاد داكر •یانی بەردا سەر • (داكرن) ئـەوە كۆ مرۆڤ تشتەكـــی رۆن ژ زۆردە بەردی خوار •

ع (الصب والكب) •

(دادان) ـ رەوشێ تەنورا خوە دادا ـ ڤێخست • آگر دادا ـ دارا بداخوازەكێ‌نە •

ع (الاشعال) •

(داكەتن) ـ زێدەرێ تێنەپـــەرە • بارام داكـــەت ـ مـــن بارام داخست • داكەتن ئەوە كـــۆ ژ زۆردە بێ خوارڤە •

ع (الانحدار) او النزول •

(دابەزین) ـ زێدەرێ تێنەپـەرە • بشیوەئێ سۆرانی (دابەزین) بداخوازا (داكەتن) هاتیە • لێ لجەم من نەراستە • ژبەركۆ (بەز) رەڤــە • (دابەزیـــن) ئەوەكۆ ژ زۆرڤە برەڤي بـەر بژێر :ـ بارام دابـــەزی • ب‌بەز هاتەخوار • داكتەخوار• بارام ژ سەر هەسپێ خــــوە (دابەزی) نابـي • ژبۆكـــۆ (بەز ـ رەڤ) دداكەتنا هەسپێ دە نینە •

ع (الانهزام والاســــراع في المشي والنـــزول من الاعلى الى الاسفل) •

(داباں) ناڤێ شورەكی یە •

ع (نوع من السیوف) •

(دابەزاندن) ـ زێدەرێ تێبـەرە :ـ مالا رەشۆ ومالا بارام دابزینـە هەڤ ـ دابەزیانە هەڤ • یانی اێریشی هەڤ كرن ـ هیرشێ بەاێك دان •

ع (المهاجمة) •

(داچكاندن) ـ ئەوەكــۆ مـــــرۆڤ تشتەكی دڤـــادێ بچكێنـــي وســــەرێ وی بلنـــدبي • لێ گەلەك دوری دناڤ بەرا

چكاندن وداچكاندن خويـــا
ناكي • ع (الغرس) •
(داگرتن) ـ گرتن ئەوە كۆ مرۆڤ
تشتەكى بگرى ـ لێ (داگرتن)
ئەوە كۆ مرۆڤ تشتەكـــــى
تژەبكى پربكى • ع (التعبأة)•
(داخستن) ـ ژێدەرێ تێپـــەرە :ـ
بارام داكـــەت ـ من ئـــەو
داخست • بارام فەرهادخست ـ
اوقعه :ـ بارام فەرهاد داخست
ـ انزله • ع (الانزال) •
(دانەگرتن) ـ بگرتندان • مـــن
باردام داگرتن •
(داگەراندن) ـ ئەوەكۆ مرۆڤ يەكى
ژريا وى داگەرێني ـ بـەرێ
وى ژريا وى بگوهـــەرى •
بارام فەرهاد ورەشۆ ژهـــەڤ
داگەرانــدن • دخوەســتن
اێريشي هەڤ بكن ، لێ بارام
نەهشت وبەرێ وا ژهـــەڤ
داگەراند • من بارام گەراند ـ
من بارام داگەراند • بـــەوا
گەريا ـ (دار) • بارام داگەرە
ـ (أدار) •
ع (ارجاع الرجل عن وجهته)
(دانەكوشتن) ـ بكوشـــتن دان •
من بارام داكوشتن •
(دالەقاندن) ـ بدارڤەكرنە • دلشـــ
تورێ خوە دالەقانـــدى يە ـ
بدراڤە كريە •
ع (التعليق) •
(دامەزراندن) ـ بجيكرنە • مەزر
ـ مەزرەعە • يـــە ـ مكانە ـ
شونە ـ جي‌يە •
ع (الاسكان التحضر) •
(دانەباركرن) ـ من‌بارام داباركـــرن
باركرن‌دا •
(دانەرەڤاندن) ـ بارام كەچافەرهـاد
رەڤاند ـ من كەچا فەرهـــاد
ببارام‌رە دارەڤاندن •
ع ( • • • )
(داغكرن) ـ داغـــدان • من بارام
داغكـــر ـ دەغماك ژآگـــر
لێ كر •

(دانين) ـ دانان ـ دينان • بداخوازه‌كێ‌نه • بارام نان دانى بەر فەرهاد •
ع (بارام وضع الخبز امام فەرهاد) •

(داغدان) من بارام داغدا • دەغماكە آگرى لێ‌كر •
ع (الكو بالنار) •

(دان) ـ چاخە • دانێ سبێ ـ دانێ نيڤ‌رۆ ـ دانێ عصر ـ دانێ آيڤارى • ع (الوقت) •

(دانزانين) ـ ئەوەكۆ مرۆڤ تشتەكى بمرۆڤەكى ـ مرۆڤەكێ ـ بدى‌زانين ـ فێربكى •
ع ( التعريف والتعليم والاخبار) •

(دانكرن) ـ ئەوەكۆ بەرخ‌وكارا دان‌دكن ـ دان بدان شير ددن وان ـ بەردن بەر ديا وان •

(داهشتن) ـ ئەوەكۆ مرۆڤ تشتەكي بەردى جيكى كور وسەرژێر •

دبێژن :ـ بارام دەولا خوە داهشتە بيرێ • ع (الدلو) •

(داهەراندن) ـ پەزێ خوە داهەراندە سەر خوێ ـ سەر آفێ •
ع (الاسترسال) •

(دانشتن) ـ رونشتنە • لێ (دانشتن) لجەم كورمانجا ژ چوك وچڤيكا رە تێ گۆتن • بەلام لجەم سۆرا تەڤايى يە • چما وا كۆ (نشت) بويە بداخوازا (وەلات) نشتمان ـ وەلاتێ مە •

•••

(داو) ـ لێڤ وغراغێ كراس وخەڤتان وبەرگێ مرۆڤە •
داوى ـ پاشي‌يە •
ع (الذيول والاطراف) •

## ( ده ـ آ )

(دەريا) ـ بەحرە ـ گۆلە • كورد وفارس دڤردە هەمبارن •
ع (البحر) •

(دەقۆريا) ـ ائلەكە كوردە • پاي‌تەختا وان شارێ (آمودێ

ـ عامودێ) يه • (تاكـۆرا ـ تاكۆريا) ايله‌كه مه‌زنه كورده ل راژۆرێ كـوردســـتانا بن‌ده‌ستێ تركيا دكه‌ڤي دبێژن هه‌ردو ايل پسمامێ هه‌ڤن • ع (عشيرة كوردية غربـــي مدينة قامشلية) •

(ده‌ل‌مه‌مكا) ـ ايله‌كه كورده • ع (عشيرة كوردية) •

## ( ده ـ ئه )

(ده‌بده‌به) ـ فه‌خفخه ومه‌زناهـــي وعظمة • عرب ژى ولــــۆ دبێژن • ع ـ (العظمة) •

(ده‌بانچه) ـ دبي ئه‌و داركێ كــۆ پێ ل ده‌فێ دخن • ژبه‌ركـۆ (خانى) دبێژى :ـ

ـ لێ‌دايه ده‌فا مه بێ ده‌بانچه •
لێ نزانم ته‌بانچه يا ده‌بانچه •
راسته •

ع ( العود الـذي تضرب بــه الدفوف) •

(ده‌رگه) ـ ده‌ر ـ ده‌رى يـــه :ـ ده‌رگه‌هێ لطفا ته خانم •ده‌رگه‌ڤان ـ ئێ كۆ ل بـــه ده‌رگه ـ ده‌ر ـ نوبـــه‌دێره • پێوانى دكى • ع (الباب) •

(ده‌ره‌جه) ـ ئه‌شكه‌ره خويادكى كو عربي يه • به‌لام واديـــاره (ده‌رگه) هاتيه • بويه ده زه‌كه ـ بويه ده‌ره‌جه • ژبه‌ركــو عرب نكارن (گ) ب‌خوێنـــن (ج) دنڤيسن • ع (معروف) •

(ده) ـ آلافه‌كــــه دێنش وبلنى ژبۆ ب‌جيكرن ـ تأكيد هاتيه •

ده‌وه‌ره ـ دڤرده‌يه •

(ده‌رفه) ـ يا ده‌رف • نفشـــــه‌كه ژ(كه‌له‌كا) يه • ل سه‌ر آڤــى چه‌ما پێ كارێ خـوه دكن • دارا ب‌هه‌ڤه گرێ‌ددن و بحێ خوه ل‌سه‌ر دكن و به‌رژێـــر دچن • ع (الطوف) •

(ده‌رڤه) ـ دهه‌مبه‌ر هندرو ده هاتيه ده‌روه • ع (الخارج) •

(ده‌زگه) ـ صنعته • ژ (ده‌ستگـه)

دەركەتيە • جهـێ كـارێ بدەستە • (دەز) ـ دەست • (گە) جي‌يە • • ع (الصناعة) •

(دەردۆ) ـ نافێ سترانەكێ يە •
ع (غناء كوردى) •

بەستە

دەردۆ ! دەردۆ ! دەردۆ !
دەردۆ !
دەردۆ ! دەردێم پێشمـال
شيسنێ •••••

(دەشۆ) ـ ئەو آفا كۆ آلافێ خوارنێ پێ دشۆن • لپاش شوشتنێ نافـێ وێ دبـي (دەشۆ) • واديارە ژ دەستشۆ هاتيە ـ آفا كـۆ پێ دەسـت هاتنـە شوشتن •

ع (الماء التى تغسل بها الصحون بعد الاكل) •

•••

(دەفەرو) ـ ئێ كۆ دروێ هەفالێ خوە دە راستا راستا هەر تشتێ دبێژى •رو ـرودێم ـ(وجه)• رومەت ـ وەجاهەتە • بـەلام (دەق ـ دەقە) پتكـێ رەش كۆ ژن ومێر لخوە دكن ، يا لجل وچاو دكن • دبي ژدەقا رو هاتبي • يانى وەكە دەقـا رو ئەشكەرە دبێژى ، يـان ددەقا روێ هەمبەرێ خـوە دە لێ ددێ ودبێژي •
ع (الصريح) •

(دەلو) ـ مرۆفێ آقل سفكە • دبـي ژتركى هاتبي ، يان تركـا ژكورد ستاندبي • (دەلودين) مرۆفێ سفك و دەف بكـەن ودل خوەشە •
ع (الانسان الذى لا يبالي بشيء او خفيف العقل) •

(دەرێ) ـ (دەر) بداخوازا (د ـ دە) هاتيە • آلافەكە تێدەبونـە ـ (ظرفية) يە • فارسي يە • پێ ـ با لنگە دەرێ • ئەوێ كۆ دناف پيا دە ـ دناف لنگـادە دناف رانا دە يە •
ع (كلسون) •

•••

(دەرپي) ـ دەرپێ یە ، دەرباس بویە ، کورمانج هن دبێژن :ـ پێ ـ وهن دبێژن :ـ پي ، وجارنا دبێژن :ـ پا ـ پای تەخت ، پالەوان ـ پالەڤان ،،

(دەیدي) ـ بچوکێ وێ دەیدک هاتیە ، دەما ژن زارۆکێ خوە دکن خەو ، ژوا رە دناورینن ودبێژن :ـ دەیدي لاۆ ! دەیدي ،،، دەیدی ـ دەیدک ـ لانکە ، هێلانە ـ هێلینا زارۆکێ مرۆڤا یە ، هن دبێژن :ـ لاندک ،

ع (المرجوحة) ،

(دەری) ـ دەر ـ دەری ـ دەرگە ، بداخوازەکێ نە ، (دەر) دڤردە نە بداخوازا شونێ هاتیە، بەلام بداخوازا کونێ ـ قول هاتیە ، بارام برینا خوە دەرکر کون کر ، دەر ـ دەری کونا خانێ یە ،

ع (الباب ـ الفتحة) ،

(دەرەنگی) ـ ژێدەرێ دەرەنگ ، دڤردە کرن ژێ دەرناکەڤن ، هەر تەنێ دەرەنگ ـ دەرەنگی هەنە ، دەرەنگە ـ یانی نەمایە ـ چاخێ مە دەربس بویە ، کورد دەرەنگ گهن ـ دەرەنگ رابونە ، بەر بدەرەنگي هات ،

ع (بعد فوات الوقت) ،

(دەزی) ـ تا ـ آفدە یە ، تا و دەزی جارنا ل پەي هەڤ تێن ، گەلەک زراڤ ، دبێژن :ـ بارام بویە وەکە دەزی یەکی ـ وەکە تاکی ، ع (الخيط الرفيع) ،

(دەرزی) ـ وا دیارە (زی) پێ مرۆڤا یە ، (دەر) چو دەرباس بویە آلافەکە ژبۆ تێدەبونە ، ئەوا کۆ دبەر زێ ژنادە یە :ـ

بەستە :ـ

لە سفاندی کانی یێ

مەدەست بر بۆلۆ (زیێ)

به هێجەت دەرزیێ ...
راستە کۆ دەرزی دبەر زیـــا
ژنادە هاتیە چکاندن . دەرزی
زیف وزێر هەبون کۆ ژنــــا
دخستن بەر زیا کراسێ خوە.
سەرێ وێ بگوپک وشرکبو
.من بخوە دبەر زیا ژنا دە
دیە . ع (الابرة) .

(دەستتەنگي) ـ پــەریشـــانی و
بلەنگـــازی و بــێمالی یە .
(دەستێ) بارام تەنگە ـ کێـم
پارە یە ـ حالێ وی نەخوەشە.
ع (الضنک والضیق) .

(دەستفەکری) ئــێ جۆمـــەرد
وچـاففرەهــــە :ـ بـــارام
دەستفەکري یە ـ جامێرە .
دەستێ فەکـــری پەرا ددی
خـەلکێ . دەســـتێ گرتی
تشتــەکی نادی کــەسي .
(دەستبەلاف) ئێ کۆ گەلەکی
مالێ خوە بەلاف دکي .
ع (الجواد) .

(دەستگرتي) ـ دەزگـــرتی . وا
دیارە کۆ ددەمێـــن بۆري دە
ژنومێرا دەستێ هەف دگرتن
ومارا خوە دبررین . ژلەورا
دە ستگیران ودەستگرتی هاتە
ناف زمانێ کوردی.دەستگرتی
یا بارام ـ دەســـتگرتي یــێ
رەوشێ . بەلام (دەستگیران)
ژبەرکۆ ژێدەرە هــــەرتەنێ
(مێ) یە . (یا ـ آ) نیشانێ مێ
نە . (ئێ) نیشانا نێرە .
ع (الخطیب والمخطوبة) .

(دەستوردای) ـ ئێ کۆ دەستورا وی
ددی ژبەر خوەفــە دشێني ـ
دنێـــری . ع ( المرخص )
والمأزون .

(دەفـي) ـ دارێ هـــور وبتۆفن .
ژقورمەکی گەلەک دارێ هور
دەردکەفن . دار ودەفي لپەی
هـەف هاتنـــە . ژدەفي یــێ
مـــەزنتـر (تامۆر). تامۆر
گەلەک دارێ هـــور وفرەھ
مرۆفدناف دە ونـــدا دبێ .
بسەرهەفەنە . ع ( ..... )

(دەلی) ـ وەکە (دەلو) هاتیـــــە •
ژهەردوا بینا ترکی تێ •

(دەنگی) ـبداخوازا دەنگە •دبێژن:ـ
کۆ تو هاتی بێ دەنگی وەرە•
یانێ بەرە کەس دەنگێ تـــە
نەکی ـدەنگێ تە نەچي کەسي
بێ پێژن • ع (سراً وخفية) •

(دەپ) ـ تەختــە • یا پــەرچاك
ژتەختە • ع (خشبة) •

(دەست) ـ دیارە • ع (اليد) •

(دەشت) ـ بـــداخوازا راست وپـان
هاتیە • (زاردەشت) بداخوازا
راستگۆ هاتیە (زار ـ دەشت)
ـ زار ـ راست ـ راستگـو
یە • پەیغامبەر دبي راستگۆ
بي ـ صادق بي • ع (سهل)•

(دەمەت) ـ تاخە ـ پێچە یە • بەلام
د ( باستیق ـ حـــەلیل ) دە
ـ دتوتن دە تــێ گۆتـن :ـ
دەمەتەك باستیق .. دەمەتەك
توتن • ع (الربطة واللفة) •

(دەولەت) ـ دەول ـ دۆل زارۆك
وژێڤـەکەتینە :ـ بارام دەو
فلانکەســە • زانم فەرهـــ
دەولاکێ یە؟ دەولەت زێدەبوە
ـ زێدەبونا مال ومنداله • پشی
بویە سەرمیان ـ پاشێ بویـــە
حکومەت • بارام دەولەمەنـ
یانێ خوەدێ دەولە ـ خوەدێ
مـال ومنـدالــە • دعربی نـ
(دەولەت) ـبگر بڤێ داخوازێ
هاتیە • لێ دکۆکـا خـــوەند
کوردییە • ع (معروف) •

(دەرباس) ـ دەرباسبون ـتێپەرینە
:ـبارام دەرباس بو ـ من بارام
دەرباسکر • دەرباسکـــرن
زێدەرێ تێپـــەرە • دەرباس
بویە ناڤێ مێرا • میر دەرباس
أمیرێ لەشکەرێ (مهریني) بو
دشەرێ چەلیپيیا دە هاتــــە
کوشتن • ع (العبور والمرور)•

(دەرخ) ـ ئەو دارا کۆ مرۆڤ نـــو
دچێنێ •دبي ژ تەرح ـتەرخ•
هاتبي •بچوکێ وێ دەرخك•
ع (الغرس) •

(دەرد) ـ نەخوەشي وغــەم وائێش وكول وكەدەر وآزاری یە :ـ
ماچەك ژوان لێڤێ شرین
دەردێ دلێ من خوەش دكي •

دەردۆ ناڤێ بەســتاكێ یە ـ ناڤــێ سترانەكێ یە • ع (الالم) •

(دەربەند) ـ گەلي وتەنگەجی یە • دەربەندێ (بازیان) ناڤــدارە • دكەڤي ناڤبەرا كــەركوك وسلیمانیە • ع (المضیق) •

(دەند) ـ بچوكێ وی دەندكــــە • ناڤك ـ تۆڤ و بزرێ شەبەش وگندۆر وعــەجورو تــرۆزی وهن تشتێ دی یە • (دەنــد) نەهاتیە گۆتن ، بەلام مەزنــێ دەندكە • ع (بزر البطیخ ومــا شاكلە ) •

(دەولەمەنــد) ـ (دەول) مال وزار وزێج وزێدەبونە • ( مــەند ) آلاڤەكە وا دیارە بــــداخوازا خوەدی ـ صاحب • هاتیــە • ع (الغنی )•

(دەرز) ـ تەرك ـ قەلش وچراندنە. كوزێ (فاتێ) دەرزیە ـتەرك لێ كەتیە • هەستیێ دەستێ فەرهاد دەرزیە ـقەلشـــیە • ع (الشق من الشقوق ) •

(دەلێر)ـمرۆڤێ پالەوان وگەرناسە• ع (البطل)•

(دەنگبێژ) ـ ئێ كۆسترانا دبێـــژي بدەنگێ خوە دبێژی •• دەنگ ئێ وی یە لێ دبي ستران نەیا وی بي •سترانڤان ـخوەدانێ سترانێ یە •ژلەورا (بوێژ) كۆ لناڤ سۆرا كرنـــە ناڤ ژبۆ (شاعر) نەراستە • (بێژ) گۆتنا تشتەكی یە ، نەچێكرنـــا وی تشتی یە • ع (المغنی) •

(دەوێژ) ـ ئەو تشــــتێ كۆ لپاش پژانــــدنـا رون درونێژێ دە دمێني ناڤێ وی دەوێژە • دبي ژ (دەو) هاتبي ـ دەوێ كـــۆ دناڤ رون دە پژیایـــــە • ع ( ماتبقی بعد قلي السمن في الدست ) •

(دەرگوش) ـ ژدار و آسن چێدکن وزاروٚک ـ منـــدالا تـــێدە رادزێنن ـ دخن خەو • دبي ژگەردوٚش هاتبي ـ ياني گەرا وێ بهەژە ـ بدوٚشە •

ع (المرجوحة) •

(دەموش) ـ دشيراني‌دەهەيە • دەمـا مروٚف تشتەکي شێرين دخوی دەستێ مروٚف بـــدەموش دبي وەکە مروٚفەک تليا خوە بـخي ناف دمســێدبێژی :ـ تليا من بدەموشە •ع (دەبق) •

(دەروێش) ـ يادەرويش • ئێ کوٚ ل بەر دەرێ‌خەلکێ ل پارســێ دگەري • دبي ژ دەر ـ آوێژ ـ آڤێژ هاتبي • ع (الفقـير ـ أو السائح ) •

(دەندوش) ـ ئەو گولک وخرخرکێ کوٚ ژن و زاروٚک بـخوەفـــە دکن • ئەوتشتێ کوٚ دهـــەژن

(دەف) ـ دەم • نافـــدارە • بێدەف ئەو مروٚڤێ کوٚ نکـــاری ل چڤاتا ـــل‌بەر خەلکێ‌قسە بکي•

ع• (الفم) •

(دەلاف) ـ دبي ژ (دەرآف) هاتبي •

ئەو جهێ نزمە کوٚ ل بــــەر آڤا مروٚڤ دکاری سوال وپەزێ خوە لێ آف‌بدی • ايروٚ ئــەم کارن ژ (مينـــاء) رە بێژن :ـ ( دەلاف ) • دەلافـــــێ اسکەنـــــــدەرونێ ـ دەلافێ بێروتێ ••• ع ( تأتي بمعنى الميناء ) •

(دەق) ـ پتپت • دەق ژن ومێر جارنا دەقا ل لاشێ خوە دکن • ئەز جارەک هاتم کوٚ کـــــەچک سەرێ پوٚزێ ـ لوتێ کورەکي بچوک ددەقێنن دەما من ژوا پرســـي :ـ چما ولوٚ دکن ؟ دبەرســــڤا من دە گوٚتن :ـ دا خوەدێ پێ رازی‌نەبي • ياني ئێ بدەق ل‌جــــەم خـــوەدێ نە مقبولن •ع (الوشم) •

(دەق) ـ کابا مەزنە کوٚ پێ ل کابـــا

دخن • پاشێ بويه ناڤێ وى
مرۆڤێ كۆ دناڤ ايـل وباڤك
ومرۆڤێ خوه ده خوه يــــهل
دكى •دەڤۆ ـدەڤێ ـ دەڤك•
بونه ناڤ ع (الكعب) •

(دەف) ـ داهۆله • دەفك بچوكـێ
وێ يـه • عـــرب ژى ولـۆ
دبێژن •

(دەرف) ـ دەرفه ـ دەرباس بويــه
بــــارام بێ دەرفـه ـ يانێ بێ
وژدانه ـ بێ قانون دكى •يانى
بێ دەرفه كارى خوه بەردى
ناڤ آڤێ •

(دەك) ـدەك ودۆلاب دكورمانجى
ده لپەيي هەڤ تين :ـ دەك
دۆلابێ بارام (ياستار !) كارى
آشێ بێ آڤ بگەرينى •
ع (الحيل والخداع) •

(دەڤەلك) ـ جهێ دەڤا يه ـ جهـێ
حوشترە• دبي ژ تركى هاتبي.

(دەڤلۆك) ـ ئەو جاندارێ كۆ دەڤ
لمرۆڤ دكي • ع ( كل شيىء
يعض الناس ) •

(دەلاك) ـ زعربي هاتيه • ئـــەو
كەڤرێ كۆ مرۆڤ پێ خانىيا
دەدلكينى •

(دەستك) ـ دۆخكه • دەســــتكێ
رونپێژێ ـ دۆخكا وێ يه •
هن دبێژن :ـچەمبل ـدبەرۆشا
ده ـ دساتلادە هەنە • بـــەلام
چەمبل ودەســــتك نەيەكن •
دەســتك ـ دۆخك درێژە •
وچەمبل خەلەكە •

(دەربك) ـ ناڤەكى شخاتێ يه • يان
چەتشــتێ كۆ هورك وبتەقى
دەربك ـ نفتك ـ دەربــك
دتەقتاقا ده مه دتەڤاندن •بەركێ
گولشيلاڤێ بون • ع ( اســـم
للشخاطة ـ الكبريت ) •

( دەنـــــگ ) ـ دەن ـ دەى •
بداخوازەكێ نـــه :ـ دەنگـێ
(جزراوى) خوەشه • خەلكێ
ســليماني (دەن) لشونا دەنگ
دبێژن • هن كورمانج (دەى)
دبێژن :ـ دەى ل بارام بكه ـ
دەني لێبكه • ع (الصوت) •

(دەنگ) ـ آلافەکە ـ دەزگەهەکـە پێ دان دکوتن ، پێ گەلەک کاری دکن •مالا بارام سافاریێ خوە بدەنگێ کوتانە •ع (••)

(دەرەنگ) ـ دەرباس بویەـدەرەنگي •دەرباس بونا چاخە •

(دەلال) ـ ژعربي هاتیە • بەلام بویـە کوردی • ناڤێ چەند سـترانا یە :ـ دەلالێ بەرییێ ـدەلالێ شنگالێ ـ دەلالێ چێێ •••

دەلال ـ مدلل ـ نازدار ـجوان ـ خوەشک • ع ( المدلل ) •

(دەسمال) ـ دەستمالە • آکۆ دەستێ خوە پێ دمالن • دەستەمالە • بەستاک لسەر دەسمالێ هەیە•
ع (منديل)•

(دەول) ـ مال ومندال وزێدەبونە • بارام دەولا فلانکەسە •کورێ وی یەـژویزێدە بویەـزریەتا وی یە • ع (الزرية) •

(دەول) ـ ژچەرم چێدکن پێ آڤێ ژ چالا دکشێنن • عرب دبێژن :ـ ع (الدلو) •

(دەوێل) ـ ژچـەرم چێدکن • پێ دارا ـ آلەتا گرێ ددن • هن دبێژن :ـ دوهێل • هن دبێژن دوێل • ع (کالخیط الغلیـظ مصنوع من الجلد لشد الاخشاب وغیره ) •

(دەم) ـ چاخە ـ وختە ـ کاتـــــە ـ زەمانە :ـ دەم دەما دژمنـــــە • ئەڤ دنیا دەمە • دەمەک گولێ یە ، دەمەک گولشیلاڤێ یە •
ع ( الزمان ) •

(دەم) ـ بداخوازا رەنگە • دبێژن :ـ چایێ دەم دایە ـ رەنگ دایە• دروستە ( دێـم ـ رودێـم) ژ دەم هاتین • ع ( اللون ) •

(دەرەم) ـ دکێشانێ دە کارتەکە • دبي غرام جهێ وێ ستاندبێ • هەروها بداخوازا درهـــــەم هاتیە •

(دەرهەم) ـ دبي ژ فارسي هاتبي • (دەر ـ هەم ) د هـــەڤ دە ـ پێکەوە•خوردمـــور ، دەرهەم ـگرس ـ بهەڤە ـ دهەڤدە

ع (معروف) •

(دەيسەم) ـ پادشـــاهەكى كـوردە
لكوردستـان وازەربايجـان
فەرمانـدارى پێلەكــە دور
ودرێژ كريە • پاشێ بدەستێ
سالار كورێ مامەلان هاتيــە
گرتن وچاڤێ وى رژانـدنـە
وپاشێ كوشتنە • ع ( اســم
ملك كوردى ) •

(ديلەم) ـ باڤككێ ژ فارسە ـ ژايرانە
ابو الفداء الحموي دداباشــا
(كــورد) دە دبێژى :ـ فارس
(٣)باڤك ـ سێمللەت ـ سێ
قەوم دبن في ناڤي دە ـ دبن
ناڤێ (فارس) دە هەنە • كورد
ـ جيل ـ دەيلەم • وا ديـارە
كۆ دايرۆدە (جيل) ناڤێ فارس
ژخوەرە ستاندیە •بەلام كورد
بناڤێ خوە مايە •تەنێ دەيلـەم
وندا بويە •هن دبێژن :ـتركێ
آزەربايجان لشونا وان مانە •
وهن دبێژن :ـ زاز ـ دومـل
ـ دمبل ) بەرمايێ دەيلەمن •
لێ گەلەك دروستە كۆ ئـەم



بێژن:ـ (دلێم) كۆ ايرۆ بونـە
عرب بـــەرمايێ دەيلەمن •
ع (احدى قوميات ايرانية) •

••

(دەن) ـ كويەكى مەزنە • دشعرێ
كوردي وفارسي دە گـەلەك
هاتيە • لجەم كورمانجا تــا
ايســتاش (دەن) ناڤــدارە •
بچوكێ وى دەنـك • تێ دە
ترشي چێ دكن • دۆشـاب ـ
دمس ـ دخن دەنا •
ع (اكبر من الكوز) •

(دەن) ـ لجەم كورمانجا بداخوازا
رەنگ ـ صبغ هاتيە • رەوشێ
كنچێ خوە شاندنە سەر دەنێ
رەشكرنێ •
ع (الصبغ) •

(دەن) ـ چاوا دەرباس بويە هــن
كوردێ هێلا سليمانى بداخوازا
(دەنگ) دبێژن •
ع (بمعنى الصوت) •

(دەرباس كرن) ـ ئەوە كۆ يــەك
يــەكـى ژ رەخــەكى ببـي

رەخەكی • بارام دەرباس بو ـ
من بارام دەرباس كر •
(دەرخستن) ـ دەركردن ـ دەركرنە
ع (الاخراج) •
(دەركرن) ـ دەركردن ـ دەرخستن •
(دەرباس بون) ـ ژێدەرێ تێ نەپەرە •
ب خوە دەرباس بو ، نەكەسی
ئەو دەرباس كر •
ع (العبور) •
(دەرچون) ـ بارام دەرچو ـ چـو
دەرڤە • ع (الخروج) •
(دەركەتن) ـ بارام دەركـەت •
رۆژ دەركەت •
ع (الطلوع والظهور) •
(دەرمـان) ـ نافـداره • دەرد
ودەرمان • ع (الادوية) •
(دەرگەڤان) ـ پێوانێ دەرگە یە •
ع (البواب ـ حارس الباب) •
(دەرهینان) ـ وەكە دەرخستنە • هن
دبێژن :ـ دەرانین •
ع (الاخراج) •
(دەرزەن) ـ ژكوردی چو یەعربی •
ئەوێ كۆ بدەزی بهەڤـە
هاتنە گرێدان ـ دەستاكە •

ع (معروف) •
(دەزگین) ـ دەستگیره • هەڤسارێ
هەسپایە :ـ
دەلالێ مالێ سـوار بویە ل
مەهینێ
م دەسـتەكی خـوە آڤێتە
زەنگوێ
دەستـێ دنـێ م آڤێتە فـێ
دەزگینێ •••
(دەمان) ـ ژ ضمان هاتیە • دەمانا
گوندا ئەوەكۆ هاتنا گونـد ژ
حكومەتێ دەمان ـ ضمان دكن •
•••
(دەهـ) ـ كارتەك ژمارە •
ع (عشرة) •
(دەرگەهـ) ـ دەرگە ـ دەر ـ دەری
یە • دەرگەهـ بویـە (دەر)
سفك بویە • :ـ (دەرگەهێ)
لطفا تە خانم گەر ل محرومان
ڤەبی •• ع (الباب) •
(دەزگەهـ) ـ دەستگەهە • دەرباس
بویە • ع (مصنع) •
•••

(دەو) ـ دۆ • ژ ماست وآڤـه • ل سـەر ( دەو ) يەسـتاك هاتيەچێكرن • دەوێژ چـاوا دەرباس بويە ژ(دەو) هاتيە •
ع (الروبة) •

## ( دو ـ آ )

(دوندا) ـ كور ـ لاوه ـ بەرمايـێ مرۆڤ ئێ نێره •دبێژن :ـباران كوردوندا مريه ـ فەرهاد بێ دونـدا يه • هن دبێژن :ـ (دوندە) •باران بێ دوندەيه •
ع(الورثة من الذكور ـالخلف)
(دومانا) ـ ناڤێ ايڵەكه كوردە ل ناڤ هەڤيركا يه • (عشيرة كوردية)

## (دو ـ و)

(دو) ـ دوخانه • بەلام (دو) راستە• ژبەركۆ دوخـان ـ خانا دو يه ـ جهێ كۆ دو تێره دچي• دو گەرەكه ژ آگر دەركەڤي• گەنگی دو خويا بو ئەم زانن آگر هەيه •
ع (الدخان) •
(دو) ـ بداخـوازا پاش ـ پەی • هاتيه :ـ باران لدو فەرها دە ـ لپـەی ویيه ـ لپاش ویيـه • دبـێ ژ( دوف ) دەركەتبي • دوف ـ تەری ـ كلكـه • دوڤێ چێلەكێ ـ دوڤێ گامێشێ •
ع (خلف ـ بعد ـ وراء) •
(دورو) ـ ئەو مرۆڤێ كـۆ دروێ مرۆڤ دە تشتـەكی ولپاش مرۆڤ تشتەكی دی دبێژی •
ع (منافق ـ ذو الوجهين) •
(دومو) ـ چيرۆكا دومو ، سێ مـو دناڤ كورمانجـا دە بدەنگە • بچيرۆكـا سـێ كۆسايه • سێبرايه • دروێ يـەكی دە يەكـمـو و دروێ ئێ دوەم دە دو مو ودروێ ئێ سيەم دە سێمو هەبون • سێبرا بـون لێ ددلێ خـوەدە دوژمنـێ هەڤ بون • واديارە مروڤـێ بێمـو لجـەم كورمانجـا بێبەخت وبێ ئەولەيـه • ژلەورا دبێژن :ـ قەدا بكەڤی مرۆڤێ روت وژنا بپورت •
ع (كناية عن الرجل الحيال)•

(دوساله) ـ پارۆنه • ئەو جانـدارێ
کۆ دو سال دسەرڤه چوبـــن
ـ هن دبێژن :ـ پارۆنـــــه •
بەلام پارۆنه دبي دسالا پـــار
ده چێ بوبی •
ع (كل شيء مر عليه سنتان) •

(دوازده) ـ كارتەك ژماره ـ زێـده
ژماره • ع (اثنا عشرة) •

(دوشەمبه) ـ دوشەمه • دوشەوه ـ
دوشـــــــەڤه • كورد وفارس
بشەڤا ژمارا خوه دبێژن،بەلام
عرب برۆژا دبێژن •ع(الاثنين)

## (دو ـ ۆ)

(دودۆ) ـ بداخوازا رەقەم (٢) يه •
بەلام دكۆكا خوەده دبن (چار)
ژبـــەركۆ (دۆ ـ ٢ ) لپاش
(يەك ـ ١ ) تێ ئەگــــــەر
بێژن :ـ (دو ـ دۆ ) دبـــــي
دوجارا دۆ ـچار (٢ × ٢ = ٤)
دكي • لێ ژبەركۆ ب ( دۆ )
بداخــــوازا رۆژا چوى شاش
نەبي ولۆ گۆتنه •بەلام چەوته
ـ شاشه • ع (اثنان) •

## ( دو ـ يی )

(دوری) ـ ژێدەرێ يائی يـــــه -
دوركەتن ژێدەرێ راستيـــه -
دوری ، كرن ژێ ڤەناكەڤن -
بەلام دوركەتن • دوركەت ـ
دوركـــــەتم ـ دوركـــــەتی ـ
دوركەتن •
ڤێ دوریێ ئەم دين كـــــر ـ
هاوار ژدەستێ دوریـــێ -
بێ مذهب وبێ دين كرن •
هاوار ژدەستێ دوريێ •••

(دوڤرۆڤي) ـ نقشەك مێشــــنه ـ
نقشەك ـ گەنمه •

(دومايی) ـ دۆماهی ـ داوی يـــه •
خەلكێ بەهدينا ولۆ دبێژن
ع (التالی ـ النهاية) •

(دوسێ) ـ دكۆكا خوه ده دۆ يـــ
سێ ) ژبۆ سڤكی(يان) راكرنه
مايه (دوسێ) يەك دبێژی ـ
تێ كەنگی هـــــەری زاخۆ
دبەرسڤا وی ده دبێژی دوسێ
رۆژێ دی • يانی دوررۆژێ دی
يان سێ رۆژێ دی • دڤرده
(ايجاز ـكورتی)وتۆره هەيه •

دڤرده (رۆژێ‌دی‌یان) ئـــەڤ
هەمو هاتیــە آڤێتن • ع (اثنين
ثلاثة ) •
(دو بەنـــدی) ـ بەنـــد ـ پارتی ـ
حزبە :ـ گوندێ مە دوبەندی
یە ـدو پارتي یە ـ دوحزبە •
(دو) دڤردە بداخوازا رەقەم(۲)
هاتیە • پاشێ بویە زێــدەر •
پێکوە ـپێکڤە بویە گۆتەک:ـ
دوبەندی کەتیە گوندێ مــە •
بەربەری ژدوبەنـــدی فرەهـ
ترە • (بەر) دڤردە بەنـــــد
وبافکە • بەربەری ژ یەکێ و
بەرژۆرە • بەلام (دوبەنـدی)
ژدودوا بەرژۆر ناچي •
ع (التحزب) •
(دولپي) ـ دوپشــــکە • هنـــک
کورد دبێژن :ـ دولپي ـ لـێ
ئەم دبێژن :ـ دوپشک •
ع (العقرب) •
(دوز) ـ راست وفرەهـ :ـ بەریـــا
مێردینا شەوتي بەریکە دوزە
پۆزێ کەلا مێردینێ‌بســەردە
خوزە •••

(دوزان) ـ ژڤر دەرکەتیە •
ع (المتساوية) •
(دور) ـ دوری ـ دورکەتن •
ع (البعد والفرقة) •
(دورآڤێژ) ـ ئەوەکۆ دور تاڤێژی •
ایرۆ ئـــەم کارن ژ طۆپێ‌رە
بێژن :ـ دورآڤێژ • طۆپـــا
دورآڤێژ ع (بعيد المرمى) •
(دورودرێژ) ـ دور ـ و درێژە •
ع ( بعيد وطويل) •
(دوڤدرێژ) ـ دبي ژ دور و درێــژ
هاتبي • یان ژ دوڤ ـ تــەری
و درێـــــژ هاتبـــــي •
چیرۆکا مە دوڤ درێژە • یاني
ناگهێنە داوی ـ ناگهێنە پاش‌یا
وێ • ع (نهاية طويلة ـطويلة
النهاية) •
(دوڤ) ـ بداخوازا تەری هاتیــە •
دوڤێ چێلەکێ • بـــداخوازا
داوی ـ پاشي هاتیــە :ـ بارام
وفەرهاد ل‌دوڤ هەڤ هاتن‌ـل
پـــەی هـــــەڤ ـ هاتـــن ـ
ل‌پاش هەڤ هاتن • ع (الذنب
ـ الخلف ـ بعد) •

(دوفك) ـ بداخوازا تەری هاتیە ـ دوفكێ ناف چرافێ دیـــە . بداخوازا دۆخك ـ دەستك . هاتیە :ــراهێژە دوفكێ هەسكێ ـ دۆخكا وێ ــدەستكێ وێ . ع (الذنب ـ المقبض) .

(دودل) ـ ئێ نكاری زو بریار بدی ـ قەرار بدی ـ ســۆزبدي. جــــارەك دبێـژی :ـ آ . وجارەك دبێژی :ـ نا . ع (المتردد) .

(دومل ـ دومبل) ـ دنبل ـ زازن . نافێ چەند ائِل ودەرەبـــەگی نە ، كۆ ددەمێ كـــەفن دە ل راژۆرێ كوردســـتانا ایرانێ بون،لێ پاشێ هاتنە كوردستانا بن‌دەســـــتێ تركيــــا ول رۆژآفایێ بازارێ (آمـــــەد ـ دیاربەكر) دامەزری نـــــە . دەرەبەگی‌یەك لدارخستنە . پایی‌تەختا وان (پالەو ـ پەهلەو بەرمایێ پەهلەون . ع (عشائر كوردية من بقايا البهلويين .

(دوكەل) ـ هاتە زانین كۆ (دو) ـ دوخانە . بەلام (دوكەل) دوێ كۆ ز كـــــەلێ دەردكەفي . ع (البخار) .

(دوشەم)ـ دوشەمبە ، دەرباس بویە. بەلام كورد دبێژن :ـ دوشەم ــدوشــەفە ـ دوشـــــەوە ـ دوشەبە .

(دوركرن) ـ ئەوەكۆ يەك يا هنك يەكی ــهنا دور بكن .ژێدەرێ تێ‌پەرە . ع (التبعيد) .

(دوربون)ـئەوەكۆ بخوە دوربكەفي ع (الابتعاد)

(دورخستن) ـ وەكــــە دور كرنە. ع (التبعيد) .

(دوربین) ـ ئەو مرۆفێ كــۆ لدور دنـــەري ـ دور دبيني . ياني دزانى ـ دبيني كۆ دێ پاشێ چە ببي . پاشێ بویــە نافـــێ آلافــەكی كۆ مرۆف دكاری بآليكاريا وی ژدورفە تشـــتا

بيني • ع (الانسان الذي يفكر في العاقبة ويرى بذكائه ما سوف يجري في المستقبل ) •

(دوربين) ـ ئەڤ‌آلاڤا كۆ مرۆڤ پێ ژدورڤه دبيني • ع (المنظار) •

(دوزان) ـ ژدوز دەركەتيه ـ راست• دبێژن :ـ هاته ســـەر دوزانا خوه ياني راست بو • دشاهين وكيشانێ ده تێ خويا كرن •

(دوزان) ـ آلاڤەكه سەرێ مرۆڤا پێ كور دكن • دتـــەرێشـــن •

ع (موس الحلاقة ـ شفرة) •

(دوزمن) ـ دبي ژدژ ـ دز ـ قەلعه ـ كەله • دەركەتبي • واديارە خەلكێ دز ـ دژ وكەلەهـــا زۆرداری ودزی دكـــرن • ژلەورا كۆچەرا ناڤێ وان كرنه دز • دژمن ـ دژێ من ـ دزێ من • ع (العدو) •

(دورەه) ـ ئێ كۆ ديا دی وباڤێ وی نه ژ باڤككی ـ نەژ ائِلەكێ ـ نه ژملەتەكی بن •بێتر دبەزده

خويادكی • دناڤ بەرا كەژك وحيتك ده ئەشـــكەرا دبي • ئەڤ بزنا مه دو رەهی يـــه • ياني دێ ژ نفشەكی و باڤ ژ نفشەكی يه • ع (الذي ليس والده وامه من جنس واحد ـ الهجين ) •

## (دۆ ـ آ )

(دۆدكا) ـ ناڤێ ائِلەكه كـــوردە •

(دۆدا) گوندەكه لرۆژهلاتێ (عامودە ـآمودا) دكـــەڤي • (آدودا) خلجەكه ، يا سەرێ خلجه پێ كەرەنگا رادكن • ع (عشيرة كوردية) •

(دۆركا) ـ ائِلەكـه كوردە • لناڤ آشـــيتا ـ لرۆژهـــلاتێ (قامشلۆكێ) دكەڤي •ع(عشيرة كوردية شرقي قامشلية ) •

(دۆخرشمه) ـ رشمه ـ هەڤسارە • دۆخ رشمه ـ دۆخا هەڤسارە ـ دەستكێ وێ‌يه • ع (الرسن ـ اللجام ـ ما يمسك به الرجـل

من اللجام والرسن ) •

(دۆله) ـ كوندرێ حەشـــاندی ـ داگرتي نـــه • بچوكێ وی دۆلكك هاتيه • ش ( القـــرع المحشی) •

(دۆندرمه) ـ بهنا تركی ژێ تێ • نافداره • كورد وعرب وترك تەڤده ولۆ دبێژن •ع(معروف)

(دۆ) ـ دۆهـ ـدوێنێ ـ دهۆ ـ دوهي ـبداخوازەكێ نه •رۆژا بەری ايرۆیه • ع (الامس) •

(دۆ) ـ بشـــيوەێ سـۆري (دۆ) بداخوازا رەقــــەم (٢) يه ـ دودۆ يه • ع (اثنان) •

(دۆ) ـ دەوە ـ آف وماستێ كۆ رون ژێ دەرخستنه •بشـــيوێ سۆراني يه • ع (الشـنينه ـ الروبة) •

(دۆدۆ) ـ زۆزۆيه ـ جۆتجۆتـه • دۆدۆ وەرن ـ زۆزۆ وەرن • ع (الزوج ـ المزوج) •

(دۆدۆ) ـ نافێ مرۆفەكی نێچيرڤانه ، نافداره پێشيا لسەر گۆتيه :ـ

بارام وەك دۆدۆێ قولنگڤانه• :ـ(بوم دۆدوێ قولنگڤـــان ) شعرەكه منه •

دۆدۆ مرۆفەكی گـەلـــەك نێچيرڤانبو لێ پشتي كۆ پيربو خۆرتێ نورابون وبونـــه نێچيرڤان ـلبەردەستێ دۆدۆ هيني نێچيرێ بوبون •لێ پاشێ پێ دكەنيان ودگۆتن :ـدۆدۆ! خوە دەينه قولنگك هاتن •

(دۆشاب) ـ دۆشاو ـ دمسه • دبـي دۆش ـ آف ـ دۆش ـآو بي• دۆش ژدۆتن ـ دۆشتن هاتيه• آب ـ آو ـ آفه • ياني آفا • كۆ ددۆشن ـ دگوڤێشن • ع (الدبس) •

(دۆلاب) ـ لەولەب ـ دو لەولەب • چەند دار خاچكی بهەڤـــه كرێدای دۆلابه • چـــەرخ ژكەڤرە•بەلام دۆلاب ژداربو• لێ ايرۆ آسنی هەنه •ژكوردی وفارســـي چويه عربـــي • ع (معروف) •

(دۆت) ـ دۆخته • دۆتمام آمۆزايا ژنه •پسمام آمۆزايێ مێره • ژ دۆختەر هاتيه • يا دۆختــــەر ژ (دۆت) هاتيه •ئەڤ بێتر بەر براستيڤه دچي • • ع (البنت)•

(دۆست) ـيار وهەڤال وخۆشويست ودلخـــوازه • نێرومێ تێده وەكــەهەڤن • دۆســـتا منه ـ دۆستێ منه ب(آـئێ) خويادبن •ع (الصديق والمحبوب) •

(دۆخ) ـ ناڤێ آلائــــەكي جەنگێ وشەره جزيرى دبێژي :ـ (زالمێ كوشـــتم بــدۆخ) • هــــەروها دۆخ ـ دۆخك • دەستكێ هەســـك ورون پێژ وكەڤچي يه •••
جارنا ژنەخوەشاره بحەنەكێ دبێژن :ـ بسەرێ باڤێ تەكـم تو هەو بدۆخا كەڤچي دگري• يانى تێ بمرى • • ع ( آلـــة قديمة للحرب ) •

(دۆز) ـ دەعوا وطەلەبە •بارام دۆزا حەقێ خوه دكي ـ حەقێ خوه دخـــوازى • كـــورد دۆزا سەرخوەبونـا خوه دكى •
ع( الدعوى والطلب ) •

(دۆلار) ـ پاره ئێ ئەمەريكايه !

(دۆر) ـ نۆبه يه • دۆرا بارام ـ نۆبا وى يه •

(دۆژ) ـ دۆزەهـ ـ دۆزەخ ـ جهەنەمه • • ع (جهنم)•

(دۆش) ـ گەره • رەوشێ خـــــوه دۆش دكى ـ دهـــــەژێني •
(دۆش) گوڤاشتنه • دۆشاو ـ دۆشاڤ ـ دۆشآب • زڤـــر دەركەتيه • بژنا خوه بدۆشه ـ گوهانێ وێ بگوڤێشه • ژێدەر دۆتن ـ دۆشتنه • بەلام دڤردە هەژاندن وگەره • • ع (الحركة والاهتزاز والدوران ) •

(دۆشەك) ناڤداره • دوشــــەك ـ دوشەق ـ دورەخ ـ دولايي•

(دۆك) ـ تەشيـيـــەكــــه • لناڤ محلميـيـــــا پەيـــدا دبي •
(مالادۆكۆ) زڤر دەركەتيه •ئێ كۆ دۆك درستن •كوردەژن

دریسن بەلام ایـلا (محلمي‌یا) میر دریسن ـبدۆکێ دریسن•

(دۆل) ـ یا دەول •زریەتە ـبەرمایێ جانداره •دەرباس بویـــه • دغەیدێدە دبیژن :ـفلان‌کەس

دۆلا ـ دەولا کەرایە •

(دۆھ) ـ دۆ ـ دوینێ ـدھۆ ـدوھي •بداخوازەکێ نە •ع (الامس)

(دۆزەھ) ـ دۆژ ـدۆزەخ ـجهنەم• دەرباس بویه • ع (جهنم)•

## ( د ـ آ )

(دلشا) ـ یان ژ دلشـــاد هاتیـــه ـ دل‌خوەشي ـ بشادی • یان ژ دلشاه هاتیه • دلێ شاه ( قلب الملک ) • بەلام یا پیشي بیتر نیزیکی راستي‌یە • لجـــــەم کورمانجا ناڤێ ژنایه • بـەلام لەلای سۆرا ناوی میردە •
ع (فرح القلب‌او قلب‌الملک)•

(دها) ـ جارەکە دی • بارام ! تە ایجا ولۆ کر • دها جارەکـــه دی مەکـــه ـ بەلێ دهـــا ناکم •
جارەکەدی ناکم • ع (مـــرة اخری ) •

(دنا) ـ ائلەکە ایزیدیە • دناڤ ائلا (ملا) دەیە •ل هێلا ویران شار و ســــەرێ کانی‌یێ نـــه •
ع (عشیرة کوردیة ایزیدیـــة باطراف رأس العین ) •

(دنیا) ـ جهانـــه • ژعربي هاتیه • بویه تەڤایی • کـــورد وترک وفارس هەمي ولۆ دبێـــژن • مەحوی دەلێ :ـ
ئەم دنیا تیاترۆیە تیا مەرۆ !

(دەبدەبە) ـ ئـەو مرۆڤ و تـەبایێ گەلەک گرس ومـەزنە •
ع (المخلوق العجیب) •

(دجله ) ـ دوجلە یە • چەمەکـــی ناڤدار ومەزنە • سەرکانا وی ژ زۆرێ پاژارێ (آمـــەد ـ دیاربەکر) کوردستانا بن‌دەستێ ترکیا دەردکەڤي •ع (معروف)

(درندە) ـخوین‌خوار و مرۆڤ‌کوژه تەبایێ درندە • ع ( الحیـــوان المفترس ) •

(درنه) ـ كونه‌كه بچوك وهوره • كورمانج دارك و پاچكا دخن درنا • درنه دكون و مه‌شك و عيار شيرا ڤه‌دبن • • ع (النقبة الصغيرة) •

(دردى) ـ يان دوردى • گـرك ـ زه‌هرى • سه‌يدايێ خانـــى دبێژى :ـ

صافي شــــه‌مراند ڤه‌خـوارى
دردى

مانه‌نـــــدى درێ زمانـــێ
كوردى •••

ع (المسموم ـ غير الصافى) •

(دزي) ـ زێده‌رێ دزه ـ ئێ كـــۆ مالێ خه‌لكێ ددزن ـ دبـــن • (دز) بداخوازا كه‌لـــــه‌هه ـ قلعة • هاتيه • ع (السرقة) •

(دزه‌يي) ـ ائيله‌كه كورده • ل هێلا هه‌ولێر ـ اربيل دكه‌ڤى •

ع (عشيرة كوردية بأطــراف مدينة اربيل) •

(درزى) ـ يان دوورزى • ائيله‌كـــه مه‌زنه ل‌چيايێ دوورزى‌داغ و لبنان و فه‌له‌سطين رودنــن • دبێژن :ـ كوردن • ( مـــالا جان پولاد ـ جـــان بلاط) مه‌زنێ وانه • ئه‌ڤ مالبــــات دبــــاژارێ ( كلســـ ) ده ـ دكوردستانا بن ده‌ستێ تركيــا ده ده‌ره‌به‌گي‌يه‌كـــه مـــه‌زن ل‌دار خستنه • شه‌ره‌ف خـان دتاريخا خـوه‌ده (شه‌ره‌فنامه) دبێژى :ـ (اماره‌تى درزينـــي) به‌لام پرجهێ داخ وآخينه كـــۆ ڤه‌ناوه‌زێرى ونابێژى درزى ـ درزيني بكـــوده چونـــه •
ع (معروف) •

(دل‌ته‌نگى) ـدل نه‌خوه‌شي‌يه :ـايرۆ بارام دل‌ته‌نگه ـ دل‌نه‌خوشه •
ع (غير مفرح) •

(دنيانه‌دى) ـ ئێ كۆ خه‌لكـــــــێ ناقه‌دێني • ع (البخيل) •

•••

(دلێ) ـ دهێكێ ده دلێ ـ خاڤه ـ هێ چێ نه‌بويه •

(دلۆپ) ـ نقنی آفێ نه • كۆ یەكـا یەكا تێنه خوار • ژ خانـــي و شكەفتا دلۆپ تێنه خـوار • دلۆپێ بارانێ ـ پەشـــــكێ بارانێ • ع (الوكف) •

(دست) ـ بەرۆشا مەزنه • عـــرب ژی ولۆ دبێژن • لێ نزانـم كێ ژكێ ستاندیــه • بەلام بینا كوردی بێتر ژێ تێ •
ع (القدرية الكبيرة) •

(درست) ـ یان دروست • راسته ـ جائزه • فەخوارنا بیره هــن درست ددێرن • لێ دورســت لجەم من بێترراسته • ژرستن هاتیه • رستەك ئـەوه كـــۆ جارەك برێسي ، دورســـت ئەوەكۆ دوجـار برێســي • بداخوازا خورت ـ قــەوی دكۆكا خوه ده هاتیه • پاشـێ بویه بداخوازا راست وجائز •
ع (صحيح وجائز) •

(درەخت) ـ فارسي‌يه • بـــــەلام دشیوەیێ سۆری‌ده گەلـەك هاتیه • دارو درەخـــت ـ دار ودەفي • ع ( الاشــــــجار والاحطاب) •

(دلامەت) ـ روتبه ـ وەزیفـــة ـ عەزەمەت • پایەداری ـبەرزی وبلندی‌یه • یا (دەلامـەت) • بارام ! كورم خوەدێ تـــه نەگهێني فێ دلامەتێ •
ع (الرتب والوظیفة والعظمة)•

(دز) ـ ئەو مرۆفێ كۆ دزی‌یـــێ دكی • كرۆكه • ع (السارق والحرامی) •

(دلخواز) ـ مرۆفێ كۆ دلــێ وی ژ مرۆف ره دخوازی ـ خێـرا مرۆف دخوازي • ع (الصدیق الحمیم الذی یرید لك الخیر)•

(در) ـ یـــا دور • جەوهــەر ـ گەوهەرەكي نافدار و برومەتە، گرانبهایه • (دردارا) ـشجرة الدر • ایمپەراطۆرا كـــوردە كۆ داویا ایمپەراطۆریا كــورد دروژ هلات ده بكـــوشتنا وێ هاتیه • ع (جوهرة مشهورة)•

(دردر) ـ بچوكێ وی دردركـه • سترێن هور وب پەزكـــن • زهەف رە دبێژن :ـ تو بويـه دردر ـ دردرك خوە بمڤـه گرتيــــه • ع( الاشــــواك الصغيرة) •

(دزدار) ـ فەرمانداریێ دزە يـــە • حاكمێقەلعە يە • ع (صاحب القلعة وحاكمها) •

(دژوار) ـ دبـي ژ دزوار ـ دژ ـ وار • ئەوێ كـۆ وارێ وی دژ ـ دزە يە • بێ گۆمانــە كۆ ئەوێ وارێ وی دزەبـي خورتوتالانكەر وخوينڕێژه• پاشێ پێكڤە بويــــه (دژوار) بداخوازا زالم ـ خـــورت ـ بێچارەيە • ع (شديد المراس ـ ذو بأس ـ القوى) •

(درێــژ) ـ دراز ـ درێـــــژ • ع (الطويل) •

(دش) ـ ژبۆ ژنێ دش خوشـــكا مێره • ژبۆ مێر خوشـــكا ژنێ يە :ـ دشا رەوشێ خوشـــكا مێرێ وێ يە ـ دشا فـــەرهاد خوشكا ژنا وی يە • ع (اخت الزوج والزوجة) •

(دلخوەش) ـ روگەش مرۆڤـــێ كۆ دلێ وی بدنيايێ خوەشه • ع (مفرح القلب) •

(دلگەش) ـ وەكە دلخوەشه • ع (مثل دلخوەش)•

(دراڤ) ـ درهاڤ ـ دەرهـــەڤ ـ دەرهەمە • پارەيێ بهەڤـــە يە • دايرۆدە (٥٠) پێنجیفلسه ـ پينجیقروشه • بەلام فرەتر بويه (دراڤ) بداخوازا پــارە هاتيە • زێرودراڤ • وەكـــە پەرێ زيفي تێ خوياكرن • ع (النقود الفضية) •

(دروڤ) ـ نيشانا پەزە • هەريەك دروڤەكێ ل پەزێ خــــوە دكي • برێ دروڤێ داغە • ع (العلامة والوشم) •

(دلق) ـ مرێسە ـ پەرگال ورەوش وآوایێ زينگاريا مرۆڤـــــه • زێدەتر بىال نەباشيڤەدچي •

تو ل‌دلقیٚ بارام بنه‌ره ! یانی نه‌باشه ـ ع (الحال والمراس) •

(دنگ) ـ ده‌نگی‌یه • تفنگیٚ گـوٚ دنگ وته‌قیا • ع ( صوت البنادق وامثالها) •

(دهوٚك) ـ قایمقامي‌یه‌كه كـورده ل راژوٚریٚ (موصل) دكه‌فیٚ • ع (معروف) •

(دگه‌ل) ـ له‌گه‌ل • بداخوازا ڤیره ـ پیٚره • هاتیـه • ع ( بمعنی مـع) •

(دلیٚم) ـ پر نیٚزیكه كوٚ ژ (ده‌یله‌م) هاتبي • ع ( عشیرة عربیـة في العراق) •

(دمدم) ـ كه‌لا دمدم • ناڤـداره چیروٚكـا خانـیٚ دمـدم به‌ه‌لبه‌سته هاتیه نفیساندن دبیٚژنه ڤي‌خانیٚ چه‌نگ‌زیٚرین • ع (قلعة مشهورة لها حكاية) •

(دران) ـ ددان • ده‌رباس بویه • ع (السن والضرس) •

(دررین) ـ زیٚده‌ریٚ تیٚنه پـه‌ره ـ دراندن تیٚ‌په‌ره • كوچـك لنگیٚ بارام درری یانی گه‌زكر ـ كراسیٚ ره‌وشیٚ دررِیا یه ـ چرریا یه • ع (الشق) •

(درون) ـ هیفازتـه ـ چنینـه • ره‌وشیٚ كراسیٚ خـوه دروت ـ هیڤازت ـ بارام گه‌نمیٚ خوه دروت ـ چنی ـ پاله‌ی‌كر • ع (الخیاطة والحصاد) •

## ( دی ـ آ )

(دیبا) ـ یا دیباج ژ قه‌دیفه گـران تره • قماشه‌كه • پادشـا و مال‌مه‌زن ل خوه دكـن • جزیـری دبیٚـژی :ـ (كه‌سك‌ئه‌تله‌سا دیباقه‌با) • ع (الدیباج) •

(دیسا) ـ جاره‌كه‌دی ـ دهـا :ـ (دیسا بهار ڤا هات) • ع (مرة اخری) •

(دیباجه) ـ پیٚشیا نفشت وكتیبا یه • حاجی‌قادر دبیٚژی :ـ (دیباجه‌یا مه‌م وزین • دبي ژ (دیبـا) ـ دیباج • هاتبي • وادیاره كـوٚ

دناڤ بەرا نقشت وبەرنامێ دە قماشەك ژديباج داتانـــين • پاشێ بويـــە ناڤێ (بەرنامێ) ـ دبي (جە) چە • ژبۆ بچوكـــي بي • (المقدمة) •

(دينۆ) ـ ناڤێ سترانەكي يە • ژدين ـ شێت • هاتيە •

(دىدىتێ) ـ دەزمانێ مێش وتەبايێ هورە • ژئەوروپى هاتيە •

(دي) ـ دبێژن :ـ يەكـــــە دى ـ جارەكە دى ـ سێ جارێ دى• ع (اخرى)•

(دىدي) ـ وري ـ ژ كوچـــك رە تێ گۆتـــــن ـ بەردانــــە ـ تدكرنە • ع (قدى او طــــرد الكلاب) •

(ديلي) ـ يەخسيرى ـ ئێسيرىيە • بندەستيیا دژمن ـبەردەستيیا دژمن ـ گرتە • :ـ بەنــــد و ديلم بێ بەديلم ••
ع ( الاسر ) •

•••

(دينيتي) ـ دينبون ـ دينكرن ••
ع (الجنون) •

(ديز) ـ پيانەكە مەزنـــــە ژ آخـــێ چێ دكـــــرن خوارن تـێدە دخوارن • ديزك بچوكێ وێ يە • ژقادولكێ مەزنتـــرە • جارنا تێ دە هەڤير دكرن •
ع (صحن كبير من الفخار) •

(ديوار) ـ دبي ژ (جيوار) هاتبي • خەلكێ ايـــلا ئۆمـــــەريا و هن كـــــوردێ ماي (د ـ ج) بهەڤ دگۆرن • جـــيوار ـ جيگەهێ وار • ديا من ـ جيـا من • ع (الحائط) •

(ديدار) ـ جوانى و خوەشكاهي يە :ـ ژ ديدارا پەرى رەنگێ•••
ع (الجمال والحسن) •

(دينار) ـ بيست دەرهەمە • خانـــي دبێژى :ـ

دين چو ونەكەت بدەست مـــە دينار

پاشێ ژ نەچارى بونە صەفارە•

(دیق) ـ نەرینا بدزی یە • مرۆڤەک دپاجیێرە ـ دکونەکێرە لـتـە تەماشـــا بکی ناسێ وێ دیـق کرنە • بداخوازا نەریـــن وتەماشاکرنا بدزییە •

ع .(النظر بطرف خفی) •

(دیق) ـ جارنـــا ژن ززارۆکـــا بچوکەرە دبێژی :ـ دیقدیق• داوەکو بکەنی • بەلام دروستە ژتیقتیق هاتبي • ژبەرکــــۆ (تیق) کەنە • دبي کۆ ژنـک دخوازي زارۆک لێ بنەری ـ لێ تەماشا بکی •

(دیک) ـ کەلەشێرە • ژعربــــي هاتیە • بەلام دبي عربـــــا زکوردی ستاندبی • ژبەرکۆ هەر تەنی ئەڤ گۆتن دعربـي دە هەیە • لێ لجەم کـــوردا دیکۆ بویە ناڤێ مێرا • دیکێ بویە ناڤێ گوندەکی • دیکلآغا ناڤێ چیرۆکەکێ یە • دایـک ماکە • ع (معروف) •

(دیل) ـ دیلــــي دەرباس بویـــە ژێدەرە • بـــــەلام ( دیل ) بداخوازا گرتی هاتیە • دیلـێ دەستێ نەیارم • ع (الاسیر) •

(دین) ـ شــێتە • دینـــــداری ـ ئۆلپەرستی یە :ـ

ئەڤ نە دینە دین مەبە
دین سەرخوەبونا مللەتە •••

دینیتي ـ دینبون ـ دین کرنـ سێ ژێدەرن • بنگـــەهی ـ تێنەپەر ـ تێپەرە • دینـــێ ژبۆ ژنارە تێ گۆتن • دینـۆ ژبۆ مێرا • ع (المجنون) •

(دینکرن) ـ ژێدەرێ تێپـــەرە • ئەوەکۆ مرۆڤ یەکی دیـــن بکی • من بارام دینکـــر • دینکرنا بارام هەسانی یە •

(دینبون) ـ ژێدەرێ تێنەپـەرە • بارام دبنبو • بخوە دیـــن بویە •

(دیتن) ـ من بارام دي ـ دیتنا بارام دژوارە • ع (الرؤیة) •

•••

(ديو) ـ بسۆرانـــی رەخ ـ آلي •
بارام لەم ديوە يە •
ع (الجانب والطرف) •

## ( دێ ـ )

(دێ) ـ بداخوازا دايكە :ـ بـــارام
بێ دێ وبافە • بـەلام (دێ)
دشيوەيێ سۆرانی دە بداخوازا
گوندە • ع (الام) •

(دێلي) ـ شاخا مێوێ يە • يــــان
مێوا (درێژە) •

(دێر) ـ كەنيسە ـ كەنشتە يـــە •
دێرعمر گوندەكـــە لـناڤ
هەڤيركايە • گۆيا چيرۆكـــا
(بۆرێقەر) لڤر چێبويـــە ـ
عمر بۆرێ قەر زڤي گونـدی
رەڤانديە • بـــەلام نەراستە
بەلكی خەيالەكە جوانە •
ع (الكنيسة) •

(دێرك) ـ ناڤێ دو بازارێ كوردە ـ
يەك لزێرێ جزير ـ گزيرا
بۆتايە • ويەك ل رۆژآڤايــێ
ماردين دكەڤي • ئەڤا پاشـــی
گەلەك خوەشە ، دار وبـەر
وآڤا وێ نايـــێ پەسندان •
شعركە من لسەر هاتيـــە
چاپكرن • ع ( اسم لمدينتـين
كورديتين) •

(دێلَك) ـ بچوكێ دێلە • دێـــل
كوچك وگورا مێ يە • كورد
دبێژن :ـ
دێلك بايـــە كۆيـــەك
زبەغـــدايە • پاشێ بويە ناڤێ
ژنا خەراب ـ ژنا گەوەندە ـ
ژنا تۆلاز ـ

(دێل) ـ دەرباس بويە • دێلـــي •
مێوا ترێيە كۆ درێژ دبی •
ع (الفاجرة) •

(دێم) ـ رودێم • دێمـــێ گـولی ـ
سەرچاڤە ـ سەر وچـــاوە ـ
كولمەتە • دێمێ گولێ ـ يانی
دێمێ سۆر وەك گولا •
ع (خال) •

(دێم) ـ دەمبەر آڤي دە هاتيـــە •
گەنمێ مە دێمە ـ نەآڤي‌يە •
دێم ـبەژە • ئەڤ ستێرا ئەم
لسەر دگەرن هن آڤي يــــە

وهـــن دێمـــه • دێمـــانی دانەبالقەیە • دێمی ژی تـــێ گۆتن • ع (العزی ـ غـــیر السقی) •

(دێرسم) ـ جیاکی کوردستانێیە • چیایێ دێرسم ناڤداره • خەلکێ دێرسم کوردێ عەلەوی‌نه ـ قزلباشن • بسازێ تـەمبورێ ناڤـــدارن • ع (جبـــل في کوردستان اشتهر بوعورتـه • أهله اکراد علویون ) •

(دێو) ـ یا (دەو) • ئەو مرۆڤێ کۆ خوەسەر دشکەفت وچیـــا ده دژێ ـ مرۆڤێ دەستپێکێ یه • مرۆڤێ کۆ هێ ژ‌قوناغا هۆڤیتی دەرنەچویـــه • دچـــیرۆک وئەفسانەیێ کوردارە خویادکی کۆ (دێو) نه (جنیه) • بەلکـــی مرۆڤه بەلام هۆڤه • ژنێ وان پیرهەڤۆکن • پیرهـــەڤۆک ـ دێوا مێیه • دچاڤێ کۆچـــەر وگوندیا ده ئەوێ دشکەفتا ده ـ دناڤ مێشـــا ده ـ دناڤ دار ودەڤیا ده دێوه • ع ( الغـــول او العفـــریت ؟ الانســـان الوحشي)•

## ( زا ـ آ )

(زازا) ـ یان (زاز) ناڤێ چەنـــد ایلێ کوردە کۆ بەرێ ناڤـــێ وان(دومل ـ دونبل)ەوەدداباشا (دومل ـ دونبل) ده • دەرباس بویـــه • ژبەرکـــۆ تیا (ز) دشیوەیێ دوملا ده گـــەلەک دهاتە گۆتن ، ناڤێ وان بویـــه (زاز ـ زازا) • بـــــەرێ ل‌راژۆرێ کوردستانا ایران وترکیا بـــون • لێ ایرۆ ل رۆژآفایێ بارازێ ( آمـــەد ـ دیاربەکر) دکەڤن • ناڤـــێ پای‌تەختا وان پالۆ ـ پالـــەو ـ پەهلەوه • ژلەورا درستە کۆ بێ گۆتن :ـ دکۆکا خـــوەده پالەوی ـ پەهلەوی نه •

ع (عشائر کوردیة اشتهـــرت بهذا الاسم لوجود حرف (ز) في لهجتهم وهم في الاصـــل

الدنابلة ـ البهلوية) •

(زاڤا) ـ زاوا يه • زاڤاتي وبوكاني بێ‌سینۆرن • جارنا درێژدبن تاب مرنا بـــوك وزاڤێ • يه‌ك ژره‌وشێ دپرسي :ـ كي مريه ؟ دپرسڤا وی ده دبێژی :ـ زاڤايێ فه‌رهاده ـ بوكـــا دلشايـــه • وه‌كـه خه‌ســو وخه‌زوره • ع (العريس) •

(زانا) ـ مرۆڤێ بيره‌وه‌ر وبيربـــر وژيره‌كه • پێزان ـ بداخوازا عالمه • زانين زێده‌رێ وی‌يه • ع (العالم) •

•••

(زاده) ـ زێده‌يه :ـ بدرخان پاشـــا زاده ـ ئێ كۆ ژ بدرخـــــان پاشا زێده بونه • يا ژ بدرخان پاشـــا زانـــه • ژ خانه‌داناره تێ‌گۆتن• ع (الاولاد والاحفاد ـ خلف) •

(زارى) ـ هاواره ـ آزارى‌يـــه • زارزاره •

(زارۆ) ـ زارۆك بچوكێ وی‌يه • ژبه‌ركۆ گه‌له‌ك زارزار دكن ناڤێ وان بويـــه :ـ زارۆ ـ زارۆكـــك • زێده‌بـــون ـ زارزارۆكه ـمندال وبچوكن• ع (الاطفال) •

(زاخۆ) ـ باژاره‌كــــى كـــــورده ل‌راژۆرێ كوردستانا عراقه • (زاخوران) گونده‌كه • ل‌ناڤ هه‌ڤيركايه •

•••

(زاب) ـ ناڤێ دو چه‌مێ ناڤـــدارن دكوردستانا عراقێ ده • زابێ به‌هدينا ناڤ‌به‌را كورمانـــج وسۆرا دبرى • ع (معروف)•

(زارده‌شت) ـ (زار ـ زمانـــه) • (ده‌شت ـ راسته) • زارده‌شت ـ زمان‌راست ـ راســتگۆيه • ناڤێ پـه‌يغام‌به‌ره‌كي يه •خه‌لكێ كوردستانـــێ وه‌كه ايــــران وهندستان پێ باوه‌ربونه • ع ( صادق القول ـ النبـــي زارده‌شت) •

(زار) ـ زمانه ـ يا شيوه يه •رۆژناما

زارێ كورمانجى دبنده‌ستێ حسين‌حزنى مكريانى ده بو . كورمانج دبێژن :ـ بارام بێ زار وزمانه . جا نزانم نه زار وزمان بداخوازه‌كێ نه . يان ، زار بداخوازا شيوه يه . به‌لام بداخوازا شيوه بێتر نێزيك ل‌راستى دكي . لێ ئه‌م كارن بێژن :ـ زمان ـ ليسان . زارـ لغة . زاراڤ . بداخـوازا شيوه ـ يان (مصطلحات) هاتيه زاراڤێ جوكا ـ زاراڤێ ته‌با . نه‌زمانه ، ونه لغه‌ته .

(زاز) ـ ده‌رباس بويه (زازا) ـ دومل ـ دونبل .

(زاراڤ) ـ ژ ته‌با وچقيكا ره تێ‌گۆتن ـ يان ئه‌و زمانێ كو مرۆڤ ژێ تشته‌كي نزانى . گه‌له‌ك جارا تێ‌گۆتن :ـ ئه‌ز بڤي زاراڤي نزانم . واديارە زار وزمانێ كو مرۆڤ نزاني ناڤێ وى زاراڤه . ع (مصطلحات الحيوان واللغة التى لا يعرفها المخاطب) .

(زارۆك) ـ بچوكێ زارۆ يه . ده‌رباس بويه . ئێ كو زارزارێ دكن ـ مندال ـ بچوك . ع (تصغير الاطفال).

(زارزارۆك) ـ ئێ كو زێده زارزارێ دكى . ع ( كثير التشكي والتأوه) .

(زال) ـ ناڤێ مرۆڤا يه . لێ باڤێ روستمێ ناڤدار كۆ شه‌رف‌خان دبێژى :ـ كورده ، بڤي ناڤي ده‌نگ دايه . كورمانج دبێژن :ـ زالێ چه‌نگ‌زێرين . وهارنگه (زال) بداخوازا خوار ـ راسه‌ر هاتيه . ع (...)

(زان) ـ ناڤێ داره‌كي يه ـ خورت وبتينه . ع ( شجرة الزان) .

(زانين) ـ ژێده‌رێ تێنه‌په‌ره :ـ بارام زانى ، بارام نزانى ـ زانين ع (العلم) .

(زارين) ـ زارى ـ آزارى ژى هاتيه . ژێده‌رێ زارزاره . ع (التشكى عن الم) .

(زاین) ـ یــا ( زان ) ژێـــدەرێ تێنەپەرە • رەوشێ زایــە بزنا مە زایــە ـ زارۆبویــە ـ زارۆك ژێرە بویە •
ع (الولادة) •

## ( زی ـ آ )

(زیلا) ـ ایلەکە مەزنــە کــوردە • (مل وزیل) هن دبێــژن :ـ کۆکا ملەتێ کوردن • لــێ نەراستە • کورد ژ مل وزیل کەڤارەترە • (زیل ومل) دو ایلێ کوردی نە •نەکوردهەمو ژمل وزیلن • ع (عشـــيرة كوردية في شمال كوردستان)•

(زیبا) ـ دبي ژ(دیبا) هاتبي •

(زیلۆ) ـ یان زیرۆ • کورمەکــە خوە بـچە بگری زو بەرنادی ژلەورا کورمانج ژهــەڤــرە دبێژن :ـ تو بویــە زیلۆ ـ زیرۆ خوە ژمن بــەرنادی • خوین مژە • گەلەك جــارا دەکتۆرێ کەڤارە دمژاندنــا خوینێ دە ددانە خەبتاندن •
ع (العلق) •

(زي) ـ بەر پێسیرا ژنێ یە ـ جهێ بورزي یە • دەرباس بویـــە ع (فتحة التمیص) •

(زي) ـ زەهە • پاشیا سەوال ویەزا مێیە ـ جهێ زانێ یــــــە •
ع (محل الولادةمن الحيوانات)

(زيزي) کولیەکە ـ کێزکەکــە • دکی زيزي ـ زیــوزیو ـ زیرزیر ژلـــەورا ناڤێ وێ بویە:ـ زیزی • هاڤینا لناڤ زەڤیا گەلەك خویادکی چاوا کۆ بهارا ل ناڤ دەخلایـــە • لچولێ یە • (حشـرة اشتهرت بصوتها ) •

(زرێدی) ـ دهندرو دە ژ خانی زێدە دکن وهورومورێ خوە لسەر داتینن •

(زیپ) ـ بچــوکــێ وێ زیپك ـ تەرەز ـ بەرخورك • ســێ رۆژ ژ شــباتێ ناڤــێ وان زیپن • زیپۆ بویە ناڤێ مێرا • زیپراندن ـ روتکرنا کەرایە• پەزە •••ع (الحالول ـ البرد)•

(زيت) ـ يا زيتزيت • دەنگێ بۆرى وزرنه وناي وهن سازێ دىيه •ع (صوت الابواق) •

(زيچ) ـ چێبونا ســتێرايه • ( علم الزيج) دكەڤاره ده ( علمێ ) ستێرابو • چاوا ســتێر بچێ دبن • زاروزيچ • ئەوێ كۆ ژمرۆڤ زێده دبن ـ ڤەدكەڤن •ع (التولد والاولاد) •

(زيرچ) ـ ئەو پيسي وگەمارا كــۆ ژپاشيا ـ ژ ناڤا ـ ژ زكێ چڤيكا دەردكەڤي ـ زەلقه • زيرچێ چوكا ـ زيرچێ تەيرا ـ ئێ پەز پشكول ـ مشكوله • ئێ سەوالێ ستور سەركوله ـ ئێ سەوالا يەك سم سەركوله ـ ئێ سەوالادوسم ريخه •••• ع (زبل الطيور ، او ما يخرج من الطيور ) •

(زيخ) ـ زوغر وقــوم وبغــورێ بەرچەما نه ـ خيزه •ع(الرمل)
(زيبار) ـيا زێبار • ناڤێ پەرچاك ژ آخا كوردســتانا راژۆرێ موصله • ژخەلكێ وێره تێ گۆتن :ـ زيبارى ـ زيباريا • سوبارێ كەڤار، نه ع (عشيرة كوردية شمال الموصل)

(زيتۆر) ـ زيتۆل • بداخوازا كنجێ ـ بەرگێ ژهەڤده كــەتى ـ زيڤار زيڤارى ـ پژلى يــــه دبێژن :ـ كنجێ بارام زيتۆري بونه ـ ژهەڤ ده كــەتــه ـ زيڤارى بونـــه • ع ( اللبس المشــــقق المقطع الهزيـل ـ المهترئة) •

(زير) ـ يا زيرزير • دەنگێ چوك وچێيكا يه •دبێژن:ـ زيرزيرا چوكايه • ع (تغريد العصافير)•

(زيڤكەر) ـ زێركـەر وزيڤكـــەر • هەردو بڤي ناڤي دەنگ دانه • زێركەر ژى ناڤێ وى زيڤكەره •واديارە ژبەركۆ زيڤ ژ زێر پێتر هـــەبو ـ پێتر دچــەك ورهەل وخەملو خێزا ژنا ده دهاته چێكرن،ژلەورا ناڤێ وى ناڤێ زێر دناڤ خوه ده ونــدا كريه • ع (الصائغ) •

(زیلانزەر) ـ كەرەنگ ـ كەنگەرێ كۆ نو دەردكەڤی ـنو شین دبي •گەلەك خوەشە • بخـافي تێخوارن • ع (الجديد مـن الكعوب ) •

(زیوەر) ـ ناڤێ شاعرەكی كوردە• دیوانا وی هەیە • ع ( شاعر كوردی ) •

(زیز) ـ زیز بویە • كەتیە گۆمانا ـ خوە وندا كریە •بارام دگۆلێ دە زیـز بـو ـ ونـدا بو ـ ژگۆمان كەت•دەنگێ بارام زیز بو ـ لهەڤ گەریا •زیزۆك ـ لیزەكە زارۆكایە • بەررایە • زیزی ـدەبارس بویە كێزەكە كـــەلـەك زيزيدكی • زیزكاندن لهەڤزیڤراندنە ـم زیزكاند ـم كـر كۆ ل دۆر خوە بگەری • ع ( لها عـدة معانی :ـ الدوران والضيـاع والنسيان في الخيال والاوهام)•

(زیڤ) ـ زیوە • ع (الفضة) •

(زیق) ـ دەنگێ چراندن وكشاندنـا خەنجەر ودەنگێ كۆ ژگـرتن وڤەكرنا دەری تێ • دەنگێ ژ بهەڤ خوەراندن ـ احتكاك) تێ • ع (صوت الاحتكاك) •

(زیرەك) ـ ژیرەكـــە • مرۆڤێ (زەكی)یە • مرۆڤێ كۆ تشت ژبیراوی زو ناچن‌و زو تشـت تێنە بیراوی • ع ( الانســان الذكی ) •

(زیل) ـ ئەو گەیایێ كۆ نو شـین دبي :ـ زیلا گەنم ـ زیـــلا كەرەنگ ـ گەیاء بچوكێ وی زیلك • (زیل) وەل •دەرباس بونە ناڤێ دو ائیلێ كوردن •
ع(عندما تنبت الحشائش‌وهي في اول عمرها ) •

(زیتۆل) ـزیتۆرە • دەرباس بویە •

(زین)ـ ناڤێ ژنا یە • لێ (زین) كۆ گەرناسا چیرۆكا (مەم وزین)ە بڤی ناڤي دەنگ دایە •چیرۆكا (مەم‌وزین) سەیدایێ خانـــی ختیە كراســەكی هۆزانی ووەلاتپاریزی • ژ (زین) هاتیە

(مەم) ژ (ملەت) دەركەتيە • سەيدا بمە دايە زانين كو ملەتێ كورد زين ـ ژينەكە سەربخوە دخوازى لێ :ـ

بێ جەنگ وجدال وبێ تەهەور
قط في شغلى مەكن تصور •••

(زين) ـ لسەر پشتا هەسپ ومەهين وقانتر وكەرێ باش دكن •ژبۆ ل وان سواربن • زينێ هەسپێ بارام باشە • ع (السرج) •

(زيغان)ـ(زيغان ـ مريشكێ بچوكن.يا بچوكێ مريشكا نە •ع (صغار الدجاج ) •

(زيلان) ـ دبي ژ ( زيل) هاتبي •

چيرانەكا دەرى يە • دبێژن :ـ
ايرۆ دەرى يێ مە ژ زيلان كەتيە ـ ژ زيلان خستنە •ياني چيرانەكا وى ژ جى دەرخستنە •ع (الخشب الاساسى للباب القديم الذى كان كلا طرفيه في الحائط ) •

(زيوان) ـ دناڤ گەنم دە شين دبي •

بەسنا خليل دبێژى :ـ

باڤێم خێرێ بكى بچاڤێ خوە نەبێني •
گەنمێ سۆر بچێني (زيوانا) رەش هلێني •••

گەنمێ بزيوان نانێ وى رەش وتالە • بهايێ وى گەلەك كيمە • ع (معروف) •

(زيڤـ) ـ زيوە • زيڤۆ • بويە ناڤێ مرۆڤا ـزيڤكەر ـئێ كۆ زيڤ وزێر دكى خەملو وخێز • چيرۆكا شێخێزيڤكەرا يەك ژچيرۆكێ كوردى يە •
ع (الفضة) •

## ( ز ـ آ )

(زرزارا) ـ يان زروارا • ائێلەكە كوردە • ناڤدارە • دناڤ لەشكرێ فەرمانداريا أيوبي يا دە بڤى ناڤي لەشكەرەك هەبو • دايرۆدە لچيايێ عەلەويا ـ لهێلا (لازقي) نێزيكي دەريا سپي بناڤێ ـ زرزارا ائێلەكە

کورد پەیدا دبي • لێ مخابن ئەو دگەل دو ایلێ کوردێ دی زمانێ باڤ وکالێ خـــوە ژبیر کرنه • ع (عشیرة كوردية في جبل العلويين) •

(زررکا) ـ ایلەکەکوردە مـــەزن وناڤدارە ل راژۆرێ بـاژارێ (آمەد ـ دیاربەکر) رودنن.مالا سیف‌الدین پاشا مەزنێ وان‌بون •پایەختا وان حەزرۆ یە •
ع (عشيرة كوردية فى شـمال ديار بكـــر ) •

(زوا) ـ دهەمبەر شل دە هاتیـــە • کراسێ رەوشێ شل بو بەلام زوا بویە • کورمانج دبێژن:ـ
شل ، زوا ژتە دخـــوازم •
ع (ناشف ـ يابس) •

(زیا) ـ یان زها • مارێ مەزنـــە ـ ئەژدەها ـ ئەژدەرها یـە •
ع (ثعبان) •

(زرتۆلە) ـ کوچکێ بچوکە •بەلام نەتۆلەیە •

(زبارە) ـ ئەوە کۆ خەلکێ گونـــد ب‌هەڤرە هـــەرن کارەکی :ـ ایرۆ زبارە ژمالا آغێ رە یە•
ع (العمل الجماعى ) •

(زرنە) ـ سازەکە ناڤدارە •

(زلە) ـ یان (سلە) شەقام ـ لێدانـــە بدەستە ـ بلەپە •

(زردێ) ـ زنباڤە • چاوا کۆ زرباڤ ئەوە کۆ دیا مرۆڤ ماردکی ـ دێماری یە • ع ( زوجـــة الوالد ) •

(زرزۆپ) ـ ئـــەوێ کۆ دارێ وی خورت وچاڤ سۆریا ل خەلکێ دکی ـ جرا وی نەخوەشـــە دبەزی هــــەر کەســـي •
ع (قبضايى) •

(زرت) ـ گۆتنێ بدەرەون ، کۆ پێ پەسنێ خوە دکی • وا دیـارە کۆ ژدەنگێ (زرت) دەنگـــێ ترێ دەرکە تیە • هەروەکـــو ئەوێ بدەرەو پەسنێ خوە دکی وەکو بێ زرت وترابکـــی • دەرەو وەکە ترا دانینە •
ع(الاوصاف الكاذبة التى يمدح

بها نفسه ) .

(زفت) - ناڤداره عرب ژی دبێــژن زفت . لسوريه دگۆتن :ــرێ نەبي هەرتشت زفته .

(زرچ) - زرچ زرچ چنينا زرچکــه .زرچک گــەیایێ هـــــور و بتۆڤــــه . دەما مرۆڤ دچني دەنگــێ زرچ زرچ ژێ تێ . بخوه مەزنێ زرچکه .بدەنگێ خوه هاتيه ناڤدان .ع (الاعشاب الكثيفة الخفيفة) .

(زريچ) - بچوکێ وی زريچکــه . سيمه - ســورمەيه . زەره - زەرێ بچوکه . زەرگەشه . ع (الخيوط المزرگشة) .

(زرخ) - يان زرهـ . کراســـەکی هاسنی‌يه . دشەراده ل خــوه دکن . ع (الدرع) .

(زمەررەد) - نفشەک ژگەوهەره . دخن ڤاشا گوستيلا . ع ( نوع من الجواهر ) .

(زگورد) - زگوردی ـژ گوردکەتی يه .تەڤنا زگورد کەتی بێهاڤله .بلەنگاز ـبێمال وکەسه .

(زر) - يا زرزر . دەنگێ کەره - يا چەدەنگێ کۆ زرزر - زريــن ژێبێ . زيرزير - زوورزور ژڤر دەر کەتە . ع ( کلمــة صوتية ) وصوت الحمير .

(زڤر) - دهەمبەر نەرم دە هاتيــه . زڤره . ياني هشـــک وبتۆڤ وگنجره.دردرۆکه. مندەستێ خوه دائێ زڤر بو (خشن)بو . ع (الخشونة) .

(زلندار) - دتەحلی دە ناڤ دایه :ـ تـــــەحله وەکـــه زلنداره . پەتريشۆکه . لدۆرا (عامودە) دبێژن :ـ بەختێ م رەشـــــــه پەتريشۆک بم دە رژيايه ع (العلقم) .

(زنگار) - زنجـــار . قەرێــژه . خەنجەرا من زنگار گرتيه - گەلەک دکالانێ خوەدە مايــه - قەرێژ گرتيه . ع (الصدأ) .

(زنار) - يا نزار . آليکی چيايــه .

دهەمبەر بەرۆژ دە هاتیە :ـ
رەزێ مە ل زنارە ـ ل زنێرە .
ل پشتا چیێ ـ ل (آلیێ)
ـ باکورە . هن دبێژن . نزار
(زنارا مێردینێ) نافدارە .
ع (الجانب الشمالی من الجبال).

(زنهار) ـ ئەمانەت ـ نەبی نەبی :ـ
زنهار ! تو ل بارام ئەولە نەبی.
زنهار ؟ خوە نەسپێری دژمن .
ع (للحذر والتنبیه) .

(زرز) ـ شەموزە :ـ قاتــرا وە
شەموزە ـ قاتـرا وە زرزە .
ناهێلی بارا بهەسانی لێکن ـ
ناهێلی بخوەشی باربکن .
ع (النحس) .

(زکرەش) ـ ئەو مرۆفێ کۆ دلــێ
وی ژمرۆف رە ناخـــوازی ـ
زمـرۆف خـــوی دکـــی ـ
ناخـــوازی مـــرۆف تێـــرنان
بخوی . ع (بمعنی الحسود).
(زقزق) ـ زیقزیق . دەنگــــە .
ژخرەکـــــی ـ ژستی
دەردکەفی ژ بهف خوەراندن
دەردکەفی . ع (صوت من
الاحتکاک) .

(زق) ـ زۆق . ئەوەکۆ یـــەك ل
یەکی تەماشا بکی وەکـــــە
مرۆفێ دژمن چافێ خوە ژێ
ناگەرێنی هەر لێ دنــەری :ـ
بارام زق ل فەرهاد دنــەری ـ
زۆق لێ تەماشا دکی .
ع (نظرة نحو الانسان ـ نحو
الشیء . کالتحری) .

(زلف) ـ یا زولـــوف . ژ پۆرێ
ژنا بەسەر ئەنیا وادە تـــــێ
خوار جزیری دبێژی :ـ
چین چین کرن زلفێ سیا
کەسك ئەتلەسا دیبا قەبا
ایدی نیشان نابن خویا
تێکەل کرن بادێ سەبا ...
عربێ دبێژن :ـ ام الزلف .
ع (السوالف ـ المثنی) .

(زراف) ـ باریك وبلندە . بەژنــا
زراف ـ بەژنی باریـــك .
زرافە وەکە دەلێ ...
ع (الرفیع) .

(زراف) ـ قەلـــەو • زەرآفـــە ـ آفازەرە • لسەر کـەزەبێ ـ لسەر جەرگ ـ جەگـــەر کیسەك تژە آفازەر هەیـــە نافێ وی زرافە • بزێ یـــا قەلەوە • ع (المرارة) •

(زرافزراف) ـ نافـێ بەســـتاکە کورمانجی یە :ـ
زراف زراف زراف زراف
لێ لەیلۆ ! زرافێ
مژ تە پێڤە کەسەك نافێ
لێ لەیلۆ ! زرافێ •••
ع (اغنیة کوردیة خفیفـــــة للرقص) •

(زرباف) ـ دێماری یە ـ مێرێ دیا زرکورە • بارام زرباقـــــێ فەرهادە ـ دیا وی مار کریە• فەرهاد زرکورە ـدێماری یە•
ع (حلیل امه ـ الذی تـزوج بامه) •

(زرتەك) ـ ئێ کـــۆ گـــەهەك زرت وفۆرتا دکی • زرتەکێ پێلەوان • بەردەستیێ وی یە•

(زك) ـ ئور ـ هور :ـ زکێ بارام مەزن بویە ـ ئورێ وی مەزن بویە • بەلام ئەم کارن (زك) ـ چلەدانك ـ لجهێ (معدة) بێژن • و(ئور) لجهێ(کرش) ـ بطن • بێژن • ع (المعدة) •

(زلەك) ـ گوندەکە لبەر چەمێ بشێـــریێ دکـــەڤی • زل گەلەك لێهەنە •

(زڤنگ) ـ شکـــــەفتن • تـــێ دە کۆچەر ـ خوەدیێ پەز زڤستانا پەزێ خوە خوەدی دکـــــن • پاشێ بونە وەکە گوند •
ع (کهوف لاصحاب الاغنام) •

(زنگ) ـ دەنگێ هاسنە ـ دەنگەکە بخوە هاتیەناڤدان • زنگین ـ زرنگین • بڤـێ داخـــوازێ هاتنە • گەلەك جارا تەڤایـی هاتیە • دبێژن :ـ زنگـــــین ژگوهێ مێ • ع (کلمـــــة صوتیة مصدرها الحدیـــــد والاذن ؟) •

(زل) ـ بچوکێ وێ زلکە • گەیاکی

زراف ودرێژه • دناف آفــێ
ده شین دبي • عرب دبێژن :ـ
نەی کۆچەر وگوندي دکـــن
چیت وپەرده ول هاوير خــوه
فەدگرن ـ دخن ناف بـــەرا
ئودێ ومالێ • ع (ني) قصب
النی •

(زم) ـ یا زمزم • دەنگێ کــــۆ
پرێجارا ژفادێ تێ ـ ژلێدانا
فادێ تێ بیرازمزم • ژفــــر
دەرکەتیه • زمین ژێــدەره •
هن دبێژن :ـ زرمین • زم ـ
ـــزمزم ـ زرم زرم • زمــــین ـ
زرمین • وەکــه گومـــــین ـ
گورمـــین • دبي زەمــین ـ
زمهریر ـ زمستان ـ زڤستـان
ـ زمزم ـ زەمزەم هەمي زڤر
دەرکەتین • ع (کلمة صوتية
غالبا مصدرها الارض) •

(زرگان) ـ چەمەکـه • لرۆژآفایێ
(دەرباسي) یــێ دکــەڤي •
لژێرێ ماردین)ه •
(زمین) ـ یازرمین • چاوا تێزیــک
دەرباس بویـــه • ژێـــدەرێ
زم ـ زمزم ـ زرمزرم هاتیه •

(زڤستان) ـ زمستان ـ سێ مهێ سار
بەرف وباران وباهـــۆزن •
ژترسا خەلکـــێ کوردستان
خانیێ خوه دبن زەڤیێـــێ
ده ـ دبن فادێ ده چێدکرن •
ژلەورا نافێ وان سێ مها بویه
زەڤیستان ـ زەمینستان ـ ئـەو
دەمێن کـۆ کـــورد وفارس
دکەڤن بن زەڤي ـ بنزەمین •
هن دبێژن :ـ زمستان • بەلام
زڤستان ـ (زەڤیستان) راستە•
ع (الشتاء) •

(زندان) ـ جهێ زێندیيا یه ـ گۆرا
زێندیيا یه • (دان) آلافــه
نافەکه ژبۆ شون ـ جــي ـ
جیگه هاتیه :ـ کەفچیدان ،
خوەلیدان ، خــوێدان •••
(زند) ـ یا زێندی مرۆڤـــێ
ساغن • دهەمبەر مـــری ده
هاتیـــه • فارس دبێـــژن :ـ
(زەندە) ـ زەندەگي •

ع (السجن) •

(زرين) ـ زرزر • دەنگێ کەرایە•
زراندن ژێدەرێ تێ‌بەره •
ع (صوت الحمير) •

(زنزان) ـ دبي ژ(زندان) هاتبي •
عرب ژى دبێژن :ـ زنزانة •
بەلام وا دیارە ژکوردی ـ
فارسي هاتیە • تەنێ زنزان
دزندانێ‌دە ژورەکە بتەنهایة ـ
جهێ‌مرۆڤەکي يە ـ جهێ
يەک‌مرۆڤي يە •
ع (الزنزانة) •

(زيان) ـ خسارەتە • ترک ژى ولۆ
دبێژن • بەلام
بکورمانجي دبێژن :ـ گۆلك
چونە زیانا • دەوار کەتن
زیانا ••• یاني کەتن ـ چونە
ناڤ رەز وآڤي وبوستان
وشیناهي • دڤردە ژى خسار
هەیە • چاوا دبێژن :ـ کا
بێژە بازرگانێ‌یا تە کارە یا
زیانە ـ خسارە • بارام نەکار
کریە ونەزیان کریە •

ع (الخسارة) •

(زمان) ـ زار ـ زاراڤ • بەلام
زمان ـ (لیسانە) ـ زار
(لغتە) • زاراڤ ـ لغەتەکي
کۆنایێ زانین ـ نایێ ڤام‌کرن•
ئەم کارن (زاراڤ) بداخوازا
شیوە ـ لەهجە بدن زانین •
لسليماني زاراڤ بداخوازا ـ
مصطلحات دانینە • براستي
زاراڤێ تەبا ـ چێکیا
(مصطلحاتن) • بەلام ئێ مرۆڤا
لەهجاتن ـ شیوەیە •
ع (اللسان) •

(زنگین) ـ ژێدەرێ زنگە • دەرباس
بویە • دەنگی‌یە • ئەڤ دەنگ
ژهاسن وگوهـ دەردکەڤي •
(زرنگين) ژیێ‌ تێ • وەکە
چنگین ـ چرنگین •

## (زه ـ آ)

(زەندآڤستا) ـ نڤشتا زاردەشتە•
ژهەمو شیوە و زاراڤێ کوردي
بێتر نێزیکی کورمانجي یە •
بەلام براستي گەلەک دوری

كوردي بويه • ع ( كتـــاب لزاردهشت) •

(زهندا) ـ گوندهكه • ل ژێـــرێ (قامشلوكێ) دكهڤي • دبـــي ژاێـــلا (زهند) هاتبـــن ڤي گوندي • ژبهركو ناڤێ ڤـــێ ايلێ (شاه پزنی) يه • يـــان شاهپسني يه ـ شاه پهسنيیه • بخوه دبێژن :ـ ئهم پسمامێ شاهێ عهجهمن ، يان زاروكێ شاهن ـ پسێ شاهن • كهريم خانێ زهند شاهێ ايران ژاێلا (زهنده) دبي خهلكێ (زهنـدا) شاهپسني ژپسمامێ كهريمخانێ زهند بۆ • ع (قرية في جنوب قامشلية) •

(زهلاڤا) ـ باڤكهك ژ كوردێ هێـــلا (آموده ـ عامودێ) نه • ل ناڤ دهڤۆريا وملا بهلاڤ بونـــه •

(زهرنۆڤا) گوندهكه ل رازۆرێ نصێبينێ دكهڤي •

**(زه ـ ئه)**

(زهده) ـ جارنا كورد دبێـــژن :ـ حهڤزهده فلانتشت باشنـــه • ئهڤ (زهده) يان ژزاده ، وهيا ژزێده ، هاتيه • يان ژتركـــي هاتيه •

(زهـ ـه) ـ ژبرنج وشيراني جێدكن. هن دبێژن :ـ زهردهله • ناڤێ خوارنهكێ يه • ع ( اســـم لطعام مصنـــوع من الـــرز والحلويات) •

(زهرۆله) ـ ناڤێ چوكهكي زهره • بچوكه بهارا گهلهك خويـــا دبي • ع (اسم لعصفور صغير اصفر اللون) •

(زهنده) ـ يا زهند ، داركه كـــهرت تێده ههنه ، دهندروێ كيسوێ دهري ده تێرادان :ـ زهنـــدا دهري زاده ، زهنـــدا دهري بكشێ • ع (خشب يغلق بـــه الباب) •

(زهنبهره) ـ يا زهنبهرهك • بادهكه• زهنبهرهكا ساعهتێ ، زهنبهرهكا مهكينێ ••• زهنبـــهرهك • ددهمێ كهڤنارهده ـ دچاخـــێ

جه‌نگا کورد و خاچپه‌ره‌ستـــا ده ناڤێ آلافه‌کی جه‌نگێ بو ٠

(زه‌نگه‌نه) ـ ناڤێ ایله‌کـه کــورده مه‌زن وناڤداره ٠ ٠ ع (عشـــيرة كوردية) ٠

## (زه ـ ئۆ)

(زه‌نگۆ) ـ سوار پی‌یێ خوه ـ نگێ خوه ـ لنگێ خوه دخنـــێ وسواردبن ٠ لێ عربێ چۆلێ بێ‌زه‌نگۆ سوار دبن ٠ ع (الركاب) ٠

(زه‌كۆ) ـ (زه‌ینۆ) ناڤێ دو به‌سته‌ئێ كورمانجی نـــه ٠ دبـــــه‌ر گۆڤه‌ند وديلانێ ره تێ نـــه گۆتن ٠ ل‌سه‌ر دو ژنا هاتنــه گۆتن ٠ كۆناڤێ یه‌كــــێ زه‌كۆ ـ زه‌كیة ـ زه‌كیـــا ٠ وناڤێ یه‌كێ :ـ زه‌ینۆ ـ زه‌ینب ـ زه‌ینه‌بێ یه ٠

(زه‌رده‌لو)ـ ناڤێ نفشه‌ك مش‌مشه٠ گه‌له‌ك شێرینه ٠ ع (نـــوع من المشمش) ؟

(زه‌رگێ) ـ ناڤێ ژنایه ٠ ژزه‌رگ هاتیه ٠ زه‌رگ آلافه‌كـــــی جه‌نگێ یه ٠

(زه‌وقێ) ـ یـــان (زه‌وق) باژاره‌كي كورد ٠ ل‌ناف خـــه‌رز ایه ٠ زه‌وق و زۆقه‌ید ٠ دوباژارێ بچوكن ٠ ل‌ناف خه‌رزانـه ٠ ناڤێ وان دتاریخێ ده هاتیـه ٠ ع (مدينتان صغيرتان كورديتان في‌منطقة خه‌رزان) ٠

(زه‌لخێ) ـ ناڤێ ژنا یه ٠ بـــه‌لام سه‌رێیهاتیا حه‌سۆووزه‌لخـــێ دچیرۆك وئه‌فسانه‌ئێ كوردی‌ده ناڤداره ٠ بچیرۆك وستران تێ گۆتن ٠ خویایه ژناڤـــێ (زلیخا) ده‌ركتیه ٠ یا (زلیخا) بچوكێ زه‌لخێ یه ٠ زلیخـــا مصرێ ناڤداره ٠ ٠ ع (قصـــة كوردية) ٠

## (زه ـ ئي)

(زه‌ري) ـ ناڤێ كه‌چێ مال‌مـــــه‌زن وخانه‌دانه ٠ پاشێ بویـه ناف ژبۆ هه‌مو كه‌چـــێ جـــوان

ودەلال وخوەشك ونازدار •
زەرىيێ مالاگالۆ لخورساناڤێ
دەندگ دانه • گەلەك ستران
لسەر زەرىيێ چێبونه •
هەىزەرى ••• بەستەيەكە
كورمانجىيە • ع(لقب لبنات
الاشراف ثم اصبح لقبا عاما لكل
جميلة) •

(زەغەلي) ـ ئەو گەيا وگەرش وگەمارا كۆ لناف دەخل وزاد وبوستانا شين دبي :ـ ايسال گەلەك زەغەلي دناف زادێ مه دە هەيە • لێ گەلەك جاران زەغەلي دمرۆڤا دە ـ ـ دتەبادە تێ گۆتن :ـ بارام زەغەليا دكى ـ ناخوازى ڤي كارىبكي • گايێ مە زەغەل بويە نەماجۆوت دكى • چاڤ زەغەلە ـ ناخوازى كارەكى بكى • (دەغەل) و (زەغەل) دديوانا (خانى) دە هاتنە • ع (الكسولوالصدأ والحشائش الزائدة الغريبة بين الزرع) •

(زەڤي) ـ قادە ـ ئەردە • كورمانج بداخوازا (ملك) دبێژن •
ع (الارض) •

(زەمجي) ـ ناڤێ وي مرۆڤێ كۆ زەما خەلكێ دكى • ژعربي وكوردى ـ تركى هاتيە • (زم) عربىيە (چى) كوردى ـ تركى يە كورداغى ولۆ دبێژن • (النمام) •

(زەندى) ـ يا (زێندى) بداخوازا ساغ هاتيە • دبێژن :ـ مرى ، زێندى وێ ژمەرە داخوازا مە پێك بينن ؟ (زەند) ناڤێ ايلەكە كوردە لايرانێ يە • زەند ـ زەندە ؛ دارەكە دكيسوێ دەرىڤە دەرباس دكن • زندان ـ جهێ كۆ زەندىيا ـ ساغا تێدە دهێلن•
ع (الاحياء) •

(زەني) ـ دچەنێ دە ـ دبن لێڤا ژێرى دە جهێ كۆ مو تێ دە بتۆڤ شين دبن ناڤێ وێ (زەنى) يە • ع ( اللثة ) او الذقن •

(زه‌نگی) ـ ناڤێ مالباته‌كه توركـــه كـــۆ هاویـــرێ ڤرنـــه‌كی ل‌كوردستانێ فه‌رمانـــداری كریه ، ومالباتا كوردێ ایوبي پادشاهي ژوان ستانـــدنه . پای‌ته‌ختا وان .بازارێ (موصل) بو . عمادالدین ونورالدیـــن ده‌نگ‌دانه . دده‌ما عمادالدین زه‌نگی ده ملەتێ كورد گه‌له‌ك زۆروسته‌م خواریه ، خه‌سما كوردستانا راسه‌ری موصلێ . ع (اسم جد ملوك الموصـــل الاتابكية) .

(زه‌یت) ـ ژزه‌یتون . ده‌ركه‌تیـه . پاشێ بویه ته‌ڤایی . دایـرۆده زه‌یتا نه‌باتی ژی چێ‌بویـه ـ چێ‌كرنه . ع (الزیوت) .

(زه‌نج) ـ زه‌نگه . زه‌نجـــار ـ زه‌نگـاره . ڤرێژ وگه‌مـــارا كۆ ل‌تشتكی دگری :ــ درانێ باژام زه‌نگ گرتنه . خه‌نجه‌را ببه‌یدا زنگار گرتبو . وهـــا ره‌نگه ناڤێ نفشه‌ك مرۆڤـــه كۆ ره‌نگـــێ وان ره‌شـــه . دچاڤێ چه‌رم سپي‌یاده گه‌له‌ك كێم‌بون ، لێ ایرۆ گـــه‌له‌ك برومه‌ت دبن ، وه‌كه شـــێرا له‌ب هلتێنن . ل‌ئه‌مریكـــا وئه‌فه‌ریقا رودنشتن ـ رودنن. هنك ژوان به‌لاڤ بونه . ع (الزنوج) .

(زه‌نخ) ـ ل‌هن شونا بداخوازا گه‌نی یه . مرداسا دبێژن :ــ (خنز). دبي ژهه‌ڤ ده‌ركـــه‌تبن ـ سه‌رگوهه‌ری هه‌ڤ بوبـــن . (زه‌نخ ـ خه‌نز) .ع (التعفن).

(زه‌رنیخ) ـ ناڤداره . دبي ئه‌ڤ‌ژی ژ خنز وزه‌نخ هاتبي . بـه‌لام ده‌نگ دایه و به‌لاڤ بویه . نفشه‌ك ژه‌هره . پێ مـــووا رادكن . ع (معروف) .

(زه‌رد) ـ بداخـــوازا (زه‌ره) . دچه‌ند كـــرن وژێـــده‌رێ سۆرانی ده ئه‌ڤ (د) زێـــده خویادكی .

(زه‌ند) ـ دده‌ری ده داره .دكیسۆره

دەرباس دکن • دلاشێ مرۆڤا
دە ناڤبەرا دەست وچەنگە :ــ
ڤان دەست وزەند وساعدان
مەي دانە شيخ وزاهدان •••
وهارەنگە چاوا دەرباس بويــە
ائيلەكە كوردە لايرانــێيە •
ع (الساعد) •

(زەر) ــ ناڤێ رەنگـــەكی يــە ــ
زەردە • زەرۆ ــ زەرێ بونە
ناڤێ ژنا • زەرك ناڤێ تاســا
آڤێ يە•زەرك نەخوەشيێ‌يەكە
چاڤ‌زەر دبن • ع (اللــون
الاصفر) •

(زەبور) ــ ناڤێ نفشتا داودپەيغام‌بەرە
ع (معروف) •

(زەبەر) ــ زێروزەبەر ــ وێرانــە ــ
هلوەشاندنە ــ تارومـــارە •
ژفارسيێ‌هاتيە ، زێر زێــرە •
زەبەر ــ بەر ــ سەرە • يانــی
سەروبن • دنيا زێروزەبـــەر
بويە ــ دنياسەر وبن بويــە •
سەرچـــــويەبن وئێبـــن
چويەسەر • ع (انقلاب ــ او

الخسف والنسف) •

(زەرزور) ــ ناڤێ چڤيكەكی يــــە
كۆ بـهـــەزاران وبـــێ‌ژمار
بـهەڤرە دگەرن • دژمنــــێ
(كولي)نە • دەما كورمانـــج
تشتەكی بێ‌ژمار بێژن • دبێژن
وەكە كولی نەــوەكە زەرزورن.
رەنگـــێوی دنــاڤ بــــەرا
رەشێ‌ڤەكری وجون دەيــە •
ژبەر كۆ گەلــەك زورزور
دكــن ژوانرە دبێـــژن :ــ
زەرزور • ع (سنونو) •

(زەنار) ــ كەمەرەكە ــ كەمبەرەكە•
فلە ددن پشتا خوە ــ دبـــن
كنجێ خوە دە گـــرێ‌ددن •
دديوانا جزيری دە گـەلەك
هاتيە دهۆزانی وئەدەبا كوردی
دە گەلەك پەيدا دبي • عرب
ژی دبێژن :ــ (زەنار) •
ع (يربطون فوق بطونهم) •

(زەمهرير) ــ دعربي دە هاتيە بەلام
درستە ژفارسی هاتبي • چاوا
دزەمستان دە هاتيە گۆتـــن •

زەم ـ زەمین ـ زەڤي يــە . لێنزانم (هەریر) ژکو هاتیە . بەلام زەمهریر ـ پێکڤە بهنـــا فارسي ژێتێ . ع (معروف).

(زەور) ـ گرێدانا خورت وبادانە . بزەورێ ، گەلەك بابدە .
ع (نهاية الشدة) .

(زەرگوز) ـ گوزازەرە . ع (نوع من شجرة الجوز) .

(زەبەش) ـ یان شەبەش . ناڤدارە .
ع (البطيخ الاحمر) . دبشی .

(زەلق) ـ زێرچا چوك وچڤیـــك ومریشك وهەمرەنگێ وایە .
ع (الزرق) .

(زەرك) ـ تاسە ـ پیالە ـ پیانـە . کاخك ژ آخێ چـێدکرن ـ کاسك بداخوازا تاس هەمـی هاتنە . ع (طاس) .

(زەرگ) ـ دزەرگـــێ دە دەرباس بویە کۆ آلاڤــەك شــــەر وجەنگە . پاشێ زەرگێ بویــە ناڤێ ژنا . ع (آلة حرب قديمة كالرمح) .

(زەنگ) ـ دزەنگـــار دە دەرباس بویە . گەمار وقرێژە .
ع (الوســـخ) في الاســـنان والحديد .

(زەنگ) ـ دسۆرانی دە لشـــونا (زەنگل) تێ گۆتن . سفكترە .
زەنگۆ دەرباس بویە رکـــاب رکێبە . زەنگـــی ناڤـــێ مرۆڤەکی مالمەزنێ موصلێیە .
زەنگـــین ـ دەولەمــــەندە ـ خوەدی قرێژە .

(زەحەل) ـ یا زوحـــەل . ناڤـــێ ستێرەکێیە ... ؟

(زەغەل) ـ ئەو مرۆ ڤوتەبایێ کۆ ناخوازن ـ نکارن کارەکــــی بکن . زەغەلي ئەو گەیـــــا وپنجار وتشتێ کـــۆ ل ناڤ زادا شین تێ . ع (الكسول ـ الذی يتهرب عن العمل) .

(زەنگل) ـ دبي ژ (سەنگ ـ گل) ـ کەڤرێ حەری . هاتبـــي وێجاخێ فارسيیە . بــــەلا، چاوا دەرباس بویە . زنگ ـ

زنگین ـ زرنگین • دەنگـه •
جا ئەگەر ژ زنگ ـ زنگــین
هاتبي كوردیه وبسۆرانـــي
بێتر راسته • زنگ ـ زنگزنگ
ـ زنگــین دەنگـه ژلـــەورا
(زەنگل ـ زەنگ) ژزنـــگ
هاتیه • ع (الجرس) •

(زەنبیل) ـ زەمبیل • ژ شڤکـــا
چێدکن • دەڤێ وێ ژبنـــێ
وێ فرەهـ تره • کوردیـــێ
کارێ خوه دکن •

(زەینەل) ـ ناڤێ میرەکی کـورده •
(زەینالی) آڤاني‌یەکه بلنـــد
وجوانـه ژآڤاني‌یـــێ باژارێ
( حصکف ـ حصن کیـــف ـ
هەسکیف) مایه • کوردێ وا
ناڤا گەلەک پەسنێ وێ ددن•
ئەڤ باژار پای‌تەختا خانەدانێ
ایوبي‌یێ کورد ـ بەرمایـــێ
پادشاهێ ناڤــــدارێ کـورد
(صلاح الدین) بو •

(زەمزەم) ـ ناڤێ بیرەکێ‌یه ل باژارێ
مەکهێ یه • گۆیا ژ زمزمـــا
دەستێ دیا اسماعیل ـ (هاجرة)
چویه خوار ؟ بەلام (زمــزم)
دەنگەکه دکوردی ده ناڤداره•
ع (معروف) •

(زەردوم) ـ دارەکی شەره • ستور
ودرێژه•دبێژن :ـ زەردوماکی
درا دگەل بارام بو ـ بدەست
بو • ع (عامود خشبي‌للحرب)

(زەخم) ـ بداخوازا خورته ـ توندە
ـ بقوته • لێ نزانم ژکـــو
هاتیه ؟ ع (القوی) •

(زەکەم) ـ باهۆر ـ هالمەوت •
ع (الزکام ـ الرشح) •

(زەلەم) ـ ناڤێ کەڤنەباژارەکـــی
کورده • لهێـــلا ســـلیماني
دکەڤي •

(زەنگان) ـ ناڤێ باژارەکی کورده•
لایران دکەڤي ، گوندەکـــه
لناڤ هەڤیرکایه •

(زەنگین) ـ زەنگ • دەرباس بویـه
کۆ قرێژ وگەماره • زەنگــین
خودەی مال ـ خودەی قەرێژ

ـ خوەدي گەمار • ژبەركـۆ
دبێژن :ـ مال قەرێژا دەستايه
:ـ بارام خوەدي قرێـزه •
يانى هنكمال لجهم كـــۆم
بويه • قەرێژا كۆ لدۆر هەبو
هەمو چو • يانـي مالـێ وى
نەما • پچك قەرێژا وى هەيه
خوه پـێ كـوبار دكى •
ع (الغنى) •

(زەرگون) ـ رەنــگ زەره •
ع (اصفر اللون) •

(زەمين) ـ زەڤى ـ زەمى يه • زڤستان
ـ زمســتان ـ زەمهريـــر •
زڤر دەركه تنه • فارسي‌يه :ـ
زەمين ئەز حلمێ ئۆ ساكن
فەلــەك ئەز عشقێ ئــۆ
شەيدا •••

(زەرين) ـ ژ زێر هاتيه • زێرين ـ
زەرين كەمەر • زێركەمەره .
ع (الذهبي) •

## (زۆ ـ آ)

(زۆرآڤا) ـ گۆتنەكه ژدو گۆتــا
پێكهاتيه :ـ زۆر ـ خـورتى ،
(آڤا) ـ آباده • آوەدانى يه •

(زۆرآڤا) بزۆر آوەدان ـ بزۆر
هاتيه آڤاكرن • ناڤێ گوندەكى
يــه ل رۆژآڤايـــێ (نصيبين)
دكەڤي ، دناڤ ايـلا بوبلانا ده
هاتيه آڤاكرن ، ابراهيمـــــێ
قاسۆ تێدەيه •

( زۆرچۆنــه ) ـ زۆر ـ خــورت
وبقوته • چۆ ـ دارێ زۆرێ
يه • كورمانج دبێژن :ـ (چۆ
ژ چۆ ڤەدگەرى) • دار ژدار
ڤەدگەري ـ قوة ـ ژ قوتــێ
ڤەدگەرى •••

:ـ بارام حەقێ خوه ـ مافــێ
خوه زۆرچۆنه ستاند • يانـي
بزۆرا چۆ ، يا بچوێ زۆرێ
ستاند • (نه) دڤرده بداخـوازا
(وەك) هاتيه :ـ مێرانــه ـ
مەردانه ـ شاهانه ـ پياوانه ـ
وەك مێر ـ وەك شــاه ـ
وەك پياوه • ع (بقوة العصي
او بعصى القوة) • كناية عــن
القوة •

(زۆرۆ) ـ ناڤــێ مرۆڤەكــێيه ـ

زۆرۆآغا دچیرۆکیا رەشویێ
داری دە گەرناسەکی
چیرۆکێیە دەورا زۆر وزولم
دگەرینی • زۆرۆ - زۆرێ
بونە نافێ پیاو - مرۆف -
نێرا • زۆرکەر ئێ کو
زۆرێ دکي • ( اسم بطل
في قصة (رەشویێداری) جاء
من الظلم والبطش والقوة •

(زۆ) - بداخوازا جۆت هاتیە - دۆ -
زۆ •

(زۆزۆ) - جۆتجۆت - چفتچفت
- دۆدۆ • ع (زوج زوج) •

(زولفۆ) - یا زلفو - زولفي -
نافێ مێرانە • زولفێ نافێ
ژنایە • ژ ذوالفقار وزلف
هاتیە • پۆرێ ژنا کو بسەر
ئەنیا وادە تێخوار - پەرچەم
وئەگریچە • ع (اسم للرجال
مخفف من ذو الفقار) •

(زۆرچۆ) - ئێ کو چوێ زۆرێ
بدەستێ ویە • دزۆر چۆنە دە
دەرباس بویە •

(زۆنێ) - نافێ گوندەکی یە •
گۆرا (شیخموسی) ئێ زۆلي -
زۆني نێزیکی في گوندیە •
دبي شیخ موسی بخوە
ژ(زۆنێ) بي - پاشێ بویە
(زۆلي) - ئەنزەلي • ئەف
دیاره کو دتاریخا ژینگاریا
شیخ عبدالقادر گەیلانی دە
زیندار بو • دچیرۆک
وئەفسانەئێ کورمانجا دە
گەلەک دبوارا فا هەردو
شێخادە دان وستاندن چێبویە.
لێ دفردە نایتە گۆتن
ژبەرکو پێباوەر ناکم •
مرۆفەکی نافدارە • خەلکێ
هاویر مێردینێ هەرسال لێ
کۆم دبن - دجفن • شاهی
وگۆفەند ودیلانێ دکن •
گەلەک هێفیا فەنجییێ ژێ
دکن ، داخوازێن خوە ژێ
دخوازن •

(زۆخ) - کەف وکێجا بریێ -
زاینێ یە • زۆخ ل پاش خون
تێ گۆتن :- خون وزۆخ

ـ ئەلەم ـ عداب ـ چلـــم وخونە • ع (القيء والالم) •

(زۆقەيد) ـ باژارەكي كـــوردە ، بچوكە • لناڤ خەرزايە •

(زۆر) ـ خـورتي ـ چاڤسۆري ـ بيستوري وقوتە ـ ستەمكاري يە بەلام دشيوە وزاراڤێسۆري دە (زۆر) بداخوازا گەلەك ـ پر • هاتيە • زۆرباشـــە ـ گەلەكباشە ـ زۆرچاكـــە ـ گەلەكچێيە • ع ( القـــوة والظلم والاستبداد) •

(زۆق) ـ زق ـ توژ :ـ بارام زۆق لفەرهاد تەماشا دكي • ئەزێ چاڤێ دژمن زۆق دەرخـم ـ جۆت دەرخـم •

(زۆتك) ـ مرۆڤـێ باوەسـيري زۆتكا وي دەردكەڤي • رۆڤيا قونێ يە دمريشكێدە گەلەك تێگۆتن • سۆر وبخويـن تێدەر • هن دبێژن :ـ تابوت. مەزنێ وێ زۆتە • ژهـەڤرە وژبۆغەيد دبێژن :ـ زۆتـۆ ـ زۆتێ •

(زۆل) ـ تەريشـــس وبەرچاكـــى درێژە • زۆلەك نان بدە من ـ زۆلكەك زەڤيا من هەيە • زۆلەك چەرم ژێ كـــر • ع (قطعة مستطيلة من بـعض الاشياء) •

(زۆزان) ـ بداخوازا تەڤايي چــە جهـــێ كـــۆ بەرف وساري وهێنكبي زۆزانە • كۆچـەر چونە زۆزانا ـ كۆچەر هاتـن گـەرميانا • زۆزان دهەمبـەر گەرميان دە تێ • (زەوزەنـي) ناڤێ زانايەكي كەڤارە ، درێ زمانا عربيدە ناڤدارە • دبـــي ژخەلكێ زۆزان بي•بالڤەدانە. وەكە حەصكەڤي ـ زانايەكـى تاريخـــييە • ژشــــارێ حصكف ـ حصنكيـــف ـ هەسكيف دەركـــەتي يە • بالڤەدانە • (منطقة باردة مـن شمال كوردستان) •

## (زو ـ ئو)

(زو) ـ سفك ـ چالاك ـ چابـك

بلەزە :ـ زو هات • بـــەری چاخێ خوە هات • زو چـو ، بەری‌کۆ چاخێ وی بقـــەدي چو • ع (السرعة والاستعجال)

(زوزو) ـ زێدەسڤکە • ع (الاسراع)

(زوبزو) ـ زوبزو بارام بسەیداڤە گهشت • ع (بسرعة) •

(زورچ) ـ زورچك • گەیایێ هور وبتۆڤە،د(زرچك) دە دەرباس بویە •

(زورزور) ـ دەنگێ گورایە • ع (صوت الذئاب) •

(زوك) ـ ناڤێ كابەكیيە •زاروك پێ دلیزن • (زوكێ) ناڤێ وێ لیستكێ یە •

## (زێ ـ ئێ)

(زێ) ـ چونا بوكێ لمالا باڤێ یە ـ ڤەگەرا بوكێ ل مالا باڤێ جارا پێشي یە • بوكا مە چویە زێ ـ چویە مالا باڤێ خوە • لـێ تەنێ دجارا پێشي دە تـــێ گۆتن زێ • ئەگەر جارا دوەم هەری مالا باڤێ خوە نابي زێ• ع (رجوع العروس الى بيـت والدها في المرة الاولى) •

(زێ) ـ ناڤێ (زاب)ە • دبێـژن :ـ زێ بەهدینا ـ زابێ بەهدینا • ع (نهر الزاب) •

(زێدە) ـ ژعربي هاتیە ـ (زائدة) • بەلام بویە كوردی زێـــدە ـ زێدەتر ـ زێدەكرن • زێـدۆ زێدێ بونە ناڤ •

(زێر) ـ ناڤدارە • دبـــي ژبـــەر زەراهیا وی ناڤێ وی بویـــە زێـــر .ـ زەر ـ زەرد • ع (الذهب) •

## (را ـ آ)

(را) ـ آلاڤەكە آلیكارە گۆتنكە نـو چێ دكی وەك :ـ

خستن ـ راخستن

خست ـ راخست •••

كرن ـ راكرن

كر ـ راكـر •••

دان ـ رادان

دا ـ رادا •••

دڤا تــــەڤادە (را) آلاڤــــەکە
کرنەکە نــو چێکــــــــریە ـ
ژێدەرەکی نو چێ کریە •
ع (آلة ـ اداة للمساعدة وخلق
فعل آخر) •

(را) ـ خوەسپارتنا بەختێ دژمنــە •
وەرە رایێ را را خوەدێ یە •
نایم دێ لەبەختێ دژمن ئەوله
نایم • خوە نەسپێرم دژمن •
ع (الاستسلام دون قیــد او
شرط) •

(راهب) ـ راحب ـ رەحب ـ رەحبکێ
دیرانە • ئێ ب خۆرتانـــــی
دکەڤن دێرا وخوەشــــیێ
جهانێ ژبیرا خوە تاڤێــژن •
دئۆلا فلها دە پەیدا دبي لـــێ
کورد دستران وسەــرپێهاتیێ
خوەدە گەلەک دبێژن •
ع (الرحـــب ـ الراهــب ـ
والراهبة) •

(راست) ـ دلاش دە دهەمبــــەر
خواردە تێ :ـ ئەڤ دار راستە
ـ نەخوارە • ئەو خــەت ـ
خێز • راستە نەخوارە • ئەڤ
دیوار خوارە نەراستە •
ع (متساویە ـ غیر معوج) •

(راست) ـ دهەمبەر دەرەو دە هاتیە ـ
راستە نەدەرەوە • دەرەوە ـ
نەراستە • راستي ژێـــدەرێ
وێ یە • راستک آلاڤەکـــە
پێ تشتا راست دکن •
ع (الصحیح والصدق) •

(راچێت) ـ ژاوروپی هاتیە بـــەلاە
بویە کوردی • ئەو کاغــەزا
کۆ دەکتۆر ژنەخوەشارە ژبۆ
کرینا دەرمان دنڤیسي :ـ

ئەم برنە خەستەخانێ
دەکتۆر نەدا مە راچێت •••

هن دبێــژن :ـ راچێتــە ـ
راچێتا •

(رایت) ـ نافێ هەریمەکە کۆ بڤـی
نافی دەنگ دایـە • راسەرێ
شارێ نصێبین • دکـــەڤی •
چەند گوندێ مەزن وآڤا تێدە
هەنە • گەلەک ژوان فلەنە •

ع (مقاطعة كوردية شـــمال نصێبين) •

(رادار) ـ تـەڤايـــي بويـە • پـێ ئەڤگەرێن جهانێ تێن خوياكرن وزانين • آلاڤەكە ئەگـــــەر ددەمێن كەڤارە دە بونا مـــە باوەر نەدكر • ع (آلـــــة الرادار) •

(رازۆر) ـ باكور ، شمالە•رازۆرێ كوردستانێ ـ باكورێ وێ يە•
ع (الشمال) •

(رازێر) ـ قبلى ـ جنوب ـ آلى‌يـێ ژێرێ هەرتشتێ يە دجغرافيـا دە • ع (الجنوب) •

(راسەر) ـ بداخوازا زۆر هاتيـە • بارام راســەرى فــەرهادە ـ دسەرســـەرێ وى رەيـە ـ راســـەرى فەرهــاد هاتيـە ـ بەسەردە زال بويە ـ وگۆتنێ هشـــك ونەخـــوەش ژێرە دبێژي • ع (فوق وتسلط) •

(راز) ـ تشتێ ڤەشارتـــــى نـــە • رەمزوراز دديوانا جزيـرىدە هاتنە •

(راف) ـ راوە ـ نفشەك نێچيرە • نێچير دكورمانجى دە ســـێ نفش خويا دكن :ـ نێچـير ـ راو ـ هێلە • واديارە ئەگـەر كۆمەك سوار وپەيا بـهەڤرە هەرن نافێ وێ راڤە • لـێ كۆ بـهەڤرە هەرن نێچـــيرا كەوا نافێ وێ هێلە يە • بەلام نێچير گۆتنەكە تەڤاهي يـــە • تەنێ مرۆڤەك بتەنێ نكـارى بێژى :ـ ئەزچومـە راوێ ـ ئەزچيبومە هێلــێ ئەگـــەر نەبهـــەڤالێ خـــورەرەبي ـ نەبهەڤالێ خوەرە چوبي ،بەلام دكارى بێژى :ـ ئـــەزچوبوم نێچيرێ• م نێچيرەكە خوەدي• لێ نكارى بێژى :ـ مراوەكـە خوەدى ـ مهێلەكە خوەدى •
ع (الصيد الجماعى) •

(رام) ـ تەكێ وێ (رەم) تـــێ • (كورێ حەوقەل) دبێژى :ـ

رام واریٚ کوردایه دوەلاتـیٚ فارسیدە ـ ایران دە • وەکـە :ـ رامهورمز ـ رامئەحمەدە• • ع (المنازل والمحال للاکراد) •

(ران) ـ دلاشیٚ مرۆڤ وتـــەبادە ژچۆکیٚ تا کولیمەکێ ناڤیٚ وی رانە ـ رەهنە • رانیٚ بـــارام شکـــەستییە ـ شـــکایە • وهارەنگەدوان تشتیٚ کـــۆ وەکە مرۆڤ وتەبا بن • وەکە وینە وتمثال • ع (الفخذ) •

(رابواردن) ـ دەرباسکرنە •رەوشیٚ بمێریٚ خـــوەرە گـــەلەک رابواردیە ـ یانی گـــەلەک ستوخواری دەرباس کـریە ـ زمێژڤە ئەڤ ستوخواری ژێرە کـــــریە • رابوێــرە ! ـ دەرباسکە ! نایٚ رابـواردن ـ نایٚ دەرباسکرن • ع (الادارة ـ المداراة) •

(رابون) ـ ژێدەریٚ تیٚنەپـــەرە • راکرن ژێدەریٚ تیٚپـــەرە :ـ بارام رابو ـ من بارام راکر • ع (القیام بنفسه) •

(رابەزانـــدن) ـ رابونـەهـەڤـە ـ هێرشیبەهەڤدانە • جارنـــا بداخوازا (دارەڤاندن) تـیٚ :ـ بارام رابەزی ـ مـــن بارام رابەزاند • یانی وساکر کـۆ برەڤی ـ ببەزي • ع (التغلب علیه) •

(راپێچان) ـ بارام خوە راپێچـــا ـ زەندوبەندیٚ خوە هلکـــرن وکنجیٚ خوە ل خوە پێچان • :ـ خوە راپێچن ژبۆ شەر • ع ( الاستحضار الشخصـــي والتهیء) •

(راخستن) ـ درێژکرنا تشتەکـــی لسەرریٚ قادیٚ ، یالســـەر تشتەکی :ـ ڤیٚ مەرشیٚ راخە. ڤا کنجا راخە ـ لسەر تشتەکی خە ـ لسەر تشتەکی دەینە ـ رایخە ـ راێخـــە • ع (التفریش) •

(رادان) ـ ( دان ) • بـــــارام جاویٚ خوە دایە ـ بارام جاویٚ

خوه رادایه • یاني بدرێژی ـ دەمەکە درێژ تێ دە هەیـە • بەلام داین ـ فەگەر تــێ دە نینە لێ رادان بفەگـــەرە • لنگێ خوه رادە ـ زەندا دەری رادە • ع (عطاء مع الرجوع)•

(رازان) ـ خەوتن ـ نفستن ـ نوستنە• وادیارە دکۆکا خوەدە ژبــۆ ژنا آفس رە هاتیە گــۆتن ـ رازایە ـ زانەکە بـدرێـژی ـ بدوري یە • لێ فێ پاشـیـێ بویە بداخوازا خەوکـــرن ـ خەوتن • بارام رازایـــــە ـ خەوتیە • بەلام نفستن راستە• ع (النوم) •

(راشداندن) ـ بداخوازا خورتکـرن وآسێ کرنە • بارام بارێ خوە راشداند ـ گەلـەك شداند • بەلام (شد) ژعربي هاتیە • ع (التشدید) •

(راقەتاندن) ـ ژهەف قەتاندنە • بارام وفەرهاد ژهەف راقـــەتیان ـ ژهەف جیا بون ـ ژهـــەف فەقەتیــان ـ دوری هـــەف چون • ع (الانفصال) •

(راکەتن) ـ رازان وخەوتنە • بارام راکەتیـــە ـ دخەودایـــە ـ نفستیە :ـ

بسەرێ چیایێ بلند کەتم
خەوا من هات ئەز راکەتم ••

(راکرن) ـ بارام رابو ـ من بـارام راکر • راکرن ژێـــــدەرێ تێ پەرە • ع (رفع الشیء) •

(راکێشانـــــدن) ـ راکێشانـــە • ژ(کشاندن) هاتیـــە • تـێ دە زۆر وخورتي وچـاف سۆري خویادکی • بارام کەچـــــا فەرهاد راکشاند ـ راکێشا • بزۆر بر • ع (الاغتصاب) •

(راگەراندن) ـ داگەراندن • دەمـــا دو مرۆف لسەر تشتەکـــــي شەرێ هەف دکن ویەکی دی وان لهەف تێني ئەو مرۆفـێ سیەمین دبێژی :ـ من ژسـەر هەف راگەراندن ـ فەگەراندن

بارام ریا خوه ژسەر مـــــه
راگەراند ـ یانی دچەم مـەرە
نەهـات • ع (الانحـــــراف
والتراجع) •

(راگرتن) ـ بـارام برایـێ خـــوە
لـهەڤ راگرتە • یانی ناهێلی
یەکیتیا وان بشـــکێ • ادارا
وان خوەش دکی • بارام ایلا
خوە لـهەڤ راگرتیە • بـارام
گوندێ خـــوە راگـــرتیە •
خوەدێ وەلـهەڤ راگری !
ع (الادارة ـ السیاسة) •

(رامان) ـ فکرە • لێ دهن نفیسارێ
عثمان صبـری دە من (رامان)
خوندی‌یە • عثمان ، کرنـــا
بۆری زی زڤی زێـــدەری
چێ‌دکی • رامیایە •
ع (الفکر) •

(راهەژاندن) ـ ژهەژ ـ هەژانـدن
دەرکیە • هەژاندنا خورتە •
ژهەڤ راهەژینە • گەلـــەك
بـهەژینە • ع (تحریك الشیء
بشدة) هز الشیء بشدة •

(راوەشانـــدن) ـ وەشـــــاندن ـ
راوەشاندن • بارام بـــــدارا
راوەشاندە فەرهاد • یانـــــي
لسەرهەڤ دار وەشـــــاندن
فەرهاد • ع (اهال علیـــــه
بالضرب) •

(راناو) ـ دشـــیوەیێ ســـۆری‌دە
چێکرۆخە ـ هاتیە چێکرن ـ
چێکراوە • بداخوازا (بەرنافە)
بەلام نزانم چاوا ئەڤ (زاراڤ)
دروست کرنە • (را) دیارەکۆ
آلافەکە تێ‌دە هنك بلنـــدی
ودرێژی هەیە لێ چە گـرێ
دناڤ بەرا ناو ـ ناڤ و(را) دە
هەیە؟ هەروەکو دیارە ( را )
جهـێ پێشـس وشـون وبـەر
ناستێنی • ع (بمعنی (بەرناف)
ـ الضمائر) •

## ( رە ـ آ )

(رەما) ـ یان (رەمان) ـ ناڤێ ایلەکە
کوردە ،بـمێرای دەنگ دانە•
آغایێ رەما هەمی بدەســـتێ

دژمن هاتنه کوشتن •
سەرپێهاتيێن رەما دتاريخا
جيرۆك و سەرپێهاتييێ
کورداده دەولەمەند پايەدارن•
ع (عشيرة کوردية في لواء
ماردين) •

(رەشۆکا) ـ باقکک ژاێلا رەمانه •

(رەوا) ـ بداخوازا حەق هاتيه •
لێ گەلەك جاران حەق
دگەل‌تێ :ـ
ژخوەدێ نەرەوايه ـ نەحەقە•
ئەڤ نەرەوايه ـ نەحەقە •
نەحەق‌رەوايه ـ ئەڤ چه
رەوايه ؟ ـ چەحەقە ؟ •
ع (الحق) •

## ( ره ـ ئه )

(رەشۆکە) ـ رەشۆلە ـ زەرزورە •
دەرباس بويە •دژمنێ کوليێنە.

(رەندە) ـ پاقژکرنا دارا يه • يا
نافێ وی آلافێ کۆ پێ دارا
پاقژ دکن ـ رەندەشه •
ع (المخرطة) •

(رەمتەلە) ـ رەوتەلە يه • مرۆڤێ
آقل سڤك وبێ رومەته ـ
بێ‌قيمەته •

(رەوتەلە) ـ رەمتەلە • ئەومرۆڤێ
سڤك وتەوتەوه يه •
ع (خفيف العقل) •

## ( ره ـ ئۆ )

(رەجۆ) ـ نافێ بازارەکی کوردە ،
بجوکە •ل(چيايێ کورمانجا ـ
کورداغ) راژۆرێ بازارێ
(حەلەب)دکەڤي.دڤي چياييدە
سەدوسی هەزار کورد هەيه •
ع (مدينة کوردية شمال
حلب) •

## ( ره ـ ئي )

(رەحمي) ـ نافێ شاعرەکي کوردە•
عبدالرحيم رەحمی • بەری
چەند سالا ل‌آستان بۆلێ مر •
ديوانا جزيری وی چاپ کريه،
•ع (شاعر کوردی) •

(رەڤی) ـ رەمي • دآگردە تێ گۆتن
:ـ رەڤيا آگر ـ رەميا آگر ـ
پێت وپێلێ آگرن •

:ـ رەمانی آتران کوژان ...
دبي ئەڤ (رەمان) رەمي ـ رەڤي
هاتبـي ، يـان رەڤی ـ رەمی
ژ(رەمان) هاتبن • ع (اللهيب)

(رەڤي) ـ ناڤێ نفشەک صابونە •

(رەمی) ـ وەکە رەڤي يە •

(رەحتی) ـ نەرحەتی يە ـ رەنـج
وتعب وزەحـمـەتی يـە •
ع (التعب) •

## ( ره ـ ئێ )

(رەشێ) ـ ناڤێ ژنایـە • ژرەش
هاتیە • رەشۆ ناڤێ مێرایـە •
(رشوێ داری) چێرۆکەکە •

(رەڤێ) ـ ناڤێ ژنەکێ يە • ژرەڤـ
بازدان • هاتیە •

(رەوشێ) ـ ژ رەوش هاتیە • ناڤێ
ژنایە • رەوش دکۆکا خوەدە
مـەنزەرە ـ منظرە • لـێ
ددەستورازمانێ کوردی دە مە
کریەناڤ ژبۆ (حال) •

(رەپ) ـ راکری ـ بەل ـ بلندە •

وهارەنگە (رەپ) دەنگێ لـێ
دانێ يـه :ـبارام گۆ رەپ
ودارەک لسەرێ رەوشێ دا•
ع (کلمة صوتية بمعنى الضرب)

(رەپرەپ) لێدانا لـسـەرهەڤە •

خانیێ خوە رەپرپاند • چـالا
خوە برەپرپێنە • بارام ژنـا
خوە رپرپاند بدارا لێخست ،
کـرکـۆ رەپرەپ ژێ بێ •
ع (کثرة الضرب) •

(رەحت) ـ رکێ راحەتە • دبێژن :ـ
ئەز ایرۆ رەحتم • يانی نـە
رحەتم ـ گەلەک رەنـج
وزەحمەتـی من دیـە •
ع (المتعب) •

(رەخت) ـ ژچەرم چێدکن مێر ـ
شەرڤان فیشەکێ خوە دخنێ:ـ
بارام خوە درەختادە راپێچایە•
ع (المحزم) •

(رەوت) ـ دکۆکا خوەدە شڤێ تەرن
کۆمرۆڤ دکاری پێ ل سەوالا
خوە بدی ـلدژمنێ خوە بدی.

ژدار زراڤتره‌ولێ ڤێ پاشيێ بويه بداخـــوازا ( ترس ) • دبێژن :ــ خويايه تو ره‌وتا دم دفرێني •يانى م دترســێني • ئه‌ژره‌وتا ناترسم • ژبـه‌ركـۆ دلێدانا ره‌وتێ ده ترس هه‌يه • ع (الخوف والسياط) •

(ره‌نج) ــ زه‌حمه‌تى ــ زه‌حمه‌تكێشي يه • ره‌نجبــه‌ر ئێ كــۆ زه‌حمه‌تكێشه ــ دبێژن كــۆ مرن هاتيه ســـه‌ر گوند • ره‌نجبه‌رێ مالێ گــۆ ئــه‌ز حازرم . ع (بمعنى التعب) •

(ره‌خ) ــ يـا روخ • آلي ــ لاي ــ طرف • بارام لڤى ره‌خێ آڤێ يه • گوندێ وه لوى ره‌خي يه ــ لوى ملي ــ آلي ــ لاي يه • ع (الطرف) ــ الجانب •

(ره‌خ) ــ ناڤــێ گه‌رناســـه‌كى سه‌دره‌نجه • به‌لام وا دياره ژداخوازا مل ــ آلى ــ طرف• هاتيه • ژبه‌ركۆ ئه‌ڤ بـه‌ركێ ژهه‌رچار ره‌خێ سه‌دره‌نــج پێڤه نكاري بگه‌ري • ژله‌ورا ناڤێ وى بويه ره‌خ • ع (احد ابطال الشطرنج) الذى لايجوز الا ان يمر في الاطراف •

(ره‌د) ــ ناڤێ چه‌مه‌كى يه • ژچه‌ند آڤێن تێكه‌لاو پێك تێ و تێكه‌لى چه‌مێ جــه‌قجه‌ق دبــي وبه‌هه‌ڤره ــ تێكه‌لاو دكه‌ڤن ناڤ چه‌مێ خابور ــ فه‌رات ــ شطالعرب • لژێرێ باژارێ (قامشلوكێ) دكه‌ڤي • ع (نهر في لواء الجزيرة ) •

(ره‌واد) ــ ره‌وادي • ناڤێ ايله‌كــه كورده ، ناڤداره •ده‌ره‌به‌گي يه‌ك مه‌زن لدارخـــــتنه (راوه‌ندى) ژى هاتيه گۆتن • ع (عشيرة كوردية قديمة) •

(ره‌وه‌ند) ــ يا ره‌وه‌ندى ــ راوه‌ندى • ايله‌كـــه كورده كۆ باڤێ (سلطان صلاح الدين) • ژێ ده‌ركه‌تيه • فرمانداريا ده‌يسم كورێ ابراهيم كورێ حســين ئێ كوردى نه‌ژ ڤێ ايلێيــه •

بەلام ژ(رەواد ـ رەوادی) یە٠ راژۆرێ کوردستانا بن‌دەستێ ایرانـــه ٠ کوردســـتان وآزەربایجان دبن دەستێ وی دە بون ٠ ع (عشیرة كوردية).

(رەز) ـ لجەم کورمانجا هەر تەنێ نافێ باغێ تری‌یە ٠٠ ع (الكرم)٠

(رەگەز) ـ وەکو خویـــا دکی :ـ (رەگ ـ رەهـ ـ داماره)٠بەلام (ز) ژ کوهاتیە نزانم ٠بداخوازا کۆك وبن‌گەهـ وئەساســـه ٠ (الاصل والجذور) ٠

(رەواندوز) ـ (دز) بداخوازا کەلەـ قلعة ٠ هاتیە ـ دزدار ـ حاکم القلعة ٠ بەلام دز بـــداخوازا تالانکەرێ بدزی ـ نەبەرچاف زۆر دەرکەتیە ٠ ژبـــەرکۆ کـــوردێ ناف دزە ـ دژە ٠ دزی دکرن ـ تالان درەڤاندن ودکـــەلەهـــا دە آسێ دبون بەرەبەرە نافێ وان بویە دز ٠ وتەڤایی بویە ٠ دزە ـ دژە ٠ ع ( الحصن ـ القلعة ـ قلعـة

روان ـ مدينة كوردية شـمال اربيل ) ٠

(رەنجبەر) ـ کارکەرێ مالێیـــه ـ ئێ‌کۆ رەنج ـ تەعب ٠ هەمـو لسەر ملێ وی‌یە ٠ رەنجبەر دبێژن :ـ خوەزی ببوما کـەر ونەبوما رەنجبەر ٠ع (الخادم)

(رەش) ـ ناڤداره ٠ رەنگەکە ٠ بارام مو رەشە ـ ایشەڤ شەڤ‌رەشە ٠پەردا رەوشێ رەشە ٠ بەختێ کورد رەشە ٠ ع (السواد) ٠

(رەخش) ـ هـەر تەنێ دچیرۆکـێ روستەم دە نافێ‌رەخشێ‌بەلەك هاتیە ٠کۆ نافێ هەسپێ وی‌یە٠ ژێ پێڤه مـن دکـــوردی دە نەبهیستیە ٠

(رەفش) ـ دتەڤنێ دە آلافـەك بڤی نافي هەیە٠دارەکە پانە درێژە٠ دخن ناف هەردو (گـوردا) ٠ ع (آلة تستعمل في النســيج اليدوي ) ٠

(رەفش) ـ کەڤرەکی پانە ٠ زارۆك پێ دلیزن ٠ هن دبێژن :ـلاك

• لاكێلـــەبۆ • نافـێ وێ لیستكێیه • دبەرره بەســـته دبێژن :ـ لاكـــێلـــەبۆ ـ سیرماچەبۆ •••

(رەوش) ـوەكو خویا دكی بداخوازا (منظرە) ـ رەوشا ســـوارا ـ رەوشا پەیا ـ ئەگەرتو ڤي كاری بكی وێ رەوشا تە ژتە بكەڤي؟ لێ مە رەوش دجهێ (حال) دە داني‌یە • تەماشـــا بكە ( آوا ودەستورا زمانێ كـوردی ) • ع ( المنظر والحال •)

(رەف) ـ ژ(كەوت) مەزن‌ترە • وژ (غولغـــوله) بچـــوكترە • دچڤیك وچوكا دە ـ دســوار ویبا دە تێ گۆتن • ئەم كارن دفرۆكا دە بێژن • ع (السرب)

(رەڤ) ـ بەزە • بەلام بەزا بترس ژبەر دژمنە • بارام ژبـــــەر دژمن رەڤیا ـ رەڤا زێدە ژبۆنا چی‌یە ؟ ڤێ شەڤێ ڤێ رەڤـێ فاتـــەپیرێ مێرەك دڤـــێ • (رەڤاندن) ژێدەرێ تێیـــەرە •

رەوشێ رەڤیا ـ من رەوشــــێ رەڤاند • ع (الهزیمة) •

(رەق) ـ نافێ تەباكی آڤێیه • وەكە كیسۆ یه ـ وەكی كیسەله یە• ع (سلحفة) •

(رەق) ـ هشكە • (تورەق) دشیوەیێ هەولێرێ دە توێ هشكن • وا دیـــارە كۆ ژدەنگێ رەقرەق دەركەتیـــه •چەجهـێ كـــۆ رەقرەق ژێبێ ئەو جي هشكە •كورمانج ژی دبێژن :ـ ئەڤ ئەردێ مە رەقرەقۆنكی یــه ـ رەقرەق ژێ تێ ـ هشـــك • ع (جامد) •

(رەق) ـ دەنگـــێ لێدانا لتشتەكي هشكە ـ وشـــكە •رەقرەق ژێتـــێ ـ دەنگ ژێتـــێ • (رەقین) ژێدەرە • رەقین ژێ هات •ع (صوتیة) •

(رەقرەق) ـ وەكە رەق ـ رەقـــین دەنگی‌یە • بەلكي زێدەترە • رەقرەق ژهەورا تێ ـ دەنگێ رەقرەقە • ع (صوت الرعـــد

وغيرها فيها الشدة ) •

(رەواق) ـ نزانم ژكو هاتيه • بەلام رەواق الاكراد لشارێ قاهرة ـ لمصرێ دخوەندەگها ئەزهەر دە ، ژخوەندڤانێ كوردا رە ، بدەستێ كوردەكي جامێر هاتيه ڤەكرن • خوەندەوارێ كورد دكارن بێپارە ـ بێهەمبــــەر تێدە بخوێنن •

(رەشبەلەك) ـ نفيسار ونفشـــتن • سەيـــداێ مەزن ـ (خاني) د(نوبهــارێ) دە گۆتيه :ـ

ـڤان چەند رەشبەلەكا ـ بەلام (بەلەك) ئەوە كۆ زدو رەنگا يێك هاتبي • گايێ مە بەلەكە• يارەش وسپي يە ، يا ســـۆر وسپي يە ، يازەر وسپي يە••• هەر دبي سپي دگەل رەنگەكي دي بي •دڤردە دەما دبێژن :ـ رەشبەلەك • ئەگەر نفيســين ب حبرارەش بي • لێ كـــۆ ب حبرا سۆر • شين ، زەر بي وێ چاخێ دبي نەرەشـبەلەك بي • بەلام ديارە كــۆ دوێ چاخێ دە(حبر) زێدە رەش بو• ژلەورا بويـــە رەشبەلەك • ع (الرسالة ـ رسائل) •

(رەڤاشك) ـ آلاڤەكە • پێ تشـــت درەڤشـــێنن ـ دخەرتێنن ـ رێژدكن • پاقژ دكن •

(رەواك) ـ چەند تەژن ژمو چێ دكن د(كۆنا)دە لهاوير(كۆن) بخرارا ددرون • رەواكە ژێ تێ گۆتن•درۆژێ با وبارانا دە رەواكا داتێنن ـ بكۆنڤــــە گـــرێددن • دهێڤێــزن • ع (قطعة من نسيج الشــــعر يشــــدونها حول البيت ـ حول خيمة ـ خيم ) •

(رەورەوك) ـ بچوكێ رەورەوە ـ لەيلانە ـ ژدورڤە وەكە دەريا ـ وەكە آڤ خويادكي ، بــــەلام دەرەوە ـنەراستە•ع (السراب)

(رەوتەل) ـ مەزنێ (رەوتەلە) يە • بەلام دشيوەێن كورمانجي دە هەرتەنێ رەوتەلە خويادكي •

دەرباس بویــــه • مرۆڤــێ
سەرسەری وبێ آرمانج وكاره.
هن دبێژن :ــرەمتەل ــرەمتەله
•بداخوازا رەوتەله ــرەوتەل•
ع (بدون عمل وبدون اقارب) •

(رەبەن) ــ عەڤداله ــ دبي ژ(راهب)
هاتبي ــ رەهبەن ــ رەبــەن •
بێمال ومندال • ئێ كۆ دكەڤن
دێرا ــ دكەڤن كەنشــــتا •
ع ( بدون مال ومنال ) الـذي
حرم الدنيا على نفســـه وترك
ملذاتها وســـكن في الكنائس
والاديرة ) •

(رەپن) ــ ئەو قادا كۆ باران لێ جی
ناگري ــ هنك هشكه ، گەيا
لێ شين نابــي • دبي ژ(رەپ)
بداخوازا بــەل ــ هنك بلنـد
هاتبي • ع ( المرتفعات الصغيرة
من الارض ) •

(رەوان) ــرۆح ورەوان لبەي هەڤ
تێن :ــ رۆح ورەوانا منحبيب•
ديســـا بتەليســا رەقيب
رەنجيدەكر مسكين غريـــب
تەركا دلێ احبابى دا•••
ــئەوجانێ كۆ دروي ــدگەری
دلاشدە راناوەستی • گۆيـــا
دەما مرۆڤ خەونا دبينى ئـەو
رەوانه دچي ، دگەری •بەلام
باوەرناكم•ع (الروح السيارة).
(رەوان) ــناڤێ وەلاتەكی یه :ــدەشتا
رەوانێ ، كــــەلا رەوانى •
رەواندز • دبي كەلا رەوانێ
ــرەواندز بي • دەشتا رەوانێ
ــ دەشتا رەواندز بي • بــەلام
رەوان ــ أران ــ أريڤـــــان ــ
يەريڤانــــــه ــ ئەرمینیا يــه •
ع ( اسم قديم لارمينيا الحالية
و اسم لقلعة رەواندز) •
(رەوان) ــ رەهــــــوان ــ رێڤان ــ
رێوی ــ رێونگیيه • زســـوار
وژهەسپێ چونخـــوەشرە تێ
گۆتن•بارام سوارێ هەسپەكی
رەهوانه ــ چونخوەشـــــه •
بلۆق دچي ســـــفك دگهێ
قوناغێ زبـــۆ بەريـــــدبرن ،
پوستەچي بو • ع (الفرسالذي
يهرول في مشيه) •

(ره‌وشه‌ن) ـ رۆنی ـ رۆناهی یه :ـ
شه‌بي قه‌دریٚ لمه ره‌وشه‌ن‌که
تو رۆحـــی وه‌ره خوه‌ش •
پاشیٚ بویه نافیٚ ژنا ـ ره‌وشیٚ
نافیٚ گه‌رناســـــا چیرۆکـــا
(ره‌شویٚداری) یه •(ره‌وشه‌ن)
کـــــه‌بانی‌یا میرجـــلاده‌ت
عالى بدرخانه•هۆزانه‌که‌کورده
•دته‌رجومه ده ده‌سته‌کی دریٚژ
هه‌یه •ل‌شام رودنی ع (الضياء
والنور والمعرفة ) •

(ره‌ه) ـ داماریٚ لاشیٚ جاندارن :ـ

ره‌هیٚ ناف ملیٚ بارام دهه‌ژن •
بارام ره‌هیٚ ناف ملیٚ فه‌رهـاد
قه‌تانـــدن • ره‌هیٚ دلیٚ بزدۆ
قه‌تیان • دئیٚ دارا ده په‌نجن:ـ
ره‌هیٚ داریٚ ـ په‌نجکـیٚ بنـیٚ
داریٚ نه •داریٚ ره‌هیٚ خـوه
به‌ردانه ـ په‌نجیٚ خوه بـه‌ردا
نه • به‌لام دفـرده (ره‌ه) تـیٚ
گۆتن :ـ داریٚ ره‌هیٚ خـــوه
به‌ردانه • ع (الاعصاب) •

(ره‌ه) ـ ریشه • ره‌ها مه‌لیٚ دریٚژه
دفرده ژی (ره‌ه) گه‌له‌ك جارا
تیٚ گۆتن •ره‌هـــــا کانۆ •
ع ( اللحية ) •

(ره‌که‌ه) ـ قه‌فه‌سه • ره‌که‌ها که‌و ـ
ره‌که‌ها شیٚر • ع (القفص) •

(ره‌وره‌و)ـ مه‌زنیٚ (ره‌وره‌وك) • •
ده‌رباس بویه • ع (السراب) •

## ( ر ـ آ )

(رشتا) ـ ژهه‌فیر چیٚدکن • بکیٚریٚ
دبرن • خوارنه‌که کوردی ـ
کورمانجی‌یه • ع (نوع مـــن
الاكل ) •

(رقا) ـ یان (ردقا) • نافیٚ بازاره‌کی
یه لسه‌ر چه‌میٚ (فه‌رات)لهیٚلا
جزیریٚ یه • لباکـوریٚ ویٚ
گه‌له‌ك کورد هه‌نه • چـاوا
دناف بازیٚر ده هن کورد په‌یدا
دبن • ع (المدينة المعروفة) •

(رها) ـ رحا ـ ئورفا • بازاره‌کـــی
کورده دنافبـه‌را ( آمـــه‌د ـ
دیاربه‌کر) و (حلب) ده‌یـه •
خه‌لکیٚ ناف بازیٚر وهاویــــر
کوردن • ع (مدينة الرها) •

## ( ر ـ ئه )

(رزده) ـ ئەو رێزەبەردێ ـكەڤرێ کۆ دنەوقا چیا دە خویادکن • بخوه هاتیەچێکرن • ژ رێز هاتیه • ع (الصخور الطبيعية المكومةفيوسط الجبالواعاليها)•

(رشمه) ـ سەرگۆشه ـ دەزگین ـ هەڤسەر ـ هەڤسارە • رشمه ودۆخرشمه • دۆخرشمه ئەوبەنێ سەر رشمێیه •بەلام (رشمه) ئەو زەنجیر وبەنێ کۆ دخن سەرێ سەوالێ سواربونێ•برێ جاران ژهاسن چێدکن • ع (الرسن) •

## ( ر ـ ئي )

(ربی) ـ سەد فلسێ هندی نه •بەلام لسەر (ربی) بکوردی هاتیه نڤیساندن :ـ یەک ربی ـ دو ربي •••وا دیارە کۆ هژمارا کورد وفارس وئەفغان وهندستان یەکه • ژلەورا ئەم کارن بێژن :ـ کورد پسمامێ هندۆس و فارس وئەفغان وبلوجه • ع (نقود هندية) •

(رژي) ـ یان رژو • آگرێ کۆ رەش دبي ـ دبي وەك کۆمەر • ژرەشي هاتیه • ژبەرکۆ رەش دبي •
ع (الجمر الذى يتفحم بين الرماد) •

## ( ر ـ ئێ )

(رسینێ) ـ گوندەکه • لناڤ ئۆمەریا دکەڤي •

(رندێ) ـ ناڤێ ژنایه • ژرند ـ جوان ودەلال ونازدار وخوەشك دەرکەتیه •رەوشێ رنده ـ هەمو پەسنێ جوان تێ دە هەیه • کورمانج دبێژن :ـ رندەکه وگوندەکه • یانی بگوندەکی رندەك هەیه •

(رکێ) ـ گوندەکه • لناڤ ئۆمەریا دکەڤي •

•••

(رباب) ـ آلافه‌كـي سازبه‌ندى‌يه • كه‌مان ـ كه‌مانچه • يه •

ع (الكمان) •

(رب) چاريـــك ـ چاريه‌كــه • ژچارا يه‌كه • ژ(ربع) هاتيه • وهاره‌نگه (رب) نافێ چه‌رخي ـ فرنـــگ ـ (ه) فلســه • ژزيڤه • ژنێ كوردا ددانــه سه‌رێ خوه • بجێنيكێ خوه فه‌دكرن ،د خستن گه‌رده‌نـا خوه ـ ستوێ خوه :ـ

م‌گه‌ورێ دى‌بول‌بەر قوبـــێ
سه‌ر بزێرێ ستو بربێ •••

ئه‌ف ژى ژ(ربع) هاتيـــه • ژبه‌ركۆ ربا مه‌جيدى بو •

ع (الربع) •

(رست) ـ رسته‌ك زێر ـ رسته‌ك مۆرى ـ رسته‌ك گه‌وهه‌ر • ئه‌و تشتێ بدارڤه‌كـري نه ـ رست نافێ به‌نه‌كى موينى‌يــه پێ كۆنا گرێ ددن • ژ رستن هاتيــه • ژن مـو درێسـن ـ هرى‌يێ ، په‌مبو درێسن ـ باددن • ع ( بمعنى التنظيم) •

(رباس) ـ نافــێ گــه‌ياكى يه • ل‌زۆزانا شين تێ كورمانـــج دخون وگه‌لـــه‌ك په‌ســنێ وى دكـــن • بــه‌لام مـــن نه‌خواريه • ع (اسم نبـــات معروف في الزوزان يأكلونـه ويفضلونه) •

(رساس) ـ ژعربى هاتيه كوردى • لێ نزانم ژكو هاتيـه عربي • ته‌نێ نه‌وه‌كـــه عربـي يه • پاخه‌ره‌كه • گُولێ تفنگا وهن تشتێ دى ژێ چێدكـــن • (ده‌فێ برساس) بناف وده‌نگه • زارۆك كابه‌كه مه‌زن قـــول دكن ورساس دخن ناف وى• ژمێـرێ چـێ ره دبێـژن :ـ ده‌فێ برساس • ع (الرصاص)

(رند) ـ جـــوان وده‌لال و بــــاش وقه‌نجه :ـرنده‌كه وگونده‌كه. حه‌زرۆ بشه‌وتى بكانيا زوغر •

مآف فەخواری بكۆدا چەرخێ
بتاسا صفر •

مەيمۆ (رندە) چبكم شغول ••
گەورێ (رندە) چبكم شغول••
ع (الحسناء الجميلة ) •

(رزگار) ـ رزگاري ژێـدەرێ وێ
يە • ع (النجاة والخلاص) •
(رمباز) ـ ئێ كۆ برمێ دبەزی ـ يا
رما وي وەكە بازكێ تەيــرا
لسەر ملێ وی خويادكـي ـ
يا رمكلە • ئێكۆ رمـــــێ
دكلێني • ع (الفارس الذی
يحارب الاعداء بالرمح) •

(رژ) ـ يا رژی • ئەو مرۆڤـــــێ
كۆبێ تەواش مايە • بــــارام
رژمايە • بێتەواشە • جارنـــا
لشونا بێكەبانی هاتيە • بارام
رژمايە ـ يانـی بێكەبانیيە ـ
ژناوی مريە ، يا نەلماله •
ع (بمعنى الفقير) •

(رژ) ـ رزك بچوكـێ وێيە •
نفشەك هزيــرن لچيـــا
شـين دبــن • ( عــژك )

وەكە رژك بەهيڤێ بێبـــەر
يا بەر تەحلن •

(رژ) ـ رژی • ئەو آگرێ كۆدبي
وەكە كۆمەر لێ نەكۆمەرە •
ع (النار التی تفحمت) •

(رك) ـ (عەكس وضد) ونەوەكـە
هەڤن • ژركێ بارام فەرهـاد
خوە سپارتە دژمن • بـــارام
ژركێ م رە ولۆ دكی • ئەڤ
هەردو آلاف ركێ هـــەڤن ـ
عەكسا هەڤن ـ ضدێ هەڤن •

ع (العكس والضد) •

(ركرك) ـ دبێـــژن :ـ ركرك
ژدرانێ بارام تێ • يانی سەرما
گرتيە ـ قوفليە ـ بوركركـــا
درانێ رەوشێ ژسەرما •

ع (قض الاسنان) •

(رشك) ـ وەكە رك • خانـــــي
دبێژی :ـ رشكا تەيە غيرەتـا
رەقيبان • دبي ژرەشـــك ـ
چاڤرەشي هاتبي • ع (الحسد
والغيرة) •

(رشك) ـ هێكێ سپي وكێچانــه • سەربرشكێ ـ رشك كەتــه سەرێ رەوشێ•هێكێ سپيانه• ع (بويضات القمل والبرغوث)

(رم) ـ بداخوازا (رمح) هاتيــه • رمباز دەرباس بويه • ژعربـي هاتيه ، بەلام گەلەك دكوردی ده خويادكی • ع (الرمح) •

(رم) ـ يا رمرم • دەنگه • گۆ رم وخوه دخانــی وەركــر • بو رمرما لنگــێ هەسپێ بارام • رمرم ژسەر خانی تێ • ع (صوت الاثر) • ووقــع الحوافر •

(رن) ـ دەنگێ زەنگل ـ ناقوس •• (تن) ژی تێ گۆتن • چـاوا دبێـژن :ـ رنـگ ـ تنگ ـ چنگ ـ شنگ •• ئەڤ هەمي دەنگن • (صـــوت الجرس غالبا) •

(ردوان) ـ كــەڤــــەبازاره‌كـی كوردستانێيه•ل‌ناڤ خەرزايه. آڤا ردوانێ تێ سەر چەمـــێ دجله • ع (مدينة كورديــة قديمة شەرقي فارقين) •

(رزين) ـ ژێدەرێ تێ‌نەپەره • رزيا ـ رزيايــــه ـ درزي ـ دێ برزی •••

(رزاندن) ـ ژێــدەرێ تێ‌پـەره • خەفتانێ رەوشێ رزيايــه • رەوشێ كراسێ خوه رزانديه• ع (الاهتراء) •

(رشوان) ـ ائيله‌كه كورده مەزنــه لەهێلا (مەلەتيا) دكـــەڤي • (رشوانێ) گوندەكـــه ل‌ناڤ ئۆمەريا دكەڤي • ع (عشيرة كوردية حول ملاطية) •

(رمان) ـ رەمي ـ رۆڤي وێتا آگره ـ رۆناهيا آگره • :ـ رماني آتران كوژان ••• ع (شعلة النار) أو لهيبها •

## (رۆ ـ آ)

(رۆژآڤا) ـ غەربه • ع (مغرب) •

(رۆژكا) ـ ناڤێ ائيــل ودەرەبەگي‌يا

وەلاتێ بەدلیسە • ایـــرۆژی ئەم ژوانرە دبێژن :ـ وەلاتێ روژکا • ع (الامارة الكردية المعروفة بامـــارة (رۆژكان) بدليس) •

(رۆما) ـ بازارەکـی نافـــدارە • دایتالیا دەیە ـ پای‌تەختا وایە • رۆم نافێ مللەتەکی کـەفنارە دتاریخێ دە نافدارە • شـــەر دناف بـــەرا وان وفرس دە گەلەك چێ‌بویە • قەیسەرێ رۆم وکەســرایێ عەجـــەم بدەنکن • ع (معروف) •

(رۆمانیا) ـ مللەتەکی گەردەن آزادە. دبالقان دە دژی • پای‌تەختـــا وان بخارەستە • ع (معروف).

## ( رۆ ـ ئه )

(رۆژنامه) ـ رۆژمار ـ رۆژمێرە • فارسي يه بەلام بویە تەفایێ • ع (التقويم) •

(رۆژنامه) ـ رۆژانـــە بکـــوردی نوهاتیە چێکرن • ع (الجريدة) •

(رۆله) ـ لاوە لێ بسۆرانی تەنـــێ هاتیە گۆتـــــن • (خانـــی) (دچیرۆکا) (مەموزیـــن) دە • (رەوالان) بداخوازا خـــۆرت گەنج ولاو آنیە • ع (الشباب ـ الشاب) •

## ( رۆ ـ ئي )

(رۆژی) ـ رۆژو • پارێـــــزە ـ پەهرێزە ـ پەرهێزە • خـــوە پاراستنا ژ خوارنێ لجـــــەم مسلمانا ، بـــەلام خوەپاراستنا ژخوارنا بتەواشە لجــــەم فلەها ـ لجەم‌دەکتۆرا • بەلام پارێز بڤێ داخوازێ نەهاتیـــە ژلەورا رۆژی ـ رۆژانـــــە پاراستنا ژخوارن وڤەخـــوارن بي راستە(پارێز) بـرۆژوشەڤە. بەلام (رۆژی) هەر تەنـــێ برۆژە • ع (الصوم) والامساك

(رۆڤي) ـ نافێ وی تەبایێ کـــۆ بـخاپ وفەن وحیلە نافدارە • فارس دبێژن :ـ روبا • ع (الثعلب) •

(رۆڤي) ـ دهندروێ زكێ جانـــدار ـ مرۆڤ وتـهبادە رۆڤـــــى هەنە • رۆڤيا مەزن ـ رۆڤيـــا بچوك ـ رۆڤيا زێدە •
ع (المصارين) •

(رۆمى) ـ كورد ژتركارە دبێژن :ـ
رۆمي • سەيدايێ خانــي ژى دبێژى :ـ ئەڤ رۆم وعەجەم
بوان حصارن •

كورمانجێ هــــەمي لچـــار
كەنارن •

ئەڤ قلزەمێ رۆم ويەحـــرێ
تاجيك

هنگى كۆ دكـــن خـــروج
وتەحريك

كورمانجێ دبن بـخون ملطخ
وان ژێك ڤەدكـــن مثالـــێ
بەرزەخ •••

(رۆني) ـ رۆناهــــــي ـ رۆناك •
شەوق وتاڤا رۆژێ يە ـ بەلام
هن تشتێ دیژى هەنە كـــۆ
رۆنى ددن وەك :ـ آگـــــر
ـ جەوهەر ـ ستێر ـ هــەيف
وبروسك ••• ع ( الضوء ـ
ضياء ـ بريق) •

## ( رۆ ••• )

(رۆ) ـ رۆژە ـ رۆكە :ـ رۆكا مە
هلاتى ژآليكـــــێ بلەيدارا •
:ـ رۆكێ وەر مالا مەيـــە •
رۆكێ لدرەوشـــــێ خستيە •
رۆكە مە و رۆكە وە •
ع (يوم) والشمس •

(رۆ) ـ ناڤێ چەمە ـ رۆبارە • چو
بآڤا رۆ دە ـ چو باڤا چــەم
دە • (رۆبار) ـ چەمێ بهـارا
يە ، يان چەمێ بارانێ يە •
ع (النهر) •

(رۆ) ـ دبانگێ دە آلاڤ ناڤەكە :ـ
رۆ رۆ رۆ !•• دبي ل شونـا
لۆ ! ژ بۆ مێرا هاتبي •
ع (أداة للنداء) •

(رۆژهلات) ـ ئەوجهێ ـ يا رەخـێ
كۆ رۆژ ژێ دەر دكەڤـي ـ
هلتێ • دهەمبەر رۆژآڤـــادە
هاتيە • ع (الشرق والمشرق)•

(رۆداج) ـ پاقژکرنه • ئەوروپي یه
بەلام بـمەکیناره کەتیه وەلاتێ
مه ـ کەتیه ناڤ زمانێ مه •
ع (التنظیف) •

(رۆخ) ـ رویه ـ رودێمه • گەزک
لەرۆخان دا ••• ع (الوجه) •

(رۆبار) ـ رۆیـــه ـ چـــەمـه •
چەمێ بهارا ـ یا چەمێ بارانـێ
یه • پاشێ بویه تەڤایی :ـ فی
رۆباري خوشه خوشه •
وێل بەر هاتي قال وقرشه •
مەمکێ گەورێ سێنێ ترشه••

(رۆژ) ـ ناڤداره دهەمبەر شەڤ ده
هاتیه • بەلام (رۆ ـ رۆژ) •
لشونا (یوم ـ شمس) تێن •
لێ گەرەرەکه ئەم وان ژهەڤ
بدن خویاکرن • یەکی بکـن
ناڤ ژبۆ (رۆ) ـیوم • ویەکی
بکن ناڤ ژبۆ (رۆژ ـ شمس)
چەندا هەردو ناڤ بـهـەردو
داخوازا تێـن • یانی (رۆژ ـ
رۆ) ناڤـن ژبـــۆ (شمس)
وهەردو دیسا ناڤن ژبۆ (یوم)•

ع (الیوم والشمس) •

(رۆل) ـ رۆله ـ رەوال • دەرباس
بویه • رەوال سەیدایێ (خانی)
دچیرۆکا (مەموزین) ده ژبـۆ
کۆما (رۆله) آنیه • خۆرته ـ
جوانه ـ گەنجه ـ لاوه •
ع (الشاب) •

(رۆم) ـ ناڤێ ملله‌تـــەکی مـــەزن
وناڤـــداره • دتاریخـــێ ده
دەنگ‌دایه • کورد ژدەستـــێ
رۆم گەلەک زیان وسەرگێژی
دی‌یه • گـــەلەک جـــاران
چەمێ (فەرات) سینۆرێ کورد
ورۆم بو • ایرۆ کورد ژترکێ
انادۆلێ ره دبێژن :ـ رۆم ـ
رۆمي • وادیاره ترکا جهـــێ
رۆمـــا کەڤـــاره گرتیـــه ،
وزۆرروزولما رۆمـــێ کەڤاره
بدەستێ خوه گرتنه •
ع (شعب معروف) •

(رۆن) ـ دهەمبەر تیر ده هاتیـــه •
خوارنا وه رۆنه ـ نـــەتیره •
یانی آڤا وێ گەلکه ـ زۆره ـ

پره • ع (المانع - السائل) •
(رۆن) - رۆنـك - بداخـوازا فرمێسك - حێستر • مەلایێ باتی دمەولدا کورمانجـی دە دبێژی :- رۆنکێ من بونـە رێز - رۆنکێ وی چێکـرن آف وحەری • ع (الدموع) •
(رۆن) - بداخوازا رۆناهی هاتیە :- دنیا هەیفەرۆن بو • یانـی تافەهەیف بو • نەرەش بو • ع (ضوء القمر) •
(رۆژین) - نافێ ژنایـە • ژ رۆژ هاتیە • یانی وەک رۆژ • یان ژ رۆ - ژین هاتیە • یـوم الحیاة - (رۆژا ژین) •
(رۆشتن) - ژێدەرێ تێنەپـەرە • بارام رۆیـی - ئـەروا - دەروە بداخـوازا (چـون - چوین هاتیـە بـەلام (شتن) جـۆن بویـە پاشـگرێ فـی ژێدەری • دکارن بێـژن :- (ن) نیشانا ژێدەرە • بـەلام (شت) ئەگەر دکرنێ دە هەبونا درست بو کۆبێ گۆتن کـۆ وەکە دۆتن - چاوا ژدۆشتـن دەرکەتیـە • لێ دکـرنێدە هیچ پەیدانابی • ئەگەر ژپاشیا کرنێ رابویە بۆچی دداویـا ژێـدەر دە مایـە ؟ دبـی ژ(نشتمان) - ئەرض • هاتبی ئەڤ ژی بمن نەخوەشـە •
رونشتن - دانشتن - رۆشتن• دهـەردوێ پێشی دە سـۆرا بداخوازا (قاد - ئەرد) شـت قەبول کرنە • بـەلام وادیارە ژ(نشت) دەرخستنە • لـێ لجەم من (ن) ژکۆکا گۆتنێ یە • دبێژن :- دانی - دانشت. بارام رونە - رونشت • دانین- دانشتن - رونان - رونشتن • چاوا (شت) بویە بداخوازا قاد - ئەرد نزانم • ع (القعود) •
(رۆمان) - نافێ چیرۆکـە • لـێ ژکو هاتیە نزانم •
ع (القصة) •

## ( رۆ - )

(روتا) - نافێ ایلەکە کـوردە • ل

دێرکا چیایێ مازی دکەفــي مالا (حاجی نەجیم) مەزنــێ روتا بــون • رەشیدکــورد خوەدانێ رێزماناکورمانجــی ژڤێ ائیلێیە • ع (عشــیرة کوردیة في جبل العفص غربي ماردین) •

(رو) ـ رودێم ـ روچك ـ روچ • (وجه) • بارام برویە بێئەدەبە ـ بێتۆرەیە • بارام بێرویە • شەرمیکارە • فەرهاد دورویــە ـ منافقه • ع (الوجه) •

(روت) ـ بداخوازا تازی ـ رەوسي هاتیە • بارام روتە ـ تازییە ـ بێمالە • (روتا) کۆ نافــێ ائیلەکەکوردە زڤردەرکەتیە • مریشکامە روتــە ـ رەوسیە ـ زەلوتە ـ بێپەروپورتـــە • روتکرن زێدەرێ تێپــەرە • بارام روت بویە ـ من بــارام روتکر • روتۆ ـ روتێ ـ •• بونە ناف ژ بۆ زن ومێرا •

ع (عریان) ـ مجرد •

(رومەت) ـ بداخوازا شــەرەف ـ قیمــەت • هاتیــە • وادیارە ژ(رو) بداخوازا (رو ـ وجە) دەرکەتیە • بارام برومەتــە ـ بشەرەف وقیمەت ووەجــە • بەلام (مەت) ژکوهاتیە نزانم •

(روس) ـ ئوروس ـ مســقۆف ـ کۆرمسقۆف • نافێ روســیا سوفیاتی یە • دەرباس بویە • بەلام مسقۆف ـ کۆرمسقۆف دبي نافێ مرۆڤەکي بي کــۆ ( مۆســکۆ ) ـ پایتەختــا سۆفیتستانی لسەر نافــێ وی مرۆڤي بــي • (روسکێ) ژی هن دێــــزن • ع (روســیا السوفیاتیة) •

(روچ) ـ روچك بچوکێ وییە • بداخوازا (رو) هاتیە • بــەلام روچ ـ روچــك • تــێدە کیماسي هەیە • روچکێ بارام نەئێ خێرێ یە • ع (الوجــه القبیح) •

(روسار) ـ مرۆڤێ کۆ گونەهــەك

كريه وبۆشمان بويه • دبێژی :ــ ئەم روسارن •شەرمیكارن. یانی دناڤ خەلكێ دە روێ‌مە سارمایە• شەرم دكی قسەبكی. روساری زێدەرێ وی یــە • بداخوازا شەرمیكاری یە • ع (الخجل) ــ المخجل •

(روگــەش) ــ دلخــوەش ودەڤ لكەنە • بارام روگــەشە ــ دەڤ‌لكەنــە • روگــەشي زێدەرێ وی‌یــە • (گـەش) بداخوازا بەل بون وپشكفتنە• گ‍ل گەشــە ــ پشكفتي‌یە ــ بەل بویە • گەش ــ گەش‌بون ــ گەش‌كرن زێدەرن •

ع (البشاش) ــ المفــرح ــ فرحان •

(روڤ) ــ هن دبێژن :ــ بەرزك • ئەو مووێ كۆ دناڤ رانــێ مرۆڤا دە چێ‌دبن • بــەلام بەرزك فرەهترە • ژچـەرم رە زی تێ‌گۆتن بەرزك • ع (العنت) •

(روچــك) ــ دداباشــا (روچ) دە هاتیە گۆتن • بەلام گەرەكـە ئەم زانبن كۆ روچ ــ مەزنێ روچكــــە • تــەنــێ روچ نابێ گۆتن ــ روچك نافدارە • روچكــێ بــارام بێ‌خــیرە ــ (روچكاندن) رەوساندنـــە ــ روتكرنە ــ پەرتاندنــە • وێ زیاش‌ڤە بێ‌گۆتن • ع ( قـد مر بانها تأتی بمعنی ــ الوجـه القبیح) •

(رودێم) ــ كولم ــ دێم ــ رومەتە • ع (الخال والخدود) •

(رون) ــ بداخوازا نیڤشك ــ تەواش هاتیە • بەلام نیڤشك وتەواش هەریەك داخوازەك جیاواز هەیە • رون بداخوازا (سمن) هاتیە • (نیڤشك) نڤشەك ژ رونە • ع (السمن والدهن) •

(رونشتن) ــ دانشتنە • بەلام رونشتن نزم‌ترە ژدانشتن • (دا ــ را) دو آلاڤن ــ خوردەآلاڤــن • دوا دە بلندی هەیە ــ درێژی

هەیە • بێتر (دا) دانشتن ـ داخستن ـ داکەتن ـ دالەقاندن ••• بەلام (رو) ڤێ دەلامەتێ نابێني • چاوا دەرباس بویە دشیوەئێ سۆرانيدە ( نشت ) بداخـوازا قاد ـ ئەرض ـ وەلات هاتیـه • نشتمان ـ وەلاتێ مە • جێکرۆخە ـ هاتیە جێگرن • ع (القعود ـ الجلوس) •

## ( رێ ـ آ )

(رێچکاکادزا) ـ ل ئەزمانا هەـن ستێرێن هور وبرێز هەنە ژوان رە دبێژن :ـ رێچاکادزا • وەکە ریا ـ رێچا مرۆڤێ کۆ کا دزینە • زبەرکۆ مرۆڤێ کادز کا ژوان رێزدبـي ـ دکەڤي • ع (مجـرة التبن ـ المجرة النجمية المعروفة) •

## ( رێ ـ ئي )

(رێسي) ـ زگـەیا چێدکـن • بشیناهی گەیێ دچنن وبادِدن وزڤستانا ددن سەوال وپەزێ خوە • ع (مصنوع من حشائش الربيع لعلف الحيوانات) •

(رێشي) ـ گولك ورێشي بدەسمال وچەڤیا ڤە چێدکن ـ بپشت ورەخت وگەلـەك تشتێ دی ڤە خویادکـن • تایێ دەسمال وچەڤیا بادِدن وبەرددن • ناڤێ وان رێشيیە • بچـوکێ وی رێشیك هاتیە• ع (الشراشيب)

(رێڤي) ـ رۆڤي • بهەردو داخوازا هاتیە :ـ رۆڤي ئێ ناڤـدار ـ ڤەنەك • رۆڤـي • ئێ ناڤ زك ـ بئـورڤـە • زڤـان هەردوا رە تێ گۆتن (رێڤي)• ع (الثعلب والمصارين) •

(رێوي) ـ ئەو مرۆڤێ کـۆ بریا دە دچـي • بارام رێوییـە • مسافرە • بەلام دسۆرانـي دە رێوی ـ بداخوازا (رۆڤي) ـ ئەو تەبایێ ناڤدار • خاپینۆك هاتیە • (روبا) یە • رێوی ـ رێونگي بداخوازەکێ نە • ع (المسافر) •

(رێونگی) ـ بداخوازا رێوی هاتیه •

## ( رێ - ئێ )

(رێ) ـ نافداره ـ رێك ـ رێچك ـ رێبوار •. بهلام (رێبوار) گره‌که‌بداخوازا ئێ درێفـه دهرباس دبی • رێ دبوێری • ع (الطريق) •

(رێجێ) ـ ژدهرفه هاتیه کـوردی نافداره • دائراکه دهولهتـێ دبوارا (توتنێ) ده کاردکی • ناخوازی ژدهولتێ پێفه کهس توتنێ بکری وبفرۆشـی • کرینوفرۆتن بدهستێ مللهت قاچاغ ونهدرسته • ژلـهورا بدهستێ کێ بگری بگر تالان دکی • جارنا دخی زندانێ • ع (دائرة حصر الدخان) •

(رێناس) ـ رێبره • ئێ کۆ رێ ناسدکی •

(رێچهناس) ـ رێ شونـاسـه ـ رێزانه ـ رێ بهره ـ رێبره بداخـوازا رێناسـه • بهلام (رێـج) ژرێ بچوکـره •



ژلهورا گهره‌که رێچهناس • ژ رێناس زاناتربی • ژبهرکۆ (رێج) رێکێ بچوکن کـو دسهرێ چیا د دژواره مرۆڤێ کۆ نهرێچهناس بی ژهـهف دهرخی • ڤێ پاشیێ مه نافێ (کشاف) کربو (رێچهناس) • :ـ رێچهناسێ دێرسم وآگری وحهمرینێ ته مه •

ع (الكشاف) والدليل •

(رێج) ـ شوێبه • بچـوکێ وێ رێچك :ـ رێچکـا کشاف وخۆرتا یهکتی ودلپاقـژی • رێج ـ رێچك • ع (الأثـر والطرق التی مـن الصعب معرفتها) •

(رێخ) ـ ئهو پیسیێ کۆ ژ گـا وگامێش دهردکهڤی • هـن دبێژن :ـ ریخ • دبـی ژ رێختـن ـ رێتـن ـ رهتـن هاتبی • رێتن ـ رژاندنـه بفارسی رێختن • هن کورمانج دبێژن :ـ ریتن • ع ( روث

البقر والجاموس ) •

(رێبەر) ـ رێبـــرە • ئـــێ رێ
ناس‌دکی ـ رێ نیشاني مرۆڤ
ددی • گەرەکە (رێبر) بونا
لێ چما دبێژن :ـ (رێبەر) ؟
دبي (رێبەر) ئەو مرۆڤێ کۆ
دچۆلێ رە بـێ‌رێ دکـــاری
مـــرۆڤ دەربـاس کـــی •
ع ( الدلیل ) •

(رێبوار) ـ (رێوي) یەورێونگییە
•سترانەك ـبەستاك ـآواك
بڤی نافي ل ناف کوردێ مکریا
هەیە • ع (المسافر) •

(رێدور) ـ ئێ کۆ زهەڤدە کـــەتي
ونکاری بگهێ داوییا آرمانجا
خوە •
:ـرێدورۆ ـ کەسەرکورۆ !
دسترانا دە هاتیە • ع ( بعیـــد
الهـدف ) •

(رێبر) ـ رێچەبر • چونا بکورتی
یە • رێکورت کرنە رێبـــر
هەرە • یانی رێبرە ودچولێ
رە هەرە •ع (اختصار الطریق
او الذهاب بطریقة مختصرة ـ
الخروج عن طریقه ) •

(رێز) ـ ل پـــەی هەڤ ، یا لرەخ
هەڤ دانینە ـ ماینە ـراوەستانە
•(رێزە) ئەو آخاڤتنە کۆ چەند
پەیڤ لپاش هەڤ بآلیکاریـــا
تیا پێوەند رێز دبن • هـــن
دبێژن :ـ رستە بەلام رست ـ
رستە ـ رســـتن (تەنزیم) •
ع (الصف) •

(رێژ) ـ ژێ‌ەرێ وی رێژکرنـه •
تێ‌پەرە • رێژکرن پاقژکرنـــه
مالشتـــن ـ سرانـــدن ـ
بداخوازکێنـه • ع (التنظیف
والمسح )•

(رێك) ـ بارام وفـــەرهاد رێك
ناکەڤن ـ ل هەڤ ناکن ـ پێك
نایـــن ـ (صلح) ناکن • دبي
ژ(رێ) هاتبي • یانی دیـەك
رێڤە ناچن ـ ریا وان نابـــي
یەك • ناکەڤـن رێکـــێ •
ع ( الاتفـــاق والتعاضـــد
والصلح ... ) •

(رێل) ـ ئەو جهێ بدارو بەرن كـۆ مرۆف بدزوارى دكارى دناف رە دەرباس بي • ع (الأحراش والادغال والغابات )•

(رێئۆل) ـ بەرنامجا جڤاتەكـــــە كوردبو كۆ لناف كـــوردێ سوريــــە چێبو وناڤودەنگ دفرۆتن خـــەلكێ • ئـــــەف (رێئۆل) چاپبويـــــە هون دكارن بـخوێنن ؟ •

(رێزان) ـ وەكە رێناسە •زمرۆڤێ زانارە تێ گـۆتن :ـرێزان • دجهێ سياسىدە تێ خوياكرن بارام رێزانە ـ سياســيـيە • ع( الرجل السياسي الماهر من ذوي الخبـــرة والمعرفـــــة والادراك ) •

(رێزمان) ـ رشيدكورد ئەڤ ژ بۆ (قواعد) رە دانية • بەلام نەريا زمانە • يانى داخوازا (قواعد) ناستێني • ژبەركۆ ( قواعـــد ) نە (طريق اللغة) يە • بەلكى (آوا وبنگە ودەستورا زمانە)•

چاوا كۆ(رێئۆل)حسن هوشيار نە دجهێ وێ دە دانيە (ئۆل دين ومذهەبـــــە • (رێئۆل) طريق الدين والمذهب لـــێ هوشيار ( رێئۆل ) بداخوازا بەرنامج دانيە ـ دەستورا جڤاتا خوە داني يە • بەلام (رێزمان) لناف كوردێ عراقێ ژى بەلاف بويە • ع (القواعد) •

## ( رى ـ ئي )

(رى) .. ريش ـ رە • هرســـــێ بداخوازەكێ هاتە •ع(اللحية)

( رىسپي ) ـ مەزنێ مالێ ـ مـەزنێ بافك وائيلێ يـــــــە • بارام رىسپيێ مە يە ـ مەزنێ مە يە • ئێ كۆ رها وى ســـــپي بويە ـ مەزن بويە • ژلـەورا مرۆڤێ وى رومەتا وى دگرن وژخوە رە دكن مەزن • لـــێ بەرەبەرە بويـــە ناڤێ مەزنێ ائيلێ ـ مالباتێ مەگەر چـەندا بچوك بي رىســـــپي يە • ع ( كبير القوم ـ زعيمه ) •

(ری‌خۆله)ـ ئێ کۆ ب‌خوه ده ریخ دکی • گۆلکا ری‌خۆله • بزنا ری‌خۆله •••

(ریپۆ) ـ ئێ ریپا دکی • ع ( الحیال والخداع ) •

(ریپ) ـ خاپ وحیله نه • ریپۆ ئێ کۆ ریپا دکی • ع ( الحیـــل والخدع ) •

(ریس) ـ ئه‌و به‌ن ـ نه‌خێ کۆ هاتیه رستن • ( رستن ) بادانا هری ومو وبه‌مبو یه ••مه ریسێ خوه شاندیه بازێر • ع (غزل)

(ریش) ـ نه‌خوه‌شـــی‌یه‌که دکه‌ڤی لاشێ جاندار ـمرۆڤا •(ریشێ) گونده‌که ل‌ناڤ بارافایه •

ع (مرض خطیر یظهر احیانا في الانف والفم والاسنان‌والعظم یشوه المصاب) •

(ریش) ـ ب‌سۆرانی بداخوازا ری‌ره‌هه • هاتیه :ـ

ئه‌ڤ چه ریشه ئه‌ڤ چه شاشه؟

یا م به‌رده یا بتراشه

من تو ناڤێ والسلام ••••

ع (اللحیة) •

## ( ژا ـ ئي )

(ژاري) ـ هه‌زاری ـ نه‌خوشـــی وپه‌ریشـــانی یه ع (المرض المزمن ) •

(ژاژی) ـ تۆراق ـ ده‌وێ کیس ـیا ماستێ کیسه •شێروا ب‌خوارنا ژاژی ناڤ دانه :ـ

ژده‌ردێ شه‌ربه‌تا ژاژی مه‌دل تێکدا بوه که‌شکه

دترسم شـــێروی‌یه‌ك رابي مجالا خوه ل‌به ر خوه‌شکه••

ع (اللبن الناشف) •

(ژاندرمه) ـ جاندرمه • ژ ئه‌وروپـي هاتیه ـ ژ فرانســـي هاتیه •

(ژار) ـ ئێ هه‌ژار ونه‌خوه‌شـــه • (المریض المزمن) •

(ژان) ـ نه‌خوه‌شي‌یه • ژانازراڤ • نه‌خوشیا (سله) ع(مرض السل)

## ( ژی ••• )

(ژي) ـ زه‌ه • ژ رۆڤیا چێ‌دکن • گه‌له‌ك کار پێ دبن :ـ دخن که‌ڤانا ـ دخن چارۆخا ـ پـێ

تشتا گرێددن ـ ددرون •

(ژینداری) ـ ساغی‌یه •بارام ژینداره ـخوەدی ژینـه ـ سـاغه •
ع (الحیاة) •

(ژینگاری) ـ رەوشا ژینداری یه ـ رەوشـا حیاتا مروفـەکی ـ جانداره‌کی یه • ژینگاري‌یـا وەکه ژینگاریا بارام ناخوازم •
ع (الحیاة الاجتماعیة) •

(ژیر) بیرەوەر وزیرەکه •ع (الذکی)

(ژیندار) ـ خوەدی ژین ـ ساغه •
ع (الحی والاحیاء) •

(ژیرەك) ـ زیـرەك ـ زانـا وبیرەوەره • ع ( الذکي ) •

(ژیرك) ـ وەکه ژیرەکه ، بـەلام دفرده مەزناهي وسـەرمیاني هەیه • ژیرکێ مەیه ، یانـي زانا ومەزن ورێبەرێ مەیه •
ع ( الذکي ـ دلیل القوم ) • وفیها نوع من الزعامة •

(ژین) ـ ساغی‌یه ـ بەرخوەداری‌یه•
ع (الحیاة) •

(ژین) ـ نافێ رۆژنا ماکـه کوردی یه ل‌بازارێ سلیماني دەردچی •رۆژناما تۆرەڤان وهـوزایێ مەزن پیرەمێره • دفرده ژی بداخوازا (حیاة) هاتیه •

## ( ژێ • • • )

(ژێ) ـ بداخوازا هن ـ هاتیه (ژ) تیه‌که بداخوازا (من) ـ بعض هاتبه • دبي (ێ) بـەرناف بي (ژ ـێ) ـمنه •وهارەنگه نافێ تیا (ژ)یه • داخوازا دەستپێك و(هن) تێ ده هەیه :ـ بـارام ژکویه ؟ بارام ژزاخۆیـه • ئەف گەنم ژفي گەنمي‌یه ـهن ژێ یه •ع (بمعنی (من) حرف الابتداء ) •

(ژێهاتي)ـ پێ‌بوي • ئەو مرۆڤێ کۆ دکاری هـەمو کاری بکی ـ هەرتشـت ژێ‌تێ ـ پێ‌دبي •
ع ( فعال)کثیر الافعال ـبامکانه ان یعمل ـ أن یفعل کل شيء•

(ژێمایی) ـ دبێژن :ـوەره ژێ‌مایێ خوه ببه • یاني توبمري وئەف تشت ژته بمێني • ع (الترکة

- مخلفات ) •

(ژێکری) - ئێ کۆ هاتیە ژێکرن -هن مرۆڤا - تەبا ئەو ژێ کریە • ع (مقطوع) •

( ژێخواری ) - ئەو خوارنا کـــۆ بەری‌نها هنا ژێ خواری یە • دبێژن :- ئەز ڤینێ ژێخواری ناخوم • ع (المأكول منه ) •

(ژێبەردای) - ژناکـــۆ مێرێ وێ بەرددي • ع ( المطلقة ) •

(ژێدەر) - مصدرە • چێکرۆخە -نها هاتیە چێکرن • ژبەرکۆ کرن هەمو ژوی تێنە دەر مە ناڤـــێ وی کریە (ژێدەر - مصدر ) ل(آواودەستورا زمانێ‌کوردی تماشابکی - کۆکـــا کـــرن ووەشەیە • ع (المصدر) •

(ژێر) - دهەمبەر (ژۆر) دە هاتیە - بانـی - خـــــوار - راژۆر راژێر •••

:- هەردەم لژێرن - دژمن ل ژۆرە بەلام بزانە ئەڤ دنیـــا دۆرە ••• ع ( أسفل - تحت - جنوب ) •

(ژێبەردان) - ژێدەرە، چێکرۆخە- لێکدراوە - پارچیمــــە • ژێ بەردانە • تێ‌پەرە •بارام ژنـا خوە بەردا - من ژنا وی ژێ بەردا • ع (الطلاق) •

(ژێستاندن) - ئەڤ ژی چێکرۆخە پارچیمە - تێ‌پەرە • ع (الأخذ منـه ) •

(ژێخوارن) - خوارنا ژێ‌یــــــە - خوارنا ژتشتەکی یە • ( الاكل منە ) •

(ژێدزین) - ژێدزینا وی گەلەك دژوارە • ع (السرقة منه) •

(ژێڤەقەتاندن)- جدابون- جدوا بون - جیا بونە - جهێ‌بونـــــە • ( التفرقة والانفصال ) •

(ژێکرن) - ژێبررین - ئەوەکـــۆ مرۆڤ تشتەکی ژتشتەکی بکی ع (القطع) •

(ژێ‌کرین) - کرینا ژتشـــــتەکی ژمرۆڤەکی یە • ع ( الابتياع )

( ژ ـ ... )

(ژن) ـ ژ ژين ـ حياة ـ يان ژ(جن) دەرکەتيە • براستی ژن هـەم زين وهەم جنه • کانيا ژينـێ و وەکە جن بترسه • مرۆڤ نەوێری نێزيک ببي • کورد دزمـــــانێ خوه ده دەماژن بەرچاڤ ونێزيک بي دبەرناڤا دەـدروێ وێدە نابێژن مێ يە• يانی آلافێ مێ دگەل بەرناڤێ وێ ناخوێنن •

ئەو دچي ـئەڤ دخوی ••مێ
ئەڤ دچي ـئەڤ دخوی••نێر

لێ دەما نەبەرچاڤ بي دکرنا بۆري تێ بەردە ژهەڤ جدادکن :ـ
وێ خواری يەـڤێ خواری يە
وی خواری يەـڤی خواري يە•
ع (المرأة) •

(ژن آغا) ـمەزنا ايلێ ـ گوندە • ـ ژنا آغايێ ايلێ ، يا گوندە •
ع ( زوجة الاغا ) •

(ژن سەيدا) ـ ژن ماموستا يە • ژنـا سەيدايێ گوندە • ع ( حـرم الاستاذ ) زوجة الاستاذ •

(ژن بي) ـ بێوەژنە •ژنا بێ مێرە • وەکە دارا بي بێ بەر مايـە • دبێژن :ـ يەک هاتيەجـــە• بەهلول وگۆتيە :ـ دخـــوازم ژنەک ماربکم • بالول گۆتيە :ـئەگـەر کەچـــە تو زاني ـ ئەگەر ژن بي يە ئـــەو زاني ـ ئەگەر ديا سێويايە ، هلێ ئەز بازدم • ع (المرأة السيبة)•

(ژن تي) ـ تي براێ مێرێ ژنکێ يە• ژن تي • ژنا براێ مێرێ ژنکێ يە • رەوشێ زســـەيران رە دبێژی :ـ ژن تي يێ • سەيران ژنا تي يێ رەوشێ يە ـ ژنـــا برايێ مێرێ رەوشێ يـــــە •
ع( زوجة اخ الزوج ) •

(ژن آپ) ـ ژن مام ـ ژنا آپێ مرۆڤەـ ژنا مامێ مرۆڤە • ع ( زوجـة العم ) •

(ژن بر) ـ براژنەـ ژنا برايێ مرۆڤە• ع (زوجة الاخ ) •

(ژنەمێر) ژنا وەکە مێرايە •دبێژن:ـ

رەوشێ ژنەمێرەکە ـ وەکە مێرا یە • ع (المرأة التي تعمل اعمال الرجل ـ كالرجل) •

(ژنباڤ) ـ ژنا باڤێ مرۆڤە • باڤێ بارام ژنەک آنی یە •ئەڤ ژن زبارام ر. ژنباڤە • ع (زوجة الاب) •

(ژنك) ـ دڤردە (ك) ژبۆ زانینە • ئەم دبێژن :ـ ژنك هاتیە ـ ژنك باشە • ژنك چاکە • هەروەکو دناڤبەرا مە دە ژنك هاتیە زانین ـ ئەم هەمو دزانن بێ ژنك کی یە• ژلەورا (ك) هاتیە سەر ناڤێ (ژن) • ع (المرأة المعروفة) •

(ژنکۆك) ـ بچوکێ ژنە • دبێژن:ـ ژن ژی هەنە ، ژنکۆك ژی هەنە • لسەرڤێ گۆتنێ چیرۆکەکە جوان ودرێژ هیە• ع (تصغير المرأة) •

(ژنخال) ـ خالۆژنە • ژنا خالە • ع (زوجة الخال) •

(ژنآم) ـ ژنآپ ـ ژنمامە •

ع (زوجة العم) •

(ژمارتن) ـ ژماردن ـ هەژماردن ـ هەژمارتنە • (د ـ ت) بهەڤ تێنە گۆراندن ـ گوهەرتن • ع (الحساب ـ المحاسبة) •

## (ژە • • •)

(ژەهر) ـ ژەحر • ع (السم) •

(ژەهرەمار) ـ ژەحرا مارە • ع (سم الافعى) •

## (ژۆ • • •)

(ژۆژی) ـ مشکەکە چەرمێ وی بستری یە • ناڤدارە • ع (القنفذ) •

(ژۆر) ـ لهەمبەر ژێرە • ژۆر ـ سەر ـ بانی ـ رازۆر • ع (فوق ـ على شمال) •

(ژور) ـ دشیوەیێ سۆری دە ئۆدە ـ غرفة • دبي ژژۆر هاتبي • ع (غرفة) •

(ژەندن) ـ دیەمبو وهری دە تێ گۆتن • گەڤان ژەن آڤژەن •ع (ندف)•

## ( شا ـ آ )

(شارەزا) ـ دكۆكا خوەده ئێ كـــۆ
لشـــار ـ بازار زايـــه ـ
زێدەبويه • لێ ژبەركۆ ئـــێ
لشار دزێن ـ ئەزن‌دبن زانـا
وبیرەوەرن بويه نافێ زانـــا ـ
بیرەوەر ـ بازاری ـ مەدنی :ـ
بارام شارەزایه ـ زاروێ‌شارە ـ
بازاری‌یه ـ زانایه •
ع (المدنی ـ العاقل ـ فهمان) •

(شاها) ـ ژ شاه دەركەتيه ـ بداخوازا
مەزن ـ دلشاد • پاشێ بويـه
نافێ ژنا • بەلام داخوازا شاه
ـ ئەگەر نه ژ شاد ـ شادي ـ
شاهي دەركەتبي ، نەدیاره •
لێ باوەرم ژ شاهي ـ شادي ـ
خوەشي دەركەتبي • راستـه ،
ما ژشاه بێتر كي‌دلشاد هەيه ؟
ع (الملكة ـ اسم للنساء) •

## ( شا ـ ئه )

(شايه) ـ زفستانا (بەرف ـ بەفر) ،
ل زنارێ چيا گەلەك دچفي ـ
كۆم دبي • جارنا ئەو بـەرف
دشەرقتي و بەر بخـــوارده
دچـــي ، چەتشتێ ل ريا وێ
هەيه دبەر خوه دبي • نافێ
وێ شاپه • ل وەلاتێ مـــه
جـــارەك ل گونـــدێ
(كەرجۆســـێ) ـ ل بازارێ
(كەرجۆسێ) شاپه رابويـه ،
مالـەك بنافـێ مالا سكەندەر
بجارەك تەقلي خانی دبـەر
خوه بريه • ژلەورا تا ئێستاش
كوردێ وێ دەهمـــێ ـ وێ
هەريمێ دنفراده دبێـــژن :ـ
وەی شاپا مالا ســـكەندەر ل
مالا وه رابي • ع (زحـــف
الجليد الثلجي من اعلى الجبل
الى الاسفل) •

(شارگه) ـ ئەو جهێ كۆ تێدە شيار
دمێنن ژبۆكۆ دژمن ژنشكافـه
بسەر وادە نەگري • پاشـێ
بويه ناف ژبۆ جهێ شياری‌يـا
بەر (كەوا) ژی • ع ( خنادق
تراقب منها حركات العـــدو
حفظا لسلامة الجيش) •

(شاهنامه) ـ ناڤــداره • نفشتا كۆ فردوسیێ طوسي چێكريـه • بەلام شــاهناما شـــهيدا • ناڤێ شـعرەكه منه ژدوســەد بەيتـــي نەكێمتره دديـــوانا يەكـــەمدە چـــاپبويه • ع ( كتاب منظوم معروف نظمها فردوسي الطوسي •.واســـم لقصيدة كوردية ) •

(شازده) ـ شەشودەهـ • كارتەك ژماره • ع (ستة عشرة) •

## ( شا ـ ئي )

(شادي) ـ (بداخوازا)شاهي ـ خوەشي هاتيه : خۆشي وشـــادي دڤێم گەردەن آزادي دڤێم ••
كورد وفارس دڤروه هەمیارن• ع • ( الافراح ) •

(شادي) ـ كالكێ صلاح الـــدين ـ يوســف كـــورێ أيـــوب ـ نەجم الدين ـ كورێ شادي•• ئەڤ ناڤ ديـسا ژدل خوەشـــي ـ شادي هاتيه • ع (. جـــد صلاح الدين الايوبي ) •

( شامي ) ـ ناڤێ نفشەك مريشكه عەلۆكه • لێ باجانا شــامي ، كەرێ شـــامي ژی لجـــەم كورمانجا پـەيدادبن • باوەرم كۆ بالقەدانێ بازارێ ( شام ) ياوەلاتێ شامن • يانی ميرشكێ شامي ـ مريشكێ كۆژشـــام هاتنه وولاتێ ـ مه ـ آنينــه وەلاتێ.مه •••. ع ( نوع من الدجاج ـ العلو ) •

( شـــاني ) ـ نيشاندانه • بـــەلام تێ‌نەبەره • شانيدان تێ‌پەره : رياگوند شاني بارام بده • مالا بارام شــاني فـــەرهاد بكـــه ـ ژێرەبده. زانـــين ـ پێشي بكه •

(شاهي) ـ داوەت وديلان وشـــادي وخوەشي يه •هـن دبێژن :ـ شادي وهن دبێژن : شاهي • يانـــي دوێ دل خوەشـــــي وكۆڤەند ديلانێ ده ، يەك دبي شاه ـ دبي زاڤا • ژلەورا ناڤێ وێ بويه شاهي • هيژێ كـــــورمانج ژزاڤێره دبێژن :ـ تا ســـێ رۆژا پاشـــايه

ـ پادشایه ـ شاهه • چه بکي کـــەس نـــکاري بێژي نا • ع ( الافراح وافراح العرس ) •

( شــاوي ) ـ ژعربێ دۆر بازارێ (دێرازۆرێ) رە تێ گـــۆتن ژکو هاتيـــه نزانم • ع (••)

(شازی) ـ شامبـــاذی ، نافێ نفشەك مەیمونەگەلەك تێزیكی مرۆڤانه • ع ( نوع من القرد )

(شافي) ( شـــافي وكـــافي ) نافێ دو نقشتێ ( كورێ حاجب ) ن • كۆبـخوه كـــوردە ودزمانێ عربي دە گەلەك نقشتێ هێژا ونافدار چێكرنە • مختصـــر ومطول ) دئەدب ـ دنقدالادبي دە چێـــــــــكرنە • نقشتێ كورێحـــاجب گەلــــەك برومەتن •

**( شا ـ ئێ )**

(شارێ) ـ نافێ ژنایه • یا ژ شار ـ بازار هاتيــــــــه • وەیا ژ شار ـ شەعر ـ كەسروان ـ پێچه ، هاتيه • لێ پر دروسته نافێ وێ ( شارەبان ) بي پاشێ بویه شارێ •

(شانوشێ) ـ گوندەكه راســـەرێ بازارێ ( نصێبین ) دكەڤي • كەلەهەكه بلنـــــد تێدەیه •

دبي ژ (شاەنشین) ـ جهـــێ رونشتنا شاه ، هاتبي ( خاني ) دچـيرۆكا ( مەموزین ) دە ، شانەشین ـ شاەنشین كــــریه نافێ قصرا میرێ بۆتا :ـ

شاەزادەیه شاەنشـــــین مكانه
عنقـــایه بلندە ، آشـیانه ••

(شاپ) ـ بچوكێ وێ شـــــاپكه • بەسەر (شال) دە ل خوه دكن• دبي هن نافێ دیژي هــــەبن ژبـــــەركۆ گەلەك نفشـــێ وەرگرتنێ هــــەنه • وەك چۆخـــك ـ بەســــتەك • ع ( بمثابة الجاكیت ) •

(شات) ـ شـــەحت • مرۆڤێ باوي ـ پوچه • نكاري باش لسەر پیا هەري • باشێ شەحتۆ بویـــه ناف • ع ( المشلول ) •

(شاخ) ـ نــــافێ گـــــوندەكي یاكەڤنه بازارەكي كـــوردە ،

لراسەري بازارێ جزيرا بۆتا
دكەڤي دناڤ چيايێ ( جـودي
ـ گودي ) بهشـــتا دنيـــايێ
ـچيرۆكا دە بزۆر ولۆ بێنـــە
بيرا مرۆڤ • هاڤينگهـا ميرێ
بۆتا بو • ع ( قرية كـوردية
جميلة ) •
(شاخ) ـ گوندەكە لناڤ هـەكاريا
دكەڤي دبێژن : ـ گـــەلەل
خوەشە لێ م نەديە • بـەلام
شاخا بۆتا سێ مها لێ مامـــە
جزيرى دبێژى :ـ
شـاخە عمري بخوە بەر ژێ
وژقيصـــر مـــكە بحث ••
(شاخ) ـ ترح وكات وپەنجێ كۆ ژ
دارا ولەم وگەيا ڤەدكـەڤن ـ
درێژ دبن • ( سەر شـــاخ )
شەبەشوپەتيخ وهەرتشتێ كۆ
بسەرێ شاخا ڤە دمێني •
ع ( ما يطول او يتشعب مـــن
جداول الاشجار والحشائش )•
(شاخ) ـ ناڤێ چيايە • سـۆرا ولـۆ
دبێژن • ع ( الجبال ) •
(شاد) ـ دلشادە •ئێ دلشـــادە •
كرۆكە • شـــادي ژێدەرە •



هەروها دبي (شاه) كرۆك بي
وژێدورێ وي شـــاهي بي •
ع ( المفرح ) •
(شار) ـ بازارە • دكوردي وفارسي
وتركي دە هاتيـــە • بـەلام
كورانج ژبۆ • شـار دبێژن :
بازار • تەنێ بازار نەبازارە •
ژبەركۆ بازار كرين وفرۆتنە
ياجهێ كرينوفرۆتنە :ـ
بازارێ مەغرەبزەبينێ
بازارەكـــي گـرانە ••
لســـەر سێســـەد وشێست
وشـــەش چيـــانە ••
بەلام گەلەك جارا (شــــار)
دكورمانجي دە بڤێ داخـوزێ
تێ :ـ شارەزور ـ شـارەزا •
شاربازار ـ وێرانشـــار •••
دڤردە شار بداخوازا بازارە •
ع ( المدينة ) •
( شاخور ) ـ ئەو چيا وشاخێ چيانە
كۆ خرەك وبكەڤر وزغورن
نەگەلەك بلنـــــدە بـــەلام
تێركەڤرە • ژشاخ دەركەتيە•
دبي (شاخـهور) بي • شاخێ
كچكە ـ شاخێ هـورد بي •

ع ( يقال للخيل الصغير ) •
(شاباش) ـ ژ شـادباش ، يـا ژ شاهباش • هاتيه • ع ( بمعنى عاش ـ الحمد والثناء ) •
(شاش) ـ مرۆڤێ رێ ونداكـريه • (غلط) ـ (أخطاء) شاش‌بويه• غلطيه • شاش‌كريه ـ(اخطاء)• شاشـي ژێدەره • تێ‌نەپەره • شاشـكرن تێ‌پەره • باران ب‌شاشي چويه ناڤ دژمنـا • بارام فەرهـاد شـاش‌كر ـ ژرێ دەرخست • ع (الخطأ والغلط ) الذي يغلط •
(شاش) ـ بچوكێ وێ شـاشك هاتيـه • شاشكا مەلێ ـ شاش پێچان • مەيزەرا سەرێ پياوه • ع (العمامة) •
(شاق) ـ شـاق باق وشـاقواق ـ شاقشاق • ددەنگێ مريشكا دە خـويا دكى • دبێژن :ـ شاق‌شاقا مريشكا رەوشێ يه • شاقباق • گلي وگازنێ ب‌هاوار وقيرێن وقرقره • چـه شاقباقا رەوشێ يه ؟ ع ( كلمة صوتية من صوت الدجاج ) •
(شاپك) ـ چوخ • بەسەر شـال دە وەردگردن ـ ل‌خـوه دكن • د(شاپ) ده دەرباس بويه •
(شالك) ـ عەبايەكه تەنك وهري‌يه ع(خاچيه) بەسـەر بەرگێ خـوەده وەردگـرن • چقـاس تەنك‌بي ، ئەوەنده چاكه • ع (الخاچية) •
(شام بورەك) ژتركي هاتيـه ناڤ كورمانجي ـ بورەكێ (شام) • گۆشتێ هور دخن ناڤ هەڤير و دفرنێ ده ، يا ل‌سەر سێلێ دبرێژن •
(شال) ـ پەرچێ ژێري ـ خواري يه ژتاخم :ـ شال ـ شـاپ ـ كەرك • چاواكۆ شال ب‌خوه ناڤێ قماشەكي يه ، گران‌بهايه• شالچي ئێ‌كۆ شال چێ‌دكي • (شالك) بەسەر كنجێ خوەده وەردگري • تەنك وسفكه • ع ( بمثابة البنطلون ) •
(شاڤول) ـ وەكـه كـەڤانه • بێ نێچيرا چوك وچفيكا دكن •

لبك گەنم بتاكيڤه گرێداي ودافك لبەر نێچيرێ هاتيــه ڤەدان • عـــرب ژێ ولــۆ دبێژن •

(شانول) ـ هەڤدەنگێ بلبله • عرب دبێژن (شحرور) • چڤيكەكي دەنگ‌خوەشه • دســترانێ كورد وعرب دە نافێ وي خويا دكي • ع (شحرور) •

(شام) ـ بازارێ شام ـ دمشــقه • وەلاتێ شـــام ـ ژ(فــەرات) وبــەرژێره ـ ژبــەركــۆ رۆژ هلاتێ ( فەرات ) گزيره ـجزيرەـ الجزيرة • يــه • كورمانجا گۆتيه : ـ شـــام شـــەكره وەلات شێرين‌تره : دبازارێ شامێ دە گـــەلەك كورد هەنه • حارا كورمانجا ـ حي الاكراد راسەري‌شـــام دچيايێ (جلق) دەيه • دوەلاتێ شامێ دە ژي كورد هـــەنه • ع (معروف) •

(شان) ـ وەكه پتك ـ دەق دروێ مرۆڤا دە چێ دبن • بچوكێ وێ شانكه • شـــان ـ شانك دروێ بارام دە چێ‌بونەـهاتنه• ع (الشامة) •

(شان) ـ ئـەو تارا شـــمايه كـــۆ مێشێ هنگوف تێدە كـــورم وهنكوفێ خوە بـجي دكن • دبێژن : ـ مالا فەرهاد وەكـه شانا هنگوڤه • ياني فەرهـــاد گەلەك دەولەمەندە ـهەرتشت لمالا وي هـــەيه • ع ( عش النحل ) خلية •

(شارەبان) ـ نافێ بازارەكي كوردە• نافێ ژنايه • دبي شارە(بانۆ)، ياژ شارەبان ـ رەڤان هاتبي ، ياپێشي‌بێتر نێزيكي‌داخوازێ‌يه• شارەبانۆ ع (ملكةالمدينة) •

(شاندن) ـ ناردن ـ هنارتن ـ نارتنه• ژێدەرێ وێ چوين ـ چـون هاتيــه • لێ ئــەڤ ژێدەر ـ (شـــاندن) تێپەره • ئـــەم نكارن بێژن : چاندن • ئەڤ دابـــاش دەرباس بويـــه • ع ( الارسال ـ من أرسله ) •

(شاني‌دان) ـ نيشاندانه ـ مالا بارام

شـــاني من بده • رێ مـن بده ـ پێم بده زانـين • ياني نيشانێ وێ ژمره بده زانين • ع ( من دل ـ أدله ـ عرفه ) •

(شاميران) ـ نـــاڤێ پادشـــاهه‌كه ئاشوري يه • به‌لام ژ كوردي هاتيه : شاهێ مـــيران شـاهێ أميران ـ شاهنشاه • ع ( ملك الملوك ـ ملكة الملوك ) •

(شاه) ـ ژشاهي ـ شادي • هاتيــه ئێ‌كۆ دلێ وي بشادي ـ بشاهي يه • دل‌خوه‌شه • پاشا ـ پاێ شاهه • ســـاعد الشـــاه • ع (الملك ـ مستريح البال) •

## ( شه ـ آ )

(شه‌رمۆلا) ـ ناڤێ گۆرنستانا بازارێ (آموده ـ عامودێ) يه • گرێ• شه‌رمۆلا ـ مه‌زه‌لێ شه‌رمۆلا• ب‌هه‌ڤه‌نه • ع ( مقبرة معروفة في مدينة عاموده ) •

(شـــه‌ما) ـ گونده‌كـــه • ل‌ژێرێ (عاموره) دكه‌ڤي •

(شه‌مكا ) ـ ائيله‌كه • كورده •ل‌ناڤ هـــه‌ڤيرڤا يه • ع ( عشـــيرة كوردية ) •

(شه‌مۆ د) ـ ائيله ڤه • كورده• ل‌ناڤ ائيزيدي‌يێ هـــه‌ڤيركا يـــه • ع • (عشيرة كوردية ) •

(شه‌يدا) ـ شێت ودين ومێ‌خولي‌يه• ژفارسي هـتيـــه كوردي • ع ( نوع من الجنون ) •

(شه‌هنا ماشهيدا) ـ شـــعره‌كه منه • دديوانا يه‌كه‌م ده به‌لاڤ بويه•

(شه‌ده) ـ ل هێلا ( هـــه‌ولێرێ ) شه‌ده ـ پێچـــه‌يه‌كه ژن ددن سه‌رێ خوه • دبـي ژعـربي هاتبي • لێ هـــه‌ردەم ل‌په‌ي شار ـ شه‌عر تێ : شار وشه‌ده•

(شه‌ره‌ڤنامه) ـ تاريخا شه‌ره‌ف‌خانێ به‌دليسي يه • كۆ بفارســـي دبوارا كوردا ده چێ‌كـريه • يه‌كه‌م تاريخه كۆ ده‌ره‌به‌گـي وفه‌رمانداريێ ملله‌تێ كـــورد بته‌ڤاي گرتي‌يه • چه‌ندا تێ‌ده هن كێماسي‌هه‌نه به‌لام گه‌له‌ك گـــرانبها وبرومـــه‌ته • ع ( تاريخ الدول والامـارات

الكردية • كتبها الامير شرفخان البدليسي ) •

(شەمزه) ـ كار وبەرخێ بچوكن • ع ( الرضيع ـ صغار الطليان ) •

(شەلته) ـ جاوەكە • هريويەمبو دخنێ ودكـن دۆشەك ـ متێل ـ پالگه • جارز پرتكێ مريشكا دخن شەلته • لسەر شەلته روبەره • ع ( الخام الذي يصنعون منه اللحاف والمخدة ) •

## ( شه ـ ئۆ )

(شەرۆ) ـ نافەكه • زشەر ـ جەنگ • دەركەتيه •

(شەنگۆ) ـ زشەنگی ـ شەنگەبي • دەركەتيه • نافه •

(شەنبۆ) ـ نافێ ايلەكه كورده • لناف هەكاريا دتاريخێ ده هاتيه • ايرۆ لشونا وان ، شەمدينا خويادكن • تاريخ بخوه شەمۆ ـ شەنبۆ ـ بشەنبۆ • دگوهێزي • دبي

زبەشنەوي دەركەتبي • ع ( عشيرة كوردية ) •

(شەشۆ) ـ زشەش دەركەتيه • نافێ مرۆفايه •

## ( شه ـ ئێ )

(شەمزێ) نافێ گوندەكی • لناف خەرزا يه • هەن دبێژن :ـ شمسێ •

×

(شەب) ـ وەكه شەكره • لێ بێ تامه :ـ لجەم مرۆفێ نەزان شەب وشەكر يەكن • عرب ژي ولۆ دبێژن •

(شەراب) ـ ژ شيرآب ـ شيرآو ـ شيرآف • هاتيه • شيره ، آفاترى يه • (شەراب ) ژ (شيره) ـ و (آب)، گهايەهەف • شيره • (عصير) •

(شەرشوب) ـ گولكن ، زريف وزێر چێدكن • زن بسەركەزي وگوليێ خوه فەدكن • عرب ژي دبێژن •

(شەش دەرب) ـ شەش‌آر ـ دەمانچە ـ
دومان ـ چە • يە • (دەرب)•
دبي ژ (ضرب) هاتبي • بـلام
دەرب بكورمانجي جـاره •
شەش‌جار • دەربك ـ ددرب
وبەر ـ گونە نە • شەش‌گولە•
ع (المسدس) •
(شەمەت) ـ نـاڤێ جـاوەكي
كورمانجـيـيە • لێ دبي ژ
شەبەت ـ خط • دەركەتبي •
وێ چـاخێ دبي عـربي •
ع ( نوع من الخام ) •
(شەهمات) ـ كوشـتنا شـاهێ
سەدرەنجە • مات ـ قانـە ـ
جـاره • دليـستكێ دە تێ
گۆتن :ـ هێ سێ ماتێ من ل
تە مانە • سێ قانێ من ل تـە
مانە • ع ( مرة واحدة في اللعب
وتجميد الشاه ) •
خانی :
فيل وروخ وكـركدان
كۆهاتن
دين مـير ومعلمێ خـوە
ماتن ••

(شەوات) ـ ژێدەرێ تێنـەپـەرە •
شـەوتاندن • تێپەره :ـ بارام
شەوتي فەرهاد بارام شەوتاندە•
ئەوەكۆ تشتەك بشەوتي ، يان
بێ‌شەوتاندن • شەوات ـ ئەو
جهێ كۆ شەوتيە • ئەو تشتێ
كۆ دكـاري تشـتـەكي
دي بشەوتێني • وەكـە :ـ
آگر • ع (الحرق او الاحتراق)
(شەمرەخ) ـ گـوندەكي مەزنە •
لناڤ دوملا ـ چيـايێ مازي
پاي‌تەختا دەرەبگي يا ميرەكێ
دنبلايە • تا ايرۆژي مانە •
(شەرنەخ) ـ گـوندەكي مەزنە •
لنڤ بۆتايە • مالا آغايێ سۆر
مەزنێ ايلێنە •
(شەر) ـ جـەنگە • شـەرخواز
كرۆكە ـ ئێ‌كۆ شەر دخوازي
شـەرڤان ـ شـەركەر •
دبي (شەر) لهەمبە (خـێر)
دەركەتبي • ع ( الحرب ) •
(شەركەر) ـ كـرۆكە • ئێ‌كـۆ
شەردكي • ع (المحارب) •
(شەڤەدەر) ـ شـەڤەدەر • ماينـا

لدەرڤە بشەڤە • بارام ایشەڤ
شەڤدەر مایە • یاني بشـەڤ
لدەرڤە ـ دەرەوە • مایـە •
ع (الذي بات خارج بیته لیلاً) •
(شەڤگەر) ـ شەڤگێرە :ـ شەڤگێرۆ!
رم تۆپۆ ! باران بـاري •••
ئێ كۆ بشـەڤ دگـەري •
بداخوازا گـەرناس ومێرە •
ع ( بمعنی البطل ) •
(شەكەر) ـ ناڤـداره ـ سـكر
(شەكەر) بداخوازا سۆز ـ وعد
هاتیە جـزیري دبێژی ـ
دلبەر شەركیناند شەكەرەك
نقلت یا روحي ! متی ؟
گۆ من هەتا خاطرڤه بێت
من گۆ چكم ئەزباهەتا ؟
دبێژن :ـ دە شـەكرەكي
بشكێنە • یاني گۆتنەكەخوەش
بێژە • دڤردە ژي بداخـوازا
شێرین وخوەشە • ع ( السكر
وتأتي بمعنی الوعد ) •
(شەمەندوفەر) ـ ترێن ـ قـەتار •
هەرسێ ژي بیاني نە • هاتنـە
ناڤ زمانێ مە • لێ دباوەریـا
من دە چاواكۆ مرۆڤەك بیاني
بكەڤي ناڤ مللەتەكي وجـي
بگري ـ خـوە ژبیربكي دبي
خـەلكێ وي وەلاتي ـ دبي
زوي مللەتي • ع ( القطار ) •
(شـەموز) ـ ئەو قانترا كۆ ناهێلي
مرۆڤ باربكي ـ بارا لێكي •
ع ( البغل الذي یتهرب مـن
الحمل والركوب ) •
(شەش) ـ كارتەك ژمارە • هـن
دبێژن : شێش • لێ نەراستە •
ئێ كۆ بكـوردي نزانن ولـۆ
دبێژن • ع (ستة) ٦ •
(شەبەش) ـ زەبەش • ناڤـداره •
دهەمبەر (پەتیخ) دە هاتیـە •
ع (بطیخ الاصفر) •
(شەڤرەش) ـ شـەڤ ـ شـەو •
دۆ پارچەیە :ـ تڤەهـەیڤ
ـ شەڤرەش • دبي ( شۆرش )
كۆ بداخوازا ئەورە هاتیـە •
زڤردە ركەتبي • ژبـەركۆ
كورمانج دبێژن ـ مە گەلەك
شەڤرەش دینە ـ مە گـەلەك
شەڤرەش دەرباس كـرنە •

شەڤرەش گەلەك بسەر مەدە هاتنە • بداخوازا رەحمەتي ودژواري‌يە • ع ( ليالي السوداء ) •
(شەڤ) ـ شەڤرۆن ـ شەڤرەش • شەڤا تاري • ئەڤيندار جارنا بەختێ خوە ، وجارنا پەردا يارا خوە ، وجارنا ئەگريچە وبسك وزلفێ يارا خوە وەكە شەڤێ دكي دبێني • ع (الليل) •
(شەلاف) مرۆڤێ كۆ گەلەك زاني خووش بكي • ع (ملاق) •
(شەق) ـ دەنگێ شەقشەق • شەق ـ شەق ژ گەلەك تشتا ئەڤ‌دەنگ دەردگەڤي :ـ بو شەقشەقا درانێ بارام • بو شەقشەقا لنگێ وي وهەسپێ خوەدا بەر زەنگوا • گۆ شەق شەقامەك لێ دا • بو شەقشەقا تڤنگا وي • ع (كلمة صوتية) •
(شەلتاق) ـ وەكە شەلافە • ملاق و منافقە • ع ( الحيال ـ المحتال ـ المنافق ) •
(شەماق) ـ شەقام ـ زلە ـ سيلە •

لێ ـانا بدەستە ، لرويە • بارام شەقامەك ـ شەماقەك لروێ فەرهاد خست ـ دا ، دەنگێ دەماچاكێ ژێ هات • وا ديارە شەماق ـ شەقام سەروبنێ هەڤ بونە • تەنێ شەقام لجەم خەلكێ سليماني بداخوازا كۆلان ـ شارع • هاتيە • ع ( ضرب الوجه بالكف ) •
(شەبەك) ـ نافێ ئۆلەكە بدزي يە • ل كوردستانێ پەيدا دبي • وەكە ئيزيديانە • لێ دروێ وارە خويادكي كۆ قزلباشن • شەبەك نافێ گوندەكي‌يە • ل رۆژهلاتێ (قاشلۆكێ) دكەڤي •
(شەشەك) ـ شەش رۆژ رۆژي نە • پشتي چەژنا رەمەزانێ دگرن • ع ( صوم ستة ايام بعد عيد الفطر ) •
(شەك) ـ يا شەگ • لێدانا گۆگێ يە • وهارەنگە دەرباسكرنا گۆكێ دسينۆرێ ليستكێ‌ڤە نافێ وێ شەكە ـ شەگە •

ع ( ضربة قوية في لعبة طابه الخشبية ) •
(شه‌میتۆک) ـ ئه‌و جهێ شایک و شله‌که کۆ مرۆڤ لێ دشه‌مێ
ع (المنزلق) •
(شه‌وبه‌ک) ـ داره‌که • پێ هه‌ڤیر لسه‌ر ته‌خته‌کێ فره دکن •
(شه‌نگ) ـ جوان ـ ده‌لال ـ خوه‌شک ـ شه‌نگه‌بي ـ داره بیه‌نه کۆ شاخ وچقلي وکات وترحێ وێ وه‌که پۆرێ ژنا بسه‌ر ده تێنه خوار • ع ( المرأة الجميلة وشجرة جميلة ) •
(شه‌ل) ـ کێسته‌که • شه‌ل• کێله‌که• شه‌له‌ک لێ دا ـ شه‌له‌ک دروت•ع (نوع من الخياطة)•
(شه‌پال) ـ چه‌له‌نگ وخورت وجوان • گه‌له‌ک جارا دگه‌ل شێر هاتیه خویاکرن • شێر وشه‌پال •جارنازي شۆخ‌وشه‌پال :ـ

ڤێ ناز وده‌لالێ ژمه
دل بریه بتالان
ڤێ شۆخ وشه‌پالێ

لمه لر له‌شمێ مه‌قامات دبي ژڤێ ته‌باني که‌رناس بي • یان بخوه نفشه‌کێ ژ شێربي لێ بڤي نافي دوه‌لاتێ مه‌ده ته‌باک نافدار نه‌بويه •
شه‌پل ـ چه‌پل • بداخوازا چه‌نگ ـ مل ـ بازک ـ بازو هاتيه •
ع • ( اسم محبب على العشق، يطلقونه على المعشوق من باب الاستعارة و تشبيه ) فيه هيبه وجمال •
(شه‌ردل) ـ هاوير چيا يه ـ جهێ نزم وکورت • سه‌رڤالا چيايێ شه‌نگالێ • دستراناده هاتيه •
ع ( منعطف الجبال ) •
(شه‌روال) ـ لشونا (شال) تێ وه‌رگرتن • لێ ده‌ڤ ده‌لنگێ شه‌روال ته‌نگن • به‌لام شال ژێرێ وي فره‌هه • دبي به‌رگێ شه‌ربن • یان ژ شۆر هاتبي •
(شه‌ڤال) ـ کورمانج دبێژن : ـشه‌ڤال وبه‌ڤالێ بازارا بکێرى شه‌ر

وكوشتن و تالان وشــــهوات
ودژواري نابن • لێ ايرۆئەڤ
نه گەلەك راسته • كــــورد
بچاڤەكي كێم لوان تەماشـــا
دكن • ژلەورا دوري بـــاژارا
رەڤيانه وزيانەكـــــه مــــەزن
ژدەست فێ آورێ دينــــــه •
ع (رعاع المدن) •

(شەكال) ــ كەلاشه • سۆل وشەكال
وقوندەره ــ شـــمك وپۆتين
كورمانجا دخستن پێ‌يێ خوە•
وا خويايه كۆ شەكال پانيا وێ
شــەكەستي يه ، يان بێ پاني
يـــه • هەروهـــا ژهــــەمو
پێلاڤێ كەڤــاره رە تێ گۆتن
شــەكال•دبي (شەقال)ژشەكال
دەركەتبي ــ ئێ كۆ شـــەكالا
چێدكي • ع (كلاش) •

(شەمال) ــ فندە • يان شەمال نفشەك
ژفندێ يه ــ يا پەسنەكي وێ
يه • ع ( الشعلة ) •

(شەمل) ــ چەڤي يەكه • لسـەرێ
خوە گرێ ددن ــ دگەرێنن •
دبۆرێ قەردە هاتيه :

عمره عمره • خوەديێ
شـــــــــەملا زەره
قاصـــديێ پەيغامبـەره
كرياري بۆرێ قەره ••

(شەنگال) ــ شەنگال ــ سەنجـــار •
بازارەكــــي كـــوردە • ل
رۆژآڤايێ موصـــل دكــەڤي •
ژكەڤنارەدە كورد دڤي بازارى
دەنه • چيايێ شەنگال دستران
و لاوكــێ كــــورمانجي دە
ناڤدارە • ع ( مدينـــة غربى
موصل ) •

(شەول) ژ چۆل ودەشتێ تەنگ‌ترە•
درێژ وتەنگە • هاوير چيانه •
لێ نەچيايێ بلندن • ئەگــەر
نەژ(چەول) ــ چـــەوليك •
هاتبي نزانم چي‌يه دكۆكـــا
خوەدە • ع ( مضيق ضـــيق
يصلح للزراعة ) •

(شەوكيل) ــ شەكۆك • ژ هرمي‌يێ
بچوك ترە وبێتر بزغـــورە •
گەلەك جارا ئـــەم دبرن و
هرمي دناڤ دارا وێ دە ــدناڤ
قورمێ وێ دە دچێنن • هرمي

يێ وێ باشــــ چــێدبن • ع ( عرموط صغير ) •
(شەبنەم) ـ دشـعرێ كـــــوردي دە گەلەك هاتيە • ئەم ژێـرە دبێژن : ـ آڤي • خويـسـي • ژوْرسي هاتيە • شەبـشەڤە• نيم ـ آڤي‌يە • يا نيم ـ نيڤە • يانى آڤا شـــەڤێ • يان آڤـــا نيڤەشەڤێ • ع ( ألندى ) •
(شەرم) ـ فـــەدي وفێتـــكاري‌يە ـ ئەهێتكاري‌يە • ع ( خجـــل وحياء ) •
(شەقام) ـ كوْلان ـ شارع • ل ناف سوْرا من بهيستيە•ع(الشارع)•
(شەرپلاندن) ـ بارام شەرپلي ـ نەما زانبو چبكي ؟ ع ( الارتبـــاك والحيرة ) •
(شەرەفخان) ـ نافەكە•شەرەفخانێ بەدليـــــــي خــــــوەدي‌يێ (شەرەفنامە) بڤي‌نافي نافداره • (شەرەف) عربي • (خــــان) كوردي وفارسي وتركي‌يە • (خانشەرەف) يەك ژمـيرەكێ بوْتايـــە :ـ تەشـــبيهێ تيرێ

خانشەرەف • ع (امير كوردي ومؤرخ مشهور ) •
(شەرڤان)ـ ئێكوْ زاني ـ كـــاري شەر ـ جەنگ بكي • ئــــەم كارن ل شونا (جندي) بنڤيسن شــــەركەر ـ المحــــارب • ع ( العالم بفنون الحــــرب والمتمرن ) •
(شەرقتاندن) ـ ژێكـــــرنا كاتەكي ـچقلي‌يەكي ـ تشتەكي يە • ع • ( قطع في غير محله ) •
(شەركرن) ـ ژێدەرە ، تێپـەرە • ع ( القيام بالحرب أو الحــرب نفسها ) •
(شەلبتاندن) ـ چاڤێ شەلبتي ژچاڤێ كوْر چێتره • چاڤێ شەلبتي ئەوە كوْ تراخوما تێدە هەبي ـ نيڤ كوْربي•ع(التراخوما)•
(شەمتاندن) ـ چــەرخاندنە • بارام شەمتي ـ پێ ل تشتەكي نەرم كر وشەمتي‌وكـــەت • بارام ژرێ كەت • هاتە خاپاندن • ( الانزلاق والخروج عن جادة الصواب ) •

(شەمدين) ـ ژ(شمس‌الدين) ژعربي هاتيە • پاشێ بويە شـەمدين ـ شەمۆ • ناڤـــە ژبۆ مێرا • شەمدينان ـ شەمدينا • ژڤـر دەركەتيە •

(شەنگلاندن) ـ دبي زچـــەنگلاندن هاتبي • درەتنەكەـــ ولۆ بێ كۆك ونەســازە • دبێژن :ـ رەوشێ خوەديكي كراسێ من بهەڤە بشـــــەنگلێ • ياني بـــدرو • لێ دروتنــــەكە نەپێكهـــاتي • ياني بهڤــــە بچـــەنگلێ ـ گـــــرێدە • ع (التسريح) •

(شەهكرن) ـ ئەوەكۆهرى ـ مـــو ل شەهە بدن • هري شـــەهكر ـ مو شەهكر ـ ســـەرێ خوە شەهكر ـ سەرێ رەوشـــــێ شەهكر • ع ( التمشيط ) •

(شەوتاندن) ـ بارام خاني شـــەوتاند تێبــــەرە • خـــــــاني شەوتي • تێنەبەرە • شەوات• دەرباس بويە ع (احـــــراق الشيء) حرقە •

(شەه) ـ ناڤدارە بدرانە • مــــــو ـهري ـ پۆر پێ شەهدكن • گەلەك نفشێ وي هــەنە :ـ شـــــــەهێ ســـــــــەريا ـ شەهێ مو ـ شەهێ مەكينا • ع (المشط) •

(شەو) ـ شەڤە • سۆرانيیە • ئەڤ واو (و) لناڤ كـــورمانجـــا بويە (ڤ) • پێشڤە چـويە • لێ هێ دهن شون ودەر وجيا دە مايە • لبەرخـوە ددى • دناڤ ترك وعەجەم وأرمن • دە وەكە كورەمانجا دخوێنن • جـــــارنا (و) دنڤيسن (لــێ) ب(ڤ) دخوێنن •

## ( شو ـ آ )

(شوڤا) ـ ائلەكە كوردە ناڤـدارە • خەلەڤێ شوڤي ژڤێ ائلێ يە:ـ

ئەزخـــەلەڤم خــــەلەڤم
هاوارە ! ميرۆ ! هــەوارە
خوەدێ شورێ صەدەڤم
ئەزدين شێر ميرى بۆتايە
دەزگيران وبێلۆتە لبەر ڤێ

بەستێ دكن • ع ( عشـــيرة

لوردية) •

(شوشه) ـ ئافداره • شوشا بيرا
ـ شوشا گولافي ـ گەلەك
رەنگي شوشه هەنه •
سترانڤاني كورمانج گەردەنا
يارا خوه وەكه شوشي كرنه
وگوتنه :ـ

ئەزي هيزاني دحەبينم
ژيده تاخا هيشەتي
ته گەردەن شوشا هيشينه
نقطەنقطه خال كەتي
هەجي سينەم بيينه
بيشەك دچەجەنەتي ••
شوشي • نافي ژنايه •

(شوژي) ـ يان زوژي • مشكەكي
بستريه • دژمني ماره •
ع (القنفذ) •

(شوت) ـ توژ ـ لوس • دبيژن :ـ
ئەف كاب شوته ـ لوسه • ئەف
كير شوته توژه • ئەف مروڤ
شوته ـ جانبازه ـ خاپينوكه
ـ ژيهاتييه ( شوتي ) نافي
گوندەكي لناف شيخايه •
ع (الاملس) •

(شور) ـ شەمشيره • هنك دبيژن :ـ
شوير ـ شير • لي شور
راسته • ژبەركو شوير •
دەڤخواري يه • شير
ـ (حليب)ه • دبي • دڤارسي ـ
هنديده شەمشير هاتبي • لي
هەرزمانەك ـ زارەك •
ژيره ( تەعبيري )
ويهەنه • (شوري) ـ نافي
گوندەكي لناف شيخاو لپشتا
(ماردين) دكەڤي •ع(السيف)•

(شوڤير) ـ آژويه • ژئەورويي
هاتيه • (آژو) نيف كروكه •
كەرآژو ـ پاش آژو • يا
پەزآژو ••• ژلەورا ئەم كارن
(آژو) لشونا شوڤير بيژن •
آژوتن ژيدەره •

(شوف) ـ ڤادا راكري ـ آژوتي يه •
شوڤا خوه سي گيسن كريه
ئەم شوڤا خوه بآژون
وتوف بچينن
وي زو شين بي ئەمي
وي زو هلينن •
ع (الفلاحة) •

(شورك) ـ دناڤ آلاڤێ جـوت ده
شورك ناڤداره • وه‌كه شور
هنه‌ك خوز وخواره • گيسن
دخن بنێ شورك • ع(القسم
الاول من آلة الفلاحة القـديمة
الذي يأخذه الفلاح بيده ) •

(شونك) ـ وه‌كـــه مێكوته • لێ
هه‌ردو ره‌خێ وي پانو فره‌نه
ژن پێ كنجێ روژا شـــوێ
دكوتي • ع ( مضربة خشبية
تستعمله النساء عند الغسيل ) •

(شوم) ـ ئه‌و مروڤێ خه‌راب كـــۆ
هه‌ردەم راناوه‌ستي وكـــارێ
نه‌باش دكي • باوه‌ر ناكـم كۆ
ژ(شؤما) عربي هـــاتبي • لێ
عربژي دبێژن :ـ (كل شامي
شومي) • ژلــــه‌ورا نه‌وێرم
بێـــژم :ـ كـــــوردي يه •
ع ( المضر ـ المؤذي ) •

(شون) ـ شۆين • جـــي ـ ده‌ره •
جارنا بداخوازا پاشـه :ـ بارام
مر وكه‌س • بشون خوه‌فـــه
نه‌هشــــت ـ لپاش خـــوه
نه‌هشت • بشون خوه‌فـــه
بنه‌ره ! له‌پاش خوه بنـــه‌ره ـ
ته‌ماشا بكه •ع(المكان ـ خلف)•

## ( ش ـ ئۆ )

(شكۆ) ـ خاوه‌ن‌شكۆ ـ پايه‌داره •
ب‌سۆرانی‌يه • ع(الفخامة) •

(شنۆ) ـ باژاره‌كي كورده •ل‌ايرانێ
يه•ع ( مدينة كوردية‌بايران)•

## ( ش ـ ئي )

(شلي) ـ روژێ بباران وبـه‌رفن •
ايروشلي‌يه ـ يابه‌رف ، يـــا
باران وێ‌بێ • ع (الممطرة) •

(شلكي) ـ نانێ هلاتي لسه‌ر سێلێ
چێ‌دكن •دبي ژشله‌ك‌هاتبي•
ياني شل دمێني •

(شياري) ـ هوشياري ـ آگاهداري‌يه،
لخوه شياربه ـ آگاهداربه ـ
هوشياربه • لخوه مقـاته‌به •
مه‌كه‌ڤه خه‌و ـ غافل مـه‌به •
ع (اليقظة) •

(شلو) ـ آڤاشلو ئه‌وه كۆ تێـــكه‌لي
آخ يان ره‌نگه‌كـــي دي ببي •
هن دبێژن : شێلو • دآڤاشلوده
ماسي تێنه گرتن • ع ( الماء
العكر ـ المشوب بالتراب ) •

(شرپ) ـ يا ايشـــارپ • ئەپرى ـ بۆشيێيە • ژن ددن ســـەرێ خوە • ئەوەكە كورديێيە •

(شلپ) ـ شلپين • ژێدەرێ وێيە• ئەف وبەزو رابونا ســـڤكە بارام گۆشـلپ و بادزا • دبي ژ (چلپ) هاتبي • يان هەردو بيەك داخوازێ هاتبـن • لێ چلپ درابونێدە خويادكي • وشلپ درەڤێدە • • ع (السرعة في الهزيمة ) •

(شرت) ـ بچوكێ وێ شـــرتك • دارەكە هور وبچوكە • پرێ جارا لنەهێل وبەرچەما تـێ خوياكرن • كـــورمانجا نافێ گەزك ـ مكنس كرنەشرتك• ژبەر كـــۆ زوێ دارێ زوي گـــەليى چێدكـــن • لێ نەتەڤايى يە ژن پێ ناف مالێ دمالن ـ رێژدكن • ع (شجرة صغيرة او نبات تصنع منهـــا المكانس في بعض الجهات مـن بلادنا ) •

(شت) ـ بداخوازا تشت • هاتيـە •

(شكەفت) ـ نافداره • وەكـــەخاني دچيادەهاتنە چێكرت •

(شكەفتنا) ـ گوندەكەل ناف رەمـايە ع (الكهف) •

(شرش) پەرچاك پەمبـوێ ژەندي يە • شرشـــەك پەمبـــــو بدە رەوشێ • ڤێ شـــرشێ ژمەره برێسە •

(شـــر) ـ يا شرشـــر • دەنگێ آفێ يـــە : ـ بوشرشرا آفێ • آفێ گۆ شر وهاتەخوار • شـــرين ژێدەرێ وێيە • ع ( صـوت صب الماء ) •

(شوژ) ـ زغور وبەرێ هـــورن • كەڤرێ پەرچەكريوپەرچـێ هورن • وكە ستريێ شـــوژي توژن •

(شف) ـ دارەكي زراڤە • مـرۆڤ بدەستێ خوە دگري • شـــڤا خێزەران ـ شڤا هنارێ ـ شڤا دارێ •

شڤا زێر :ـ

بەژنا زراف شـــڤا زێرە

پۆز بقولێ خـــزێم تێرە

ئەز خەبتیم تـو خەبتي
لێلێ گەورێ ! ماژخەلکێ رد
شقێ دارا گەلەک جۆراژوان
زەمبیل ومەکەب وسەلکا چێدکن •
ع ( عود غير غليظ بيد الرجال•
منها الخيزور ) •

(شلف) ـ ئەو هاسنێ سەرێ رمێ
یە • ئێ پان ودوآلي توژە •
لێ نفشەک هـــەیە ـ زراف
وتوژە وەکە سەرێ تیرێیە •
چاواکۆ هنک ژوان بپارسونە•
( رأس الرماح ) •

(شريق) ـ دەنگـێ لێدانێ یـــە •
پاشێ بویە تەقایی • ع ( کلمة
صوتية تسمع من ضــــرب
الاسياط ) •

(شرک) ـ ژدار وتەنەکە چێدکـن
ودخن سەر دیوارێ خاني •
آڤ تێرە تێخوار • شـــرر
دەرباس بویە • دەنگێ شرر ـ
ژشرکێ تێ • ع (مزريب)•

(شرک) ـ گولک وگـولابەندن •
دبێژن : گـەورێ شـــرک
بەژنا خوەدە بەردانە •

دوسەد بەنبو کـــەمەر
زێـــــرە لپشـــتێ
ســەرێ شـرکا دهـاتە
ســــەر تەنشـــتێ
دایرۆدە دئەفریقادە خویادبن•
ع ( بمعنى الشراشيب ) •

(شکک) ـ ناڤێ ایلەکە مەزنەکوردە
لراژۆرێ کوردســــــتانا
بندەستێ عەجەم دکـــەڤێ •
مالا علیخانێ جازێ ـ اسماعیل
خانێ شکاکي ـ سمکۆ مەزنێ
ڤێ ایلێ نە • ســـەرپێهاتییێ
شکاک وملا دوەلاتێ مـــەدە
ـ لجزیرێ نافدارن • وادیارە
ئەڤ ایل ژجزیرێ چــــویە
ایرانێ • مالا (عبدالله ئێ‌عیسۆ)
مەزنێ وان بو • ع ( عشـــيرة
کوردية في شمال کوردستان‌ایران)•

(شکەفک) ـ ژدار چێدکرن تێدە
خوارن دخوارن ـ هـــەڤـــیر
دکرن • ع ( ئوان خشبية ) •

(شلەک) ـ ئەو تشتێ شلە ســـاڤارا
وە شلەکە ـ آڤ دســـەر دە
هەیە ـ زوانەبویە • (شلکي)

نانه • دەرباس بویه • ژشـل
ـەرکـــەتیه (ئـــەك) ژبۆ
ژێدەبونه • ع ( يقل في الاكل
ـ الطبخ • اذا كان فيه رطـوبة
الماء ) •

(شمك) ـ ژن دخن پيێخوه : ـ
ئەيلۆ چـويه قرشـــكا
لـــێ ئـــەيلۆ ! زراڤێ

بوشـــەقشەڤا شـــمكا
لێ گەورێ ! زراڤێ ••
شمك زێريني ـشمكا زێريني•
ع ( البابوج ـ الشـــخاطة ـ
النعال ) •

(شنك)ـ دســــەر آنيا مرۆڤ ره
ـ نـــەرمكەك بچوكـــايى
هەيه • ناڤێ وێ شنكه • ديكێ
شنك • ئەوه كۆ بێ كومك
بي • دشەرا ده فەنەكه • لێ
ديكێ شـــــنك نەگەلـــەك
برومەته • هن دبێژن:شلك•
دبي ئـــەڤ بێتر دمـــرۆڤا ده
راستبي • ژبەركۆ دســـەرێ
مرۆڤا ده ئەو شون شل ـ نەرم

دمێني • ع (اليافوخة) •

(شرنگ) ـ شرنگين • ژێدەرێ وێ
يه • دەنگێ هاسنه • وەكـــه
شنگ هاتيه • شنگ ـ شرنگ
بەيەك داخـــــوازێ نـــه •
ع ( صوت الحديد ••• )•

(شـــلنگ) ـ نفشەك ژتـــرۆزي
وپەتيخـــێ درێژه • بێتـــام
ونەخوشه • آڤيه • جـارنا
ژمرۆڤێ درێژ ره تێگۆتن •
تێدەكێماني هەيه • ع ( نوع
من البطيخ ) •

(شنگ) ـ وەكه شرنگ هاتيـــــه •
ژێدەرێ ويشنگين هـــاتيه •
تفنگا بارام گۆ شنگ وتەڤيا •
بارام شـــەقامەك ـ زلاك •
ل روێ فەرهاد خست كركۆ
شنگين ژێبێ • ع ( كلمـــة
صوتية ) •

(شل) ـ بداخوازا تەر ـ بآڤهاتيه •
كنجێ بارام شل بونه ـ باران
لێ هاتيـــه ـ آڤ لێ بويه •
شلەك وشلكي ـ شـــلك•

ژڤر دەرکەتنە :ـ

هەي گولبو گولبو گولبو
رحـــان وقـــەرنەفل بو
بارانێ لێ‌کر شل بو ••

شلي ـ شلایي • ژ شـــل • دەرکەتنە • شـلي چـــاخ ودەمێ باڤن • شلایی جهـێ باڤن • یان شلایی ـ شليتي ـ ژشـلي درەکـەتنە • ژێدەرێ تێنەپەرن • شلکرن تێپەرە • ع ( الرطوبة ـ أو المـرطب )

(شندۆل) ـ خەراب ـ نەباشە :ـ

صەمەدي چاڤێ رەشـــبەلەك
گەلەك شـــندۆلا ژنێ
خـــوە بەردانـە •••
غزال !

شـندۆلێ مێرێ تـــەمر
لســـەر مـەگري •••

شندۆ • بویە ناڤی مرۆڤـــا • شندي • وەکە شندۆ یـــە • شاندي ـ پەیك ـ قاصـــدە • واخویایە شـــندۆل مێـــرێ خەرابە • ع ( الرجل الـذي دون زوجته • سواء أقل جمالاً ـ أو أكثر عمراً او أقل حسباً • أو أقل عقلا وكمالاً ••• ) •

(شەردان) ـ گۆشتێ خاف وزوایە • زڤستانا رادخن ـ زوادكـــن وهلتێنن ودربەرە دخـــــون دخن ناڤ پاچکا ودادلەڤێنن • ع ( القديد ) •

(شڤان) ـ درستەکۆ ( شەڤـڤان ) بي • ژبەرکۆ پـــەز بێتـر بشەڤ دچێرێنن • وەکـــە شەرڤان • لێ دو (ڤ) بهەڤرە بچڤـــن یـــەك تێ آڤێتن ع (الراعي) •

(شمادان) ـ شەمعدانە • جهێ کـۆ شما دخنێ • یا پاچـــەکي شماکرییە • (المشمع) •

(شکاندن) ژێدەرێ تێپەرە • شکاند ـ شەکیناند کرناوییە :ـ

دلبەر شەکیناند شەکەرەك
فقلت یا روحـــي ! متى ؟

بارام دار شـــــكاند ـ دا: شكەست • ع ( كسر الشـيء من الفعل المتعدى ) •

(شـــكەستن) ـدا ر شكەســـكت • ژێدەرێ تێنەپەرە •ع( مصدر اللازم من الكسر ) •

(شلبون) ـ ژێدەرێ (شـــــل)•• تێنەپەرە •

(شلكرن) ـ ژێـــدەرێ تێپـەرە • ع ( مصدران من فعل (بل)ـ أو رطب ) بلل •

(شياربون) ـ ژێدەرێ ـ شـياره ـ هوشياره • تێنەپەرە • بارام شياربو •

(شيارکرن) ـ ژێـــدەرێ شـياره ـ هوشياره ـ تێپەرە • من بارام شيارکر • ع ( کلاهمـا مصدران لشيار ـ اليقظة ) •

## ( شۆ •••• )

(شۆ) ـ ژێدەرێ تێپەر شـــوشتن هاتيه • گەرەکە ئـــەم خـــوە بشۆن • ايرۆ رۆژا شوێيە• بەرشۆ ـ کراـــێ کۆ رۆژا شوێ لخوە ـکن •ع(الغسيل)•

(شۆ) ـ بداخوازا زەواج • هاتيه • رەشێ شۆ نەکريه ؟ ياني هێ نەزەوجيـــــە • ژێدەرێ وێ شۆکرن ـ شۆکردنە •لناف سۆرا گەلەك هەيه •کورمانج دبێژن :ـ نوشۆك ـنشوك ـ نشروك :ـ

دەبهێر بهێر دايکـــێ !
تەچەژمنـــــە خوايکێ !
ئەزێ تەبدم نشروکێ ••

سەرشۆ • رۆژا شوشتنا سەريا يە • سەرشۆك کێزين • ئەو جهێ کۆ تێدە سەرێ خـــوە دشۆن • جلشۆ • آکۆ جلـ کنجا دشۆيی • جارنا ژهەڤرە دبێژن :ـ قەي شوا نە هاتيه ؟ تە تودخوازي لتەخم ياني لاشێ تە دخوەري دخوازي لێدانێ• دەشۆ ، آقا کۆ پێ دەستێ خوە دشۆن ـ فراخ وپيانێ خوارنێ پێ دشۆن ـ ددن ســـەوالا • ع ( لها معان کثيرة منها الغسيل

والزواج ) •
(شۆربە) ـ ناڤدارە ـ تەڤایی هاتیە •
کوردوترک وعــرب دبێژن :
شۆربە • بەلام ئەگەر ژ شرب
هاتبي عربيیە • لێ کــۆ ژ
شەراب یا شــۆر • هــاتبي
کــورديیە • لــێ نــزانم
ژکوهاتیە • ع (معروف) •
(شۆپ) ـ رێچ ـ شوپگێر ئێ کــۆ
شۆپێ دکاري ناس‌بکی
بگــــەرێني ـ شــۆپگەر •
دبێژن :ـ خانيیێ بارام هاتیە
ڤەکرن ـ دزا مالێ وي بریە•
شۆپا خـــوە بریە گــوندێ
فەرهاد • ئەڤ شۆپ شــۆپا
رەشۆ یە • ع (الاثر) •
(شــۆخ) ـ دارا ســـپیدارە •
دخوەشخوان وشعرێ کوردي
دە گەلەک هاتیە • ـ شــۆخ
وشەنگێ زهــــرە رەنگێ ـ
آورێ هــەیبەت پلنگێ •••
ع ( الحور ) •

(شۆر) ـ خوارنا خویا وێ زێدەیە•
ئەڤ شۆربە شۆرە • خـوێ
وێ زێدەیە • سۆران دبێژن:ـ
سوێر • بەهدینا دبێــژن :ـ
ســـویر • شـــۆرک ناڤێ
گوندەکی یە • شۆرێ • ناڤێ
جيیەکيیە • آڤ‌شـــۆر ـ
آڤ‌شۆرک • خوارنەکـە •
لێ سیراڤک • ژ آڤا کۆ تێـدە
ترشي ـ شۆري دکەسدێنن•
رەوشێ ! تەسیراڤک •
آڤ‌سورک بەردایە ســـــەر
ایسۆتێ خوە ؟ ژنەورا ئــدم
کارن بێژن :ـ سوێر ـ سویر•
ژ آڤ ســورک ـ ســیراڤک
هاتیە • یانی دناڤ بەرا شۆر
وسویر دە ئەڤ هەیە : شۆر
تێ خوارن • لێ ســویر نایێ
خوارن • ع (المالح) •
(شۆر) هەڤدي‌خوارنا دوتشتا یە کۆ
دهــەڤدەنە • پاشێ بویــە
تەڤایي • ئەڤ برغي ـ برغـە

شۆر بویه • هەڤ خوارنە ـ لەڤ بویه ـ خر بویه • بداخـوازا سست هاتیه • کەمەرشـۆر ـ کەمەرسستە ع (الارتخاء) •

(شۆر) ـ ناڤێ قادەکێ یە • لجزیرێ دکەڤی • دبی ئەڤ ژي آخا وێ شۆربي • ژلـەورا ناڤێ وێ بویه شۆر •

(شۆر) ـ گال گال ـ چێر ـ قسـه • گۆتن یا پەیف • کورداغی ولۆ دبێژن •

(شـۆرش) ـ ئـەورەیە • دبـي ژشەورەش ـ شـەڤرەش هاتبي • لێ بفارسي نزانم ژکو هاتیه • فارسي وکـوردي دگەلەك گۆتنا دە هەمپـارن• زمانێ کوردي وەکە هەمـو زمانێ دنیایێ تیکەلبویه • بەلام لجەم من چە گـۆتنا کـۆ دکوردي دە جهێ خوە گرت کوردیه • (الثورة) •

(شۆش) ـ بانکرنا کەرا یە • یـاني راوستە ـ مەچە • دشعرەکـە من دە هاتیه •

(شۆلاڤ) ـ شۆلتاڤ • ژخـوارنا گەلەك رۆن رە تێ گۆتن • یا شۆرآڤ • خـوارنا کـۆ بێدان ـ کێمدان بي •شۆلتاڤە• یانی نایێ خـوارن • بارام دبێژي ژنا خوە بخوەدێ ئەز ڤێ شـۆلتاڤێ ناخـوم ـ ڤێ شۆرآڤێ ناخوم • ع ( الماء المالح ) •

(شۆلك) ـ نفشەك گەیایێ کـۆ بـەردگري وبـەرێ وي تێخوارن • وەکو شۆقلانە • لێ تێنە چاندن • هن دبێژن :ـ ماشك • ع (الماش) •

(شۆقل) ـ وەکە شۆلك لێ گەلەك نفشێ شۆقلا هەنە :ـ شۆقلێ گا ـ شۆقلێ چوکا ـ شۆقلێ کەوا ـ شۆقلێ هەسپا •• تەنێ هەمي ژبەر خوە لچۆلێ شین دبن وتێنە خوارن •

## ( شێ ••• )

(شێ) ـ رەنگەکە • دناڤ بەرا سۆر ورەش دەیە•دهەسپ وقانترادە

خوێدکی :ـ هەسپێ شـــێ (شێني) ـ آفانی ـیە • گوندێ مــە

ـ مەهینا شێ ـ قانترا شـێ •

ع ( لون بين الاحمر والاسود )

(شێگۆ) ـ ایلەکە مەزنە • لچیایێ

(ساسونێ) دکەڤي مالاشێگۆ •

(شێرکۆ) ـ شێرێ چیا • کۆ ـ کۆە

بفارسي چیایە • سۆرا دبێژن:ـ

چێو ـ کێو • شێرکۆ بویــە

ناڤێ مــــرۆڤ • شــــێرکۆ ـ

أسدالدين کورێ شادي کورێ

مروان •آپێ یوسف صلاح الدين

کورێ ـ أیوب ـ نجم الـدين

کورێ شادي کـورێ مروان

ئێ کوردن • ناڤـــدارە • لێ

بکورمانجي گۆە ـ گۆشـــە •

دبي شێرگۆ ـ شێرگوە بي •

وێ چـــاخێ کـــوردیـیە •

ع (أسد الجبال أو أذن الاسد)•

(شێرۆ) ـ بویە ناڤێ مرۆڤا • ژشێر

هـتیــــە • ئــەڤ (ئۆ) دناڤێ

کوردی دە گەلەک هاتیــــە

ژلەورا ئەم نکارن تەڤا دڤـردە

بێژن •

شێن بویە • مەزن بویە ـ آڤە

بویە • ژن ژ دەلالێ خــوەرە

دبێژن : ـ شێني :ـ

وەرە شێني ! وەرە شێني!

تو تۆزییێ چاڤا لم دشکێني••

چاوا خۆرت ژي ناڤێ یارا خوە

شێني دبێژی :ـ

شێنا من هەیی شـێنا من

شێنا من گول شێنا من••

شان • جهێ هنگوف • شێن•

گوندی آڤا • ژشون ـ دەر ـ

جي هاتیە • شێني ـ دەلال ـ

یار ـ دۆست • یاني لبەر دلێ

من شێن وشێرین ومــەزنە •

یا بهارا دلێ منە ـ بهارا دلـێ

دۆست ویارە • ع ( السواد ـ

العمران ) •

(شێب) ـ شێب وعەربان•دو گوندێ•

ناڤـــدار وآڤـــا ومـــــەزن

لناڤ بـــەرا بازارێ ماردین و

دێرکا چیایێ مازي دکەڤن •

(شێبێ) گونـــدەکە لنــاف هەڤێرکا دکەڤي • خــــەلکێ في کوندي دســـالا ١٩٢٧ دە داکەتن کوردستانا ســـــوريە وگوندەک بناڤێ شێبێ ـ شيبانية آڤاکرن • لێ دەما ڤەگەريانــە وەلاتێ خوە أڤ گوند کەتـــە دەستێ مرۆڤەکي عرب •

(شێپ) ـ کەلي يەکي تەنگە لناف ايلا رەما دکەڤێ • دبێژنێ : شێپێ رەما ـ ايرۆ دبێـــژن پەترۆل ـ گاز ژێ دەردخن • واديارە کــــۆ شێپ ژهرجهێ کـــور وتەنگ رە تێ گۆتن • يا دهن شيوادەتێ گۆتن • ع ( مضيق ضيق ) •

(شێت) ـ دبي ژشـــــەيدا هـــاتبي • بداخوازا دين هاتيە • دشعرێ م دە هاتيە ( شەل و شێت ) • ع ( المجنون ) •

(شێخ) ـ ژعربي هاتيە • مـــەزن • دزانين وژين وپايەداری دە •

(شێر) ـ ناڤداره • شێر أزدين شێر شێرێ خوەدێ • ميرێ بۆتــا بو • ئەڤە ئێ کۆ دشـــەرێ بدرخـــان پاشــــادە بو دژمنێ آبێ خوە وهڤـــالێ دژمن بو • زۆر وسەتەما ازدين شـــێر ومسوربەگ هێژي کـــــورد دشــــــەڤ بهێرکا دە دبێژن • ع ( الاسد ) •

(شێور) ـ دبي ژعربي هاتبي • مشورە •

(شێورێ) گوندەکـــە لژێرێ قامشلۆ دکەڤي ( شێرش ) • گوندەکە لدەشتا هەســـــارێ دکەڤي •

(شێز) مێشەکە چەپەلە • لکوچـــکا داتيني ـ ژەهرينيي يە • بکـــو ڤەدي بلندکي • ع ( ذبـــاب مشهورة بالكلاب ) •

(شێڤ) ـ بداخوازا شەڤە ـ شەوە • لناف هەڤێرکا ولۆ دبێژن •

(شـــێل) ـ يان تـــــەيل • رەوش وپەرگـــالە :ـ

سوارێ پاشي سوارێ هەسپەکي
چيل وبۆزی دێل بـحنە
شێل وتەمتيلا في سواري

تەمتیـــلا رزایـــە ...
لێ دڤردە خویا دکی ( شـێل
وتەمتیل ) عربی‌نە : شـــایل
وتەمثیل . ژ(شال) هاتیـــە .
لێ کـــەس نزانی عربی‌یـــە
ژبەرکۆ دناڤ زمانێ کوردی
دە وندا بویە . ع ( الوضع ).

(شێڤل) ـ دآژۆتنا جـــۆتکاري دە
شێڤل ئەوەکۆ گیسن گەلەک
نەچي بن قادێ ـ زەڤی‌یێ .
گیسن شێڤل بکە . جۆتێ تـە
شێڤل هاتیە . دبي ژ سێڤل ـ
زەعیف . هاتبي . ژبـەرکۆ
جۆتێ شـێڤل زەعیفـــە .
ع(الفلاحة البسیطة ـ الضعیفة).

(شێرگەل) ـ ئەگەر گەل بداخوازا
مللەتە . شێرگەل ـ شـێرێ
مللەتە یاني ژمللەتێ خـوەرە
شێرە . دبێژن :ـ حاء ؟ بارام
شێرگـــەلێ مـــالێ یـــە ؟
توشێرگەلێ منـــي . دبـــي
ژکەلەشێر هاتبي ژبەرکۆ تـم
ژن ژ مێـــرارە ولۆ دبێژن .
کەلەشێر لجەم هـن ســۆرا



بداخوازادیکە . ع ( حـامي
الزمار ) .

(شێلم) ـ عرب دبێژن :ـ شـــەلغەم
شلغم هن دبێژن شـــەلم بەلام
نەعربی‌یە . ژبەرکۆ کـــرن
ژێ دەرناکەڤن . ع (الشلغم).

(شێرین) ـ بداخوازا ( حلو ) هاتیە:
پادیشـــــەها ئـــەڤینێ
کەن شەکەر وشـــرینێ
خوەشکر جهـــێ برینێ
ئەم دلخوەش وبنازن .
هن دبێژن :ـ شێرین وهـــن
دبێژن : شرین . هــــــەمو
بداخوازا . ع (الحلو) نە .

(شێرین) ناڤێ ژنایە . لێ دۆســتک
ویارا فـــەرهاد بڤي ناڤي دەنگ
دایە . چیـــرۆکا فەرهـــاد
وشێرین لکوردستان چێ‌بویە
وبفارسي هاتیە نڤیسین.لجهانێ
دەنگ دایە . دخوەشـــخوان
وشعرێ کوردي دە گەلەک
هاتیە . ع ( قصـــــة شێرین
وفرهاد المشهورة . وهي‌عشیقة
فرهاد وزوجة الملك خسرۆ ) .

(شـێروان) نافـێ درەبەكي يەكـه كوردە • ل‌راژۆرێ بۆتـا ـ بەختا دكەڤي • ل‌ناڤ كورمانج گـەلەك چـیرۆك دبوار. شێروان دە هاتنە گۆتن • ناڤێ وان بنەزاني وبودەله دەركەتیە:

زدەردێ شـەربەتا ژاژي
مەدل تێكدە بوە كەشكە
دترسم شێرويي يەك‌رابي
مەجالا خوە ل‌بەر خوەشكە

## ( شي ـ ئي )

(شيني) ـ ژ رەنگێ شين دەركەتیە • بەلام راستە كۆ بهاتا گـۆتن كەسـك • ژبەركـو رەنگێ گەيا نەشـينە ، كـەسكە • دبێژن :ـ ايرۆ گەيا شين‌دكي• ياني شـين خـويادكي • شـين‌هات ـ ( نبت ) أو ( اخضوضر ) • كوردێ‌سۆرا دبێژن :ـ سەوز ـ سـەبز • بەلام كـوردێ كـورمانج دبێژن : كەسك • ع(أخضر) ـ أو الخضروات •

(شيني) ـ ئەو مرڤێ حەزني يـە ـ ـ غە مكـيرە • هن زمالا وا مرنە ـ هاتنە كوشتن • كنجێ شين وەرگرتنە ـ شـينا وي دكن ـ ل‌خوە دخن ودگرين• ئەم شينيێ نە ـ حـەزنيێ نە ـ دل‌بغەمن • رەش گـرێدان وەكە ويێ يە • ع (حالةحزن)•

(شيراني) ـ هەمو تشتێ شـێرين شيرانيیە • هەمو تشتێ كـۆ ژشێرين چێ‌دبي شيرانيیە • ع ( الحلويات ) •

(شيراني) ـ خوارنا شـيرانيیەكۆ دپشتي خوەستن ودەستگیرانێ دبن مالا باڤێ بوكێ دخـون ـ ڤەدخون • دبێژن :ـ رەشـۆ رەوشێ خوەسـتیە • یەك دپرسي :ـ خوەدێكی راستە ؟ دبێژی :ـ هۆ ••• شـيراني ژي خوارنە • ژ(شيره) هاتیە• نە ژ (شير) هاتیە • ع ( أكـل الحلويات بعد الخطبة ) •

(شيپ) ـ شەلالە • یە • ل‌بەر آشـا خويادكي • آشـێ شـيێ ـ آشێ بیرێ ـ آڤا كۆ سـەـ:

زێر بي نافێ وێ شـــيه •
ع ( الشلال ) •
(شيرەت) ـ ژعربي هاتيه • شيرەتێ باش • شيرەتێ خەراب •
(شير) ـ كۆكا ماست ورون وقاتغه• گەورێ شير دۆشه ـ شــير ددۆشي • گەلەك تشت ژشير فەدكەڤن : ـ ماست ـ دەو ـ نيڤشـــك ـ تو ـ قەيمـاغ ـ جۆرتان ـ ژاژي ـ تۆراق .. پەنــــير ـ رون ـ دەوێژ •
ع (الحليب) •
(شـــيرشير) ـ دەنگێ چـــوكـ وچڤيكايه • وەكه : ـزيرزيرـ زيروير ـ ڤيژڤيژ • ع (صوت العصافير ) •
(شيش) ـ بستەكه هاسنيي‌يه • شيشا تەنورێ ـ بستا وێ يه • دبي عـــرب ژي ولۆ بێژن :ـ لێ تەعربي‌يه • پێ داغا دكـن •
ع ( الاسياخ ) •
(شيش) دانەكي كوتايي ونەكەلاندي نافێ وي شيشه • شيڤا مـــالا بارام شيشه • گەنم دكـــوتن ودهێرن ودكن گرار ودخون•
ع ( طبخ من الحب المدقوق )•
(شيف) ـ شيف خوارنا ددەســتيێك شەڤێ دەيه • پاشيف دبەرێ سبێ دەيه • تاشتێ ـ فراڤين ـ شـــيف • خوريني بـــەري تاشتێ • زو خوريني دخـــوي ونێزيكي ساعەت ٨ـ٩• تاشتێ دخوي • پاشێ قيـالە ـ پاشێ فراڤين ـ پاشێ قياله ـ شيف • پاشيف درۆژي‌يێ دە هەيه • لێ خوريني وقيالـه خوارنەكه ســـڤكه وژبۆ كاركەرايه •
ع ( انعشاء ) •
(شيلاف) ـ گول هەيه ـ گولشيلاف هەيه • گولشيلاف بێ بيناه • كورمانج دبێژن :ـ دەمـــەكه گــــولێيه ـ دەمەكــــــــه گولشيلاڤێيه :ـ

م دەســـــتێ خوه آڤێته
گـــــولێ نەوەشـــيا
م دەستێ خوه آڤێتـــــه
رحـــــــانێ نەكشـــيا
م دەستێ خوه آڤێتـــــه

كولشيلاڤێ نەژخوەشيا
ع ( نوع من الورد لارائحـة
لها ) •
(شيلاڤ) ـ پزي ـ مالكاره • جهێ
كۆ زارۆك ژێ دەردكـەڤي
ع ( الرحم ) •
(شيف) ـ شيفا دەري هەردو رەخێ
دەري‌نه ـ شيفا دەري‌ێ بارام
هلوشـــيايه ـ هـــەرڤي‌يه •
ديوارێ بەر دەري ـدەرگەـ
دەر • هلوەشيايه ـ هەرڤي‌يه•
ع ( كلا جانبي الباب ) •
(شيق) ـ شيق‌شيق ، دەنگێ بلنـــد
وبێ‌تۆره وبێ‌داخوازه • چـه
شيق‌شـيقا تەيه ؟ ژێدەرێ‌وێ
شيقين • ع ( كلمة صوتية ) •
(شينۆك) ـ قزوان ـ كـــزوان •
ل‌دارا دكەڤي • لـــــەرێ
چيايێ كوردستانێ بێ خوەدينه
دخن ناڤ مەويژا ودخـــــون
دكن صابون • ع ( قزوان ) •
(شين) ـ دشينی‌ده دەرباس بويه •
رەنگەكه • وكـــه رەنـــگێ
ئەزمـــانايه • لێ كـــورمانج
ژگەياره دبێژن :ـ شين بويه ـ
شين هاتيه•ع (اللون الازرق)•
(شين) ـ حەزن وغەمگـــيري‌يه •
دەرباس بويه :ـ
هەيلا دينێ هەيلا دينێ !
بزيـــارەتا لنصـــێبينێ
مێرك بمري ناكم شينێ
(شيوه) ـ يان شێوه • بداخـــوازا
(لهجة) هاتيه • لناڤ سـۆرا
تێ‌گۆتن • زاراڤ دكۆكـــا
خوەده ( لهجه ) يه • لێ شيوه
خوەش تره • ع ( اللهجة ) •

( غ • • • )

بەري هەرتشـــتی دڤێ زانبن
ئەڤ (غ) نەكوردي‌يه•ژلەورا
دبێنن وشه ـ گـــۆتن تێ‌ده
بكوردي گەلەك كێم ، يانينن•
ئەڤ گۆتنێ كۆ ئەم دنڤيسن نه
بجارەك دكـۆكا خـــوەده
كوردي نه •
(غەيدا) ـ ناڤێ بەستاكه‌كورمانجي‌يه:
ئـەزێ بێژم مەغـــەيده
لێ‌لێ غەيدا !
راموســـــانكێ بده من

لێلێ غـەیدا !
سبا فی چـاخی عـەیدە
لێلێ غـەیدا !
ع(اسم لأغنية كوردية للرقص)
(غەیدا) ـ ناڤێ گـوندەکی آڤایە لژۆرێ ( بەدلیسێ ) دکەڤی• شیخشهابالدین وسـیدعلي نفيیێ غەوثێ ھیزانێ کـۆ دسالا ۱۹۱۳ دەھادە لبـەر دەولەتا ترك لەپ ھـلانێن وھاتن بدارڤەکرن ژکـوندێ (غەیدا) بون •
(غـەرزا) ـ یان خـەرزا • دەرەبەگییەکە ناڤـدارە دەرباس بویە •
(غـەررا) ـ لراژۆرێ چیـایێ (عبدالعزیز) • گـوندەك ـ ھەریمەك ـ دەھمەك • ھەیە ناڤێ وێ ( غـەررا ) یە • آخـا وێ سـپي یە • زعربي ھاتیە • ع ( اسم مكان شمال جبل عبدالعزیز ) •
(غەمبار) ـ ئێ کۆ غەم لێ دباری ، یا بونە بار لسەر ملێ وی •
(غەر) ـ دلیستکێ دە پـەیدا دبن • ژکەڤر وشوشە چێ دکـن •
(غەمخوار) ـ ئێ‌کۆ غەما دخوی کرۆکە •
(غەمگیر) ـ ئێ‌کۆ غەما دگـری • ع ( الكلمات الثلاثة بمعنـى الحزين ) •
(غەمھلگر) ـ ناڤێ مرۆڤەکي یـە دگۆتنێ پێشیا دە ھاتیە •
(غونا) ـ ناڤێ پەرچاك قادە لژێرێ بازارێ (حسكە) ل جـزیرێ دکەڤی • دھاتن وھـەبونا خوەدە بناڤە • ع ( مقاطعـة صغيرة جنوب شرق (حسكه)•
(غورغور) ـ دەنگێ بایێ زکـە • دبێژن :ـ غورغور ژناڤا بارام تێ ـ زکـێ وي دکـي غوغور • ع ( صوت يأتي من بطن الانسان والحيوان ) •
(غرێ) ـ ناڤێ وێ گەرێزێ یە کۆ پێ تەختا بـھەڤە شـێرێز ـ پارچیم دکن •
(غرغر) ـ دەنـگێ لھەڤ کەتنا ـ لھەڤخستنا ھن تشتایە •

## ( فا ـ • )

(فاشيست) ـ آوره‌كه • ل ايتـــاليا
ده‌ركه‌تيه • ژخوه‌پێڤه كه‌سي
برومه‌ت نابێنن • چاوا كـــۆ
(نـــازي) ل‌ئه‌له‌مانيـــــا
ـ جه‌رمه‌نستانێ ده‌ركـــه‌ت •
مۆسۆليني وهێتله‌ر ـ رێبه‌رێ
ڤان هه‌ردو آورێن دژوار بون•
لێ ژێ كارنه‌كرن • دايرۆده
تێ‌گۆتن ژبۆ هـــه‌مو آورێن
قه‌ومي ئێ دژوار وخـــوين
خوار كۆ ژخوه‌پێڤه كـــه‌سي
برومه‌ت نابێنن• ع(معروف)•

(فارس) ـ يان (فرس) ناڤێ ملله‌تێ
ايرانه • لێ دبن ڤي ناڤي ده
گه‌له‌ك ملله‌ت هـــه‌بون •
ژمه‌زنێ وا ملله‌تا :ـ ( كورد ـ
ده‌يله‌م ـ جيل ـ گيل ) بون •
ته‌نێ‌ايرۆ ناڤێ فارس بويـــه
ناڤه‌كـــى تاريخى ژبۆ ايران •
هه‌روها بويه ناڤ ژبۆ مێرا ره‌•
جارنا دبێژن :ـ فارۆ • مـــالا
فارۆ مـــه‌زنێ ايلا په‌نجي‌نارا
بون • ( بشـــار وجميـــل )
كورێن (چه‌تۆ) ناڤـــدانه •
ع ( اسم يشمل جميع القوميات
في ايران القديم ) •

(فانۆس) ـ له‌مپـه ـ ل‌پاش چـــرا
هـــاتيه • فانۆس ژله‌مپـــه
مه‌زنتره بده‌ستێ خوه دگرتن•
دهندروێ وێ ده فند يا مـــوم
ڤێكه‌تي بو • لێ بچـــه‌زاري
ـ زماني هاتيه گۆتن نزانم •

(ڤه‌تفاق) ـ گلي وگـــازنێ زێده‌نه •
ع ( التشكي بكثرة ) •

(ڤاف) ـ ڤاڤێ كه‌ڤـــه‌بازاره‌كه •
ل‌ناڤ ئۆمه‌ريا ، ل‌رۆژهـــلاتێ
(ماردين) دكه‌ڤي •

(ڤل) ـ عربي‌يه • لێ دكـــوردي‌ده
گـــه‌له‌ك هاتيـــــه •
( ڤالاڤـــه‌ره‌چي‌يێ ) شعره‌كه
منه :ـ

رۆكێ يه‌كـــه قه‌ره‌چي
ره‌ش وبێ‌خواس‌وبرچي

## ( فه ـ آ )

(فه‌رفه‌را) ـ ناڤێ چه‌مه‌كى ل‌جزيرێ
دكه‌ڤي • ع ( اســـم نهـــر في

الجزيرة ) .
(فەنا) ـ بداخوازا : وەك ـ لاي ـ مينا . هاتيه . دبێژن :ـ بارام فەنا نەرهاد نابي ـ وەكـــە فەرهاد نابي ـ مينـا فـــەرهاد نابي . ع ( المثل ) ك .

## ( فه ـ ئه )

(فەرسەندە) ـ يان فەرسـەند . لێ هاتنە . عرب دبێژن : (فرصة) دبي ژفەرسەند هاتبي ژبەركۆ (كرن) ژڤێ گۆتنێ دەرناچن. دعربي‌دە چـــە كۆتنا كـــۆ (اشـــتقاق) ژێ چـــێنەبي بگۆمانە . دبي ژدەرڤە هاتبي. لێ دكوردي دە فەرسـەند . بداخوازا فرصتە ـ ( كـەيس وفەصـــال ) ژی تێ گۆتن . فەرسەند بخوە ژفارسي هاتيە كـــوردي . بكورمانجـــي (كەيسە) . ع (الفرصة) .
(فرزەند) ـ يافەرزەند ـ ژ (فـەرز) هاتيە :ـ
چـــاڤێ دوی كـــۆ
كـــەتن روخــێ زين
مفت دانـــە ژدەســـت
خوە فيـل وفەرزين ..
فەرز ـ فەرزين . گەرناسەكي ليستكا سەدرەنجە ـشەترەنجە. جائەگەر فەرزەند ـ فەرزەندە ژڤر دەركـــەتبي بداخـــوازا گەرناسە . لێكۆ ژفەرسەنـد فرصت دەركەتبي بداخـــوازا كـــەيس هـــــاتيە .
ع (اسم للرجال بمعنى البطل).
(فەلسەفە) ـ باوەري يەكە زانستي ـ علمي‌يە ـ فەيلەسوف ـالعالمـ زانايە ـ پێزانە دبێژن دكۆكا خوەدە ژ يوناني هاتيە . فيـلا ـ سوف . محب العلـــم ـ زانـــين پەرەسە . بەلام فەلسەفـە دايرۆدە بويە ناڤێ پەرچـاك زانستي . ع ( معروف ) .
(فەلەمە) ـ ناڤێ جاوەكي خوەشكە. دوەلاتێ مـــەدە فـــەلەمێ هەسكيفێ ـ حەســـەنكێف ـ حصكف . نافداره . لێ نزانم ژكو هاتيه . دبي عـربي‌بي.

ع ( خام في الدرجـة الاولى يلبسونه الاغنياء في القديم ) •

## ( فه ـ ئۆ )

(فەرسۆ) ـ ناڤێ ژنایـه • ژفارس هاتیـه •

(فەرزۆ) ـ بچـوکێ فـەرزه ـ فەرزەندەیه • ناڤه •

(فەندۆ) ـ دبـاوەریا زارۆکـا ده ( فەندۆ ) باپیرێ کوچکا یه • جـارنا کـوچك دزورن ـ دقورن ـ درەین • زارۆك دبێژن :ـ بەرسڤا گورا ددي • گور دبێژی :ـ رایه ، بەسه ئەمێ لهەڤ بێن ـ ببن دۆستێ هەڤ • لێ کوچك دبێژي :ـ نابی ، نابي •• هەتا فـەندۆ ژگۆرێ رابي • گۆیا فـەندۆ باپیرێ کوچکایه بدەستێ گورا هاتیه کوشتن •

## ( فه ـ ئي )

(فەدي) ـ فهێت ـ شـەرم • بارام فەدي ناکي ـ شەرم ناکـي ـ فهێت ناکـي • فەدیکـاري ژێدەره • ع ( الحیاء ) •

(فەندي) ـ ناڤێ مرۆڤـایه • دبي ژ ئەفەندي هاتبي • خـەلکێ سلیماني دبێژن :ـ ئـەفەنی ـ ئەفەندي • (د) تاڤێژن •



(فەرات) ـ ناڤێ چەمەکي ناڤـداره ژکوردستانا بن دەستێ ترکـا دەردکەڤي • دسوریا وعـراق ڤه دچي سەر دەریا هورمز • ع ( فرات ـ معروف ) •

(فەرهیت) ـ یان فەرحیت • هیـم وکەڤرێ مەزنه • گـەلەك جارا ژبۆ مرۆڤاره تێ گۆتن : بارام فەرحیتاکي مێرایه • یانی مێرەکي وەکه فەرحیتەکی یـه (هێت) دبي ژڤر دەرکەتبي • بداخوازا دیواره • ع ( الحجر الكبير أو الصخرة ) •

(فەلات) ـ رێزگاري وخلاصـه • فەلاتا وەلات ـ رێزگـاریي نشتمان :ـ

هەردڤێ ئەم پێش کەڤن

بۆ وەلات وبۆ فەلات •
(فەليت) ناڤێ مرۆڤایە • ژفـەلات ـ
رێزگاری هاتیـــە • فـەلیتێ
قوتۆ • ناڤداره ـ گەرناســـێ
شەرێ قیرێیە • دیا (فەلیت)
شەمێ سترانەکە بشـــەوات
لەسەر گۆتیە • ع ( اسم بطل
في احدى المعارك الكردية ) •
(فەهێت) فەدي وشەرمە • فەهێتکاری
ژێدەرە :ـ بارام فەهێت ناکي
ـ شەرم ناکي ـ فەدی ناکي •
ع ( الحياء والخجل ) •
(فەروج) ـ بچوکێ تلور وتوتکایە :
فەروج ـ زیغـان ـ ڤارك ـ
مریشـــك • ژ چیچـــکێ
مەزنترە • دبي عـــرب ژي
جارنا ولۆ دبێژن • لێ نەعربی
یە • ژ فرۆگ • هاتیـــە •
ئەو چێلیکا کۆ بفرێ کەتیـە•
ع ( الفروخ ) •
(فەرسەخ) ـ قوناخە ـ پیڤـانەکە
کـەڤنارە یـە • لێ نـزانم
ژکوهاتیە •
(فەرسەند) ـ فرصتە ـ کەیســـە •

کۆرفەرسەند • ئێکۆ وەکـە
کۆرێ کۆ فەرسەند ژێرە بێ
کۆ فەرسەند ژێرە تێ گەلەك
ستەمکارە ، ژســـەر زکـــێ
دژمنێخوە رانابي • دەرباس
بویە •
(فەرهاد) ـ ناڤێ گەرناسێ چیرۆک
( شێرین وفەرهاد ) ە • ناڤێ
مێرایە•فەرهاد گەلەك دژواري
دریا شێرین دە دەرباس کریە
ونەگهایە داخوازێ • ع (بطل
قصة ( شێرین وفەرهـــاد )
الشهيرة ) •
(فەرز) ـ فـەرزین • ناڤێ بەرەکي
سەدرەنجە • شەرەکي پیاوانە
دکي •
(فـــەیروز) ـ ناڤێ مۆرییەکـــە
ناڤدارە ـ گرانبهایە • هـن
دبێژن : ـ پەیروز • پاشـــێ
بویـــە ناڤێ ژن ومێـــرا :
( فەیروزشـــاه ) نـــاڤێ
پادشاهەکي چیرۆکي وناڤدارە•
ع (خرز أو جوهرة مشهورة)•
(فەر) ـ یەکە ـ تەکە • زۆ ـ جۆتە•

( زۆمافـــەر ) ليزەكـــە زارۆكايە •

(فەرفور) ـ فـــەرفوري • ناڤێ نفشەك پيـــانە كـــۆ تێدە خوارنێ دخون • تەڤايي يەعرب ژي ولۆ دبێژن • دبي ژ (چـين) هاتبي ژبەركۆ كورمانج جارنا ژێـــرە دبێـــژن :ـ چێني • ع ( معروف ) •

(فەنەر) ـ وەكە فانۆسە • لێ جاو لشونا جام داتانـــين • دبي ژتركي هاتبي •

(فەرش) ـ كەڤرەكي پانە گەلـەك جاران لسەر نڤێژ ـ نوێژ ـ نمێژ ـ لمێژ دكن • فەرشێ مزگەڤتێ ـ فەرشێ كانيێ ـ فەرشێ مريا • ع ( حجـر مسطح ومستطيل ) •

(فەرق) ـ دسەرێ ژنادە ـ دسەرێ مێرادە خويادكي شـــكاندنا پۆرە • با ليـــكيدە يـــان بهەردو اليـــادە :ـ ژفـەرقا سەر حتا پێدا • ژعـــربي هاتيە •

(فريق) ژلواء مەزن ترە • ل گـۆر ناڤێ وان دبي لواء مـــەزنێ لوايەك لەشكەربي •(فەريق) مەزنێ ـ سەردارێ فرقێ بي• هەردو ژي عربينە •

(فەرشك) ـ بچوكێ فەرشـــە • دەرباس بويە •

(فەلەك) گەر وزيڤـــراندنا ددم وچاخە • بويە تەڤايي • ئـەو كەسێ كۆ نكـــاري بگـــهي داخوازا خوە گازندە ـ گازنا ژ ( فەلـەكێ ) دكـــي :ـ فەلەك مالا تە ناڤا •
:ـ ئەی فەلەك ! فەلەك !
ئەی زالم فەلـــەك !
كا ئەو كوردســـتان ؟
كا برجـــێ بەلەك ؟

(فەديۆك) ـ شەرميكار ـ فهێتكارە • ئێكۆ فەدي دكي ـ شـــەرم دكي (ئۆك) آلاڤـــەكە ژبۆ زێدەبون ومبالغە • هاتيـــە • ع ( الخجول ) •

(فەن) ـ خاپ وحيلەنە • دبێژن :ـ هەتاچوي فەنا ئەز ژفەنا هاتم•

بارام فەنەکە ـ حیلـــەبازە •
خاپ وریپ گەلەک ژێ تێن
ع ( الحيل ) •

(فەديبون) ـ ژێدەرێ (فەدي) يـە
ـ تێنەپەرە •

(فەديكرن) ـ ژێدەرێ (فەدي)يە ـ
تێپەرە •

(فەرمان) ـ أمرە • فەرمانکـــرن
ـ أمرکرنە • بەلام هنـــەک
ژزمانزانێ کورد دشـــیوەێ
سۆريدە لشونا ( کـــرن )
ـ فعل ـ ( فرمان ) دانينـــە •
لێ نەراستە • ژبەرکو لجهم
وان (فرمان وفەرمان) نەيەكن•
بەلام فەرمان ـ ( كرنا ـ فعلا )
داخوازی ـ طلبيیە•کرنتەنێ
بداخوازا ( فعل ) هاتیـــە •
ع ( الامر ) •
(فەرمانكرن) ـ ژێدەرێ تێپـەرە •
فەرمانبكە ـ فەرمانكـريە ـ
فەرمانكر ••• دفردە فەرمانـ
( أمروحكم ) ددیزانـــین •
فەرمانگە ـ مەحـــكەمەیە •

فەرماندار ـ حاکم ـ فەرمانـ
حکم هاتیەەع (الامر والحكم)•
(فەهێتكرن) ـ ژێدەرێ فەهێتـــە •
فەدي کرنە ـ شـــەرمكرنە •
ع ( الحياء ) •

## ( ف ـ ئه )

(فرچـــــە) ـ نافـــدارە پێ تۆزێ
ژمرۆڤ وسەوالا دادوەشێنن •
پاقژدکن • آلافەکي پاقژيیە•
گەلەک جـــارا ژمو ونایلون
چێ دکن • ع (الفرشة) •
(فرێزە) ـ پاشی کۆ دەخل ـ زاد تێ
چنـین نافێ وێ زەڤیێ دبي
فرێزە •
(فشفشە) ـ مرۆڤ وجانداریێ مەزن
وستورن • ژبۆ ( مارا ) جارنا
تێگـــۆتن :ـ فشفشە • فش
دەنگەکە ژپۆز وچـــونا تەبا ـ
ـ مار تێ • جـــارنا (فش)
بداخوازا پێچهاتیە •ع(الغليظ)
(فرۆکە) ـ فرندە • ع (الطيارة) •
(فرنە) ـ نافدارە •
(فلە) ـ مەسیحي نە •

(فرۆ) ـ ئەوشیرێ نوکۆ ـ پشتي زانا پەز وسەوالا ژگوهانێ وان دەردخن دکن فرۆ ودخون دبي وکە ( پەنیر ) لێ شێرینە •

(فردۆقي) ـ نان ودەوە • نان دچێني ناف دەو دبي فردۆقي • هنک دبێژن :ـ فردک • ع ( الخبز الخليط مع اللبن ـ أكل الفقير ) •

(فرت) ـ فرت فرت • رانەوەستانە• گەلەک فرتفرت ژبارام تێ ـ راناوەستي • چە فرتفرتا تەیە ؟ چما راناوەستي؟ ع ( القلق ) •

(فرسەت) ـ فەرسەندە • عەرب دبێژن :ـ فرصة • لێ کورد ژي گەلەک دبێژن • لێ دعربي‌دە • (کرن) ـ فعل ـ اشتقاق • ژێ دەرناکەفي • ع ( الفرصة ) •

(فهرەست)ـ دبي (فرهەست) بویە فهرەست • یان ژیەوناني هاتبي • بەرنامجە • نزام دکۆ کا خوەدە ژکو هاتیە •

(فس) ـ بینا گەنيیە کۆ ززک دەردکەڤي •

(فلس) ـ دپەرێ عراقي‌دە • لشونا ( پارە ـ پەرە • هاتیە • فلوس کۆما فلسە • ع ( معروف ) •

(فنج) ـ دکورمانجي‌دە بداخوازا مەزن هاتیە :ـ لفنجێ سەرێ وی ؟ سەرێ بارام وەکە فنجەکي‌یە • فنجەکي کەڤرا لسرێ وی خست • تێ خویاکرن کۆ بەرد ـ کەڤرێ مەزن بي • فنجان• ژڤر دەرکەتیە • بداخوازا کەڤری‌یە (هنجان) ژي دبي ژفنج هاتبي • ع ( الحجر الكبير ) ؟

(فرخ فرخ) ـ دەنگێ دەڤ وقرکێ یە • گەلەک جاران لبەر مرنێ ـ یان دەما کۆ عەدلۆي دبن (فرخفرخ) ـ دەنگێ فرخفرخ ژوان دەردکەڤي •

ع ( صوت دم المسفوح ـ المذبوح ) •

(فند) بچولێ وێ فندکه ژبەز وشما چێدکن • ئێ بەز دکن موم • وئێ ژشما دکن فندك • دناڤا وێ ده تایێ باداي هەنە بـآگر دشەوتن •

(فنداشەمال) ناڤێ چیرۆکەکه کورمانجیيه • دبێ فندوشەمال • بداخوازەکێ‌بن• ع (الشمعة) •

(فرياد) ـ هاوار وقیر وگازی‌یه :ـ فرياد وفیغان سەد کەسەر • ع ( الاستغاثة ) •

(فريز) ـ ناڤێ گەیاکی‌یه دناڤ قادا خورت وآڤي ده شین تێ •رهێ وێ گەلەك بناڤ قادێ ده دچن • زو ناڤەلي • لێ قادا بفريز خورته •

(فرێز) ـ نفشەك قماشه • وەکه قدیفه یه • ع ( نوع من الاقمشة ) •

(فر) ـ دەنگێ ڤەخوارنێ یه • جارنا بداخوازا هنك آف هاتیه •



فرەك آف بده بارام ـ هنك آف بده بارام • ع ( الجرعة وصوت الشرب والامتصاص )•

(فش) ـ فشفش • دەنگێ پۆزه ـ دەنگێ کەپویه ـ دەنگێ لوته• وهارەنگە دەنگێ ماره • ع ( صوت الانف والافعى ) •

(فلق) ـ پەرچه یه • ژعربي هاتیه کوردي • سوریانێ وەلاتێ مه دبێژن :ـ فەلگێ • جا (فلق) ژ (فەلگێ) هاتیه • یان (فلق) ژ زمانێ عربي هاتیه نزانم •

(فریك) ـ ئەو گەنمێ کو هێژ هشك نەبویه دچنن ودکزرێ نن • دشەوتێ نن • دکن فریك وخوارنا وی ژخوارنا ساڤارێ خوەشتره • جارنا فریك • بداخوازا نوگهاي هاتیه • هێ گەنم فریکه ـ هي جه فریکه • نوگهایه • تێ‌فرکاندن •

(فرشك) ـ ئەو شیرێ کو دزکێ کار وبەرخێ ده یه • دەما کو دمرن ـ سەرزێ‌دکن • وی

شيري دەردخن ودكن هاڤەين
زبۆ چێكرنا پەنير • ع(الحليب
في بطن الطلي والجدي يأخذونه
بعد موتهم أو ذبحهم ويجعلونه
كعنصر للجبن ) •
(فرنك) ـ بێڤل ـ پۆز ـ كەپو ـ
لوته • ع ( الانف ) •
(فرفرۆك) ـ پەروانە ـ منمنيك •
ع ( الفراشة ) •
(فشك) ـ پەرچاك رەش وەك
كەزەب لسەر ئوره • هن
دبێژن :ـ فاتەرەشك •
ع ( الطحالة ) •
(فنك) ـ بازارەكي كورديیە كو
دتاريخێ دە ناڤێ وی بمێراني
بەلاڤ بويە • دتاريخێ دە
نەهاتیە كۆ ( كەلا فنك )
بدەستێ دژمنا هاتیە گرتن •
ع ( مدينة كوردية قديمة فيها
قلعة مشهورة ) • من قلاع
البشنوية •
(فندك) ـ گوندەكە • لناف
بۆتايە • دبێژن :ـ فلانكەس
دفندكا بۆتاره دەركەت •



ددەمێ كەڤاره دە بدورى
نەڤبار بو •
(فتيل) ـ ئەو تەريش وتايێ كۆ دخن
هندروێ چرايێ ناف دۆهن •
دبێ زعربي بداخوازا
(مفتول) هاتبي •
(فتال) ـ ژپەمبو چێدكن •
ژ (مفتول) هاتیە • لهەف
پێچانديیە •
(فريال) ـ ناڤێ ژنایە • نو هاتیە
كوردستانێ •
(فلان) ـ كورد وعرب بهەڤره
دبێژن :ـ (فلان) بداخوازا
فيساره • ئەوكۆ ـ ئەوكێ ••
آلافەكە ، يان نافەكی نەناسە
فلانكەس • فلانكەسۆ ـ
فلانكەسێ • دڤردە هەردو
تەنێ يانی پەيڤۆك وگوهدارێ
وی ـ ئێكۆ دگەل دپەيڤي
تەنێ دزانن كیيە ـ كامەيە •
(فريدان) ـ بسۆرانی آڤێتنە •
فرێبدە ـ باڤێژه •
(فراڤين) ـ خوارنا نيڤرۆيە • تاشتێ
خوارنا سبەهێیە • خوريني

خوارنا سیدێ یه • شـیف خوارنا شەڤێ یه •

(فرچەکرن) ـ پاقژکرنا بفرچێ یه• ع ( التنظيف بالفرشة ) •

(فرین) ـ ژێدەرێ تێنەپەره •

(فراندن) ـ ژێدەرێ تێپەره•چوك فری ـ من چوك فراندن •

(فرکرن) ـ ڤەخوارنا تشتێ رۆنە • رۆهنە • بارام آڤ ـ شـۆربە فرکر • (فراند) ژي تێ گۆتن • ع ( تجرع ) •

(فرۆتن) ـ فرۆشـتن • ناڤـدار وخویایە • کرین وفرۆشتن ـ فرۆتن • ع ( البيع ) •

(فشکین) ـ دەنگێ پۆزە • پشـکین فرەهترە •

(فراڤین خـوارن) ژێدەرەکـە • بداخوازا کرن ـ پەیڤ هاتیە• ژڤی نفشي گـەلەك ژێدەر هاتنـه • لێ لـجـەم من نەژێدەرێ براستیێنە •

(فرەبون) ـ خربون ـ لـەقبون • ع ( التوسع ) •

(فرەکـرن) ـ ژێدەرێ تێپەره • لوله فرەبو • من لوله فرەکر• ع ( من وسع ) •

(فنجـان) ـ تەڤايیە • گەلەك نفشێ وان هەنە :ـ

هـالهالا لناڤ گـەنما
هـۆي لـەیلانێ !••
فنجانا لدەست حاکمـا
سینگ دەرمانێ !•••

## ( في ـ ئۆ )

(فینۆ) ـ کومێ سـۆره ـ کـومێ چۆخه • فەیسه ـ فاسـه • دبي رۆمي بي • ع (الطربوش الاحمر ) •

(فیلي) ـ فەیلي • ایلەکە کـوردە مەزنە ناڤداره ، کارکـەرە • دبازارێ بەغدایێ دە گەلـەك خویادکن • خـویایە کـۆ پەرچاك زلۆرن • خـەلکێ لۆرستان وکوردستانا بندەستێ عەجەمن • ع ( عشيرة كوردية شهيرة ) •

(فیت) ـ بداخوازا مەزن وستوره •

لێ دکۆکا خوه ده ناڤێ چەیه
نزانم • تەنێ دبێژن :ـ بارام
وەکە ڤیتەکی‌یە • چە ڤینفیتـە
یە ؟ یانی چە ستور ومـەزنە •
جارنا دبێژن :ـ بارام سێنان
بدەوره ڤیت‌کرن • یانی وەکە
مرۆڤ بێژی : ـ ڤیت وبەردی
گەوریا خـوه • ( ڤیتفیت )
دەنگێ ڤیکاندنێ یە •

(ڤیش) ـ ئەوروپی‌یە • هاتیە عربی
وکوردی • دخن هنـدروێ
ڤـوزێ ورۆنی ددی دوآلاڤێ
( ألتریک) ن •

(ڤیق) ـ دەنگێ کەرایە • ( ڤیق ڤیق )
ژی تێ‌گۆتن •

(ڤیشەک) ـ ئەو قالباغ وقالکێ کـۆ
بەر وبارودێ تێدەبجی‌دکن •
قاپسون دبن وێ دەیە • ژبۆ
کوشتنا مرۆڤا ـ ژبۆ کوشـتنا
برائێ خوه چێ‌کرنە

(ڤیـــک) ـ دەنگێ دەڤ ولێڤـێ
مرۆڤایە • ع ( الصفیر بالفم )•

(ڤیفیک) ـ هـن دبێـــژن پیپیک •
ددەستێ زارۆک وبێـوانا دە
خـــودیاکی • لێ ڤیفیـــکو
پیپیک • نەیەکن • نێیا پێشـی
هاتە زانین ، لێ یا پاشی دخـن
دەڤێ زرنـــە وهـــن آلاڤێ
سازبەندي • ع ( الصفارة ) •

(ڤیکفیک) ـ ژ گەویتی چـێ‌دکن •
بدەڤە • ڤیکفیکا بارامە • یانی
دفیکێنی ژ گـەویتی • باڤو !
ڤیکفیک ژبارام تێ • چمـــا
وێ نەکی ڤیکفیك ؟ گەوی‌یە•

(ڤیل) ـ ناڤدارە بڤیل وپۆزێ خوەڤە
عەجیبە •

(ڤیغان)ـ ئەڤغان ـ ڤریادو هاواروڤیرین
وگازی‌یە • ع ( الاستغاثة ) •

## ( ڤێ • • • )

(ڤێ) ـ ناڤێ تیپەکە کـوردی یـە •
(ڤ) • ع ( اسم حرف ) •

(ڤێرس) ڤهرس • ژڤارس • گەرناس
ـ بطل • هاتیـە • نـەژڤارس
بداخوازا سـوار • هاتیـــە •
ع (البطل) •

(ڤێر) ـ ڤێـــربون ـ ڤێر کـــرن •
بشـــیوەیێ ســـۆرانی یە •
بداخوازا هین بون ـ هینکرن

هاتیه • بارام فێر بویه ـ هـین بویه •

(فێنك) بداخوازا (هێنك) ـ هۆنك هاتیه • نەگەلەك سـار ونەگەرمە • ( فێنك بون ) ژێدەرێ تێنەپەرە • فێنك کرن تێپەرە • سۆرانی یە •

## ( فۆ .. )

(فۆرت) ـ بکورمانجي بداخوازا پەسنێ دەرەو هاتیه :ـ بارام فۆرتا ددي خوە پەسنێ بدرەو ژخوەرە دکي ( زرت وفۆرت) لپەي هەڤ تێن • ع ( المدح الكاذب ) •

## ( ڤا ـ آ )

(ڤ) ـ نافەکي نیشاندانە • ژبۆ کۆمە• ڤا ـ ڤان ـ ڤانا ـ ڤانێ ها ـ ڤانێ هانا ••• (ڤا) کورتێ (ڤان) ە • ژبۆ سفکی هاتیه گۆتن :ـ ڤان مرۆڤان نان خوارن • دبێنن دڤا چەند وشا دە (٤)ن• هاتنە میدانێ :ـ (ن ـ ن ـ ن)• بێ کۆمنە هەبونا چار نونا دپەیڤەکێ دە گرانیەکە بێ کارە • لێ کۆ بێژن :ـ ڤا مرۆڤا نان خواریە نونەك یا دو نون دمێنن • کوردێ شامێ (ڤا) ژبۆ تەك ژي دبێژن :ـ ڤامێرکا ـ ڤاژنکا ڤاجەماعەتا ـ ڤاخەلکا • لێ ( نا ـ ها ـ هانا ) ژبۆ دور ودورتر هاتنە • ع ( اسم الاشارة للجمع ) •

(ڤالا) ـ چۆل ـ خالي :ـ ئەڤ خاني ڤالا بویە ـ چۆل بویە ـ خالي بویە • ڤێ بەرۆشێ ڤالا بکە • تشتکەکی تێدە مەهێلە ـ چۆل بکە ـ خالي بکە • دهەمبەر ڤالادە تژە ـ داگرتی هاتیه • تژەبکە ـ داگرە • ب سۆراني پربکە • ع (الخلاء ـ خالي ـ فارغ ) •

(ڤانا) ـ ژبۆ کۆما بەرچاڤ ـ نێزیك تەنێ ژ (ڤا) دورترە :ـ ڤا ـ ڤانا ـ ڤانێ ها ـ ڤانێ هانا • ع ( اسم الاشارة للجمع

البعيد ) •

(ڤانێه) ـ ژ (ڤانا) دورتره :ـ ڤا ـ ڤانا ـ ڤانێها • ع ( اسـم الاشارة للجمع لكنها أبعد من (ڤانا) •

(ڤانێهانا) ـ ژڤانێها دورتره :ـ ڤا ـ ڤانا ـ ڤانێها ـ ڤانێهـانا • ع ( اسم الاشارة للجمع أبعد من سابقتها :ـ ڤانێها ) •

## ( ڤا ـ ئۆ )

(ڤارتۆ) ـ ناڤێ باژارەکی کوردە • ل‌هێلا ( ئەرزەرۆم ) دکەڤي • ع ( مدينة كوردية ) •

## ( ڤا ـ ئي )

(ڤازي) ـ سەرگوهەري هـەڤە ـ مقلوبة :ـ تە كراسێ خـوە ڤازي وەرگرتيە • مقلـوب لخوە كريه • ع ( مقلوب ) •

(ڤار) ـ دبي مـەزنێ ڤارك بي • ڤاركـێ مريشـكن • لێ كورمانج (ڤار) نابێژن • تەنێ (ڤارك) هەيه • ع ( الدجاجة الصغيرة ) •

(ڤارك) ـ دمريشكادە كاڤەكـە : چيچك ـ ڤارك ـ زيغـان ـ مريشك • دشيوەيێ كوردێ بشێري‌يێ دە ( ڤارك ) شونا ـ فەروج ـ دگري • دبێژن :ـ ديكێ مـە هێ ڤاركـە • ع ( الفروج من الطيـور والدجاج ) •

(ڤان) ـ دەرباس بويه كۆ (ڤا ـ ڤان) ناڤێ نيشاندانە ژبۆ كۆم هاتيه • لێ (ن) ژێ‌تێ راكـرن ژبۆ سڤكي • وەكە (ڤا) تێ گۆتن :ـ ڤـان ـ ڤانا ـ ڤانێهـا ـ ڤانێهانا •

(ڤالابـون) ـ ژێدەرێ تێنەپەرە • چۆل‌بونە :ـ خـانى ڤالا بويه • من خاني ڤالاكريه • ع (مصدر لازمي من فرغ ) •

(ڤالاكرن) ـ ژێدەرێ تێپەرە • من چەوال ڤالاكر ـ من خـاني ڤالاكر ـ من تفنـگا خـوە ڤالاكر • ع ( مصدر متعدى من فرغ ـ أفرغ ) •

## ( ڤي ـ )

(ڤينا) ـ ناڤەکی نیشـــاندانه • ژبۆ نێزیک هاتیه : ـ ڤي ـ ڤينا ـ ڤينێ‌ها ـ ڤينێ‌هانا • چـــاوا هاتیه زانین :ـڤينێ‌هاـ ڤينێ‌هانا ژبۆ دور ودورتر هاتنه • هن لشونا ڤينا ـ ڤينێ‌هاـ ڤينێ‌هاناه ڤيا ـ ڤيێ‌ها ـ ڤيێ‌هانا ـ دبێژن• لێ ژبۆ کۆ دو ( يي ) کـــۆم نەبن یەک ب(ن) هاتيـــــه گوهەرتن • ع ( بمعنى هذا )•

(ڤيزا) ـ کاغەزەکە مرۆڤ ژبۆ چونا وەلاتەکی ژبـــەفیرێ وي وەلاتي دستێني • ڤيـــزا نادن من ـ ناهێلن دەرکەڤم دەرڤەـ ناهێلن هەرم ، وەلاتێ وا ••• ئەورویی‌يه •

(ڤي) ـ ژبۆ یەکي نێره • ڤي نـان خواریه ـ ڤي بارام ژ زندانێ دەرخستیه • (ئیی) نیشـــانا نێرایه • (ئێ) نیشانا (مێ)یه• ڤي ـ ڤينـــا ـ ڤينێ هـــا ـ ڤينێ‌هانا • ع ( هذا ) •

(ڤيز) ـ ڤيزڤيـــز • دەنگێ بايه :ـ ڤيزڤيـــزا بێ‌یه • بێ دکـــي ڤيزڤيز • دەنگێ وی خـورت وبقـــوته • ڤزـڤز ڤز وەکه ڤيـــــز ـ ڤيـــزڤيـــزه • دەنگێ بايه • لێ ڤرەهتـــره • (ڤزين) ژێدەره • ع ( صـوت العاصفة ) •

(ڤيلک) ـ دەک ودۆلاب وگـــەڕ سياسي يه • يان بداخـــواز تەڤگـــەرێ بدزيیه • بارام گەلەک ڤيلکا دبن‌خـــــوەدە دگەڕێني • مەزنێ وێ (ڤيل) هاتيه • (التآمر ) •

(ڤين) ـ خوەستن ـ ويستن : ـ دڤێم هەرم زۆر ـ دڤێم سەربەستي• دڤێم هـــەرم ـ دخـــوازم ـ ئەیەوێم • ع ( الارادة ) •

## ( ڤێ ـ آ )

(ڤێجا) ـ ڤێ‌جار ـ نها ـ نۆکا ـ ناکا ـ نهۆ ـنێزیکی هەڤن • لـــێ ڤێجا • ژبۆ ( تردد ـ تحير ) هاتيه • ڤێجـــار ـ ايجـــا • بداخوازا : ـ ایستا ايمه چي ئەتوانن بکن ـ چي‌بکن ؟ چه

کارن بکن ـ چـــەبکن ؟.
ع ( هذه المرة ـ والآن ) .
للتحير والتردد والارتباك ) .

(ڤێگا) ـ نها ـ نۆکا ـ ناکا ـ نهۆ ـ ایستا . بداخـــوازا ( الآن ) هاتیه . ئەزێ ڤێگا بێم ـ مـن ایستا دێم . ع ( الآن ) .

(ڤێنا) ـ نێزیکه ژبۆ ژنا یـه :ـ ڤێ ـ ڤێنا ـ ڤێناهـــا ـ ڤێناهانا . وەکەڤي ـ ڤینا . ڤێنێهـا ـ ڤێنێهانا هاتیــه . ع ( هذه للتأنيث ) .

(ڤێ) ـ وەکە (ڤێنا) ژبــۆ (مێـیـــا) هاتیـــه . دبـــەرناڤ وناڤێ نیشـاندان ده (ئێ) نیشانا (مێ) و(ئي) نیشانا نێـــره :ـ ڤێ ـ ڤي . وێ ـ وي . ژبۆ تەکێ بۆري دکـــرناتێپەرا رابۆري ده . تشتەکی غەریبـه کــۆ دکـــورمانجی ده بـــەرناڤ وناڤێنیشــــاندان ژبۆ کــرنا تێپەرا بۆری جیاواز هاتنـه . ع ( هذه ) .

(ڤێره) ـ دگەل ـ لەگەل ـبهەڤرەـ تەڤده ـ ڤێگـــــره . نێزیکی هەڤێ :ـ بارام هات وفەرهـاد ژی ڤێـره هـــات . هـــن دبێژن :ـ پێره . فەرهاد هات. وبارامژي پێره هات . دگەل هات ـ لەگەل هات . ع(مع).

(ڤێکره) ـ پێکڤه ـ پێکوه : ـ بارام وفەرهاد ڤێکره هاتن ـ پێڤکه هاتن ـ پێکوه هاتن ـ بهەڤره هـــاتن ـ تەڤده هــــاتن . ( مجتمعاً ) .

(ڤێک) ـ بتەنا خوە جارنا تێ گۆتن: بارام وفەرهاد ڤێک کـەتن ـ لهەڤ هاتن . صلحي کردن. ع ( التقارب والتصالح ) .

(ڤێل) ـ بچوکێ وێ ڤێلکه . ئـەڤ دەشت ڤێله ـ نەگەلەك کوره. ئەڤ سێني ڤێله ـ نەکـوره . ع ( غير عميق ) .

(ڤێکەتن) ـ آگر ڤێکەت ـ ڤێکـەتن ژێــــــدەرێ تێنەپەره . ( الاشتعال ) .

(ڤێخستن) ـ من آگر ڤێخســـت . ڤێخســتن ژێدەرێ تێپەره . ع ( الاشعال ) .

## ( ڤ ـ آ )

(ڤرا) ـ ڤر ـ ڤركا • بداخوازەکێ نە • ئەونەک ددن نیشانکرن:ـ لڤر رونە ـ لڤرا ـ لڤرکا رونە ـ لهرە رونە ـ لئێرە دانشنە • ڤر ـ ڤرا • بداخوازا هرە ـ ایرە هاتنە • ع ( هنا )•

(ڤرکا) ـ ئەڤ ( کا ) زبۆ بچوکی یە• کوردێ شـامێ ولۆ دبێژن • کیکا زي ولۆ دبێژن • ع (هنا) وفیها تصغیر وتحبب •

(ڤرێ) ـ ڤرەکـه ـ دەرەوین • وگەرۆکـه • زبۆ نێر ومـێ هاتیە • جارنا ڤرێ بداخـوازا (ڤر) دەرەو هاتیـه • ڤرەك ئێ کۆ گەلەك ڤرا دکـي • ڤرێ زبۆ مێ وڤرۆ زبۆ نێـر هاتنە • دبێژن :ـ وەکە ڤرێ لچە دگـەرێ ؟ دبي زدەنگێ (ڤرین) هاتبي • یان ڤـرێ ناڤێ کوچـکا مـێ بي • ع ( الخفيفة ـ الکاذبة ) •

(ڤرتێ) ـ زبۆ (مـێ) • ڤرتۆ زبۆ نێرە • ڤرت•دەنگێ بایێ زکە•

زبۆ دژون ئـەڤ گـۆتن تێ گۆتن •

(ڤلێ) ـ زبـۆ ژنا ـ زبۆ مـێ • و (ڤلۆ) زبۆ نێـرە ـ مێرە • زبۆ دژون تێ گۆتن • (ڤل)ـ ـ قونا فرە ـ قولا فرەهـه • (ڤلڤل) دەنگێ کۆ زڤـولێ هاسن • یان چە قولێ فرەه تێ •

## ( ڤ ـ ئي )

(ڤرني) ـ ذەما کورمانج دەخـل وزادێ خوە ـ تۆڤێ خـوە دچێنن حلي هەیە • وڤـرني هەیە • ونیرێ زێرین هەیە • ئێ کۆ دکەڤي زڤستانێ ڤرني یە• ئێ بەري بارانێ تێچـاندن ( حلي ) یــه • ئێ پشـتي بارانێ ـ پایـز خێـرێ تێ چ ندنی نـیرێ زێرینی یـه • ع ( البذار المتأخر عن الوقت )•

(ڤکي) ـ یان (ڤنگي) بـجارەك • ڤکي ڤالایـه ـ بـجـارەك ڤالایە • کوزێ رەوشـێ ـ

كـــــوپێ زینێ ڤكيڤالایه ـ ب‌جۆره‌ك ڤـــالایه • هيـــچ تشـــــته‌ك تێده نـــه‌مایه • ع ( بالمرة ) تقريبا •

(ڤري) ـ دبێژن :ـ بارام خوه ڤرى كرىيه ورازایه ـ كه‌تيه خه‌وه• یاني خـــوه شـــمرانديیه • تشته‌ك ب‌سه‌ر خوه‌دانه‌كریه‌ـ خوه نه‌نخوماندية • ع ( بدون محافظة أو بدون اعتناء ) •

## ( ڤ ـ ئه )

(ڤرده) ـ دبێژن : ـ ڤرده وه‌ره • ب‌هرده‌ده وه‌ره ـ بۆ ایره‌وه‌ره• ڤرده ـ وێده نزانم ، ئه‌زحه‌ڤێ خـــوه دخـــوازم • نه‌ڤرده ، نـــه‌وێده ، گۆ ره‌پ وداری خوه لسه‌رێ بارام خســـت • دبي (ده) نه‌ژكۆكا گـــۆتنێ بي وێ چاخێ نابي گۆتنه‌ك جياواز بي • ( ڤر ـ هنـــا ) ده رباس بويه • (ڤرده‌وێده)• ع ( ســـؤال وجـــواب ) • بێ‌ڤرده‌وێده • ( بدون ســـؤال وجواب ) • أو بمعنى الأخـذ والرد •

(ڤرڤره) ـ ئێ‌كۆ گه‌له‌ك ڤـــر ده‌ره‌وا دكى • دبێژن :ـ‌گوه مـــه‌ده بارام ڤرڤـــره يه ـ گه‌له‌ك ڤرا دكي • گه‌له‌ك ده‌ره‌وا دكـــي • وكـــه : گورگوره ـ چرچره ـ ترتره• ع ( المبالغ في الكذب ) •

(ڤلڤله) ـ ئێ‌كۆ (ڤلڤـــل) ژده‌ڤێ وي تێ ـ ده‌ڤێ وي ڤره وگۆتنێ قه‌له‌و ژێ تێنـــــه‌ده‌ر • بارام ڤلڤله يه ـ يانى گه‌له‌كي دكي ڤلڤل ـ ڤلڤل ژده‌ڤێ وي تێ •

(ڤل) ده‌رباس بويه كۆ ڤـــولا مه‌زن وفره‌ه كۆ ده‌نگه‌كـــي نه‌ســـاز ژێ تێ ده‌ر • ڤل ـ ڤلك ڤون وڤوله • ع ( كثـير الكلام وبدون معنى ) •

(ڤرتۆ) ـ چـــــرتۆ وڤرتۆ ناڤێ دو گه‌رناسێ چيرۆكا شـــــێرێ چيانه :ـ چرتۆ ئه‌و گرێدايـــه وڤرتۆ ئه‌و به‌ردا يه • ژله‌ورا شێر آخ وآڤا ڤى وه‌لاتى لخوه

حەرام کریە • (ڤرت) دەنگێ
ترێیە • فـرتێ ـ ڤرتۆ ژبۆ
ژن ومێرا تێ گۆتن • جـارنا
بداخوازا دەروین تێ گۆتن •
ع (تاتي أحياناً بمعنى الكذاب)•
(فــرت) ـ دەنگێ ترێیە • بویـە
پەسنەک ژبۆ مروڤێدەرەوین•
زرتوفرت جارنا لپەیێ هەف
تێن • (فـرتین) ژێــدەرە •
بارامچرتۆڤرتۆیە • یانێ وەکە
کنجکێ رزي ـ کەڤارەیە زو
دچري • لسەر سۆزەکە خوە
راناوەستي • ع ( الرجل الذي
لاقرار له ـ کالخرق البالية ) •
(ڤچ) ـ دەنگێ ڤەبونا برین ویزک
وچراڤێ یە • ڤچین • ژێدەرە•
(ڤرچ) دەنگێ کۆ ژچـراڤێ تێدەر
ـ ژبرینا ـ ژیزکا دەردکەڤي•
ڤرچین • ژێدەرە • ع (کلاهما
بمعنى صوت انفجار الجـروح
وغیره ) •
(ڤز) ـ دەنگێ گـــولەیە • ڤزین
ژێدەرە • بوڤزینا گولا دسەر
مەرە • گولە گۆ ڤز ودبـەر



گوهێ مرە چو • (فــــزت)
ژێ هاتیە • ڤزتین • ژێدەرێ
وێیە • ع ( أزيز الرصاص )•
(ڤزڤز) ـ وەکە ڤز هاتیــــە • تەنێ
تێدە ژێدەبون هـەیە • ژبۆ
کۆما ڤزرە تێ گـــۆتن :ـ بو
ڤزڤزا گولا • گولە گۆ ڤز •
(ڤز) ژبۆ تـــەک وڤزڤز ژبۆ
کۆمـــــە ـ ژێدەرێ وایە •
ع ( صوت أزيز الرصـــاص
للجمع ) •
(ڤژ) ـ دەنگێ آڤێتنا تشـــتەکيیە •
بارام گـــۆ ڤژ وکـــەڤرەک
دفەرهاد وەرکـــر • (ڤژین)
ژێدەرە • دبێ ژڤژ دەرکەتبێ•
ع ( صوت الرمي ) •
(ڤژژ) ـ ڤالن • دەنگێ ریتنێ یە •
گۆ ڤژژ وبخـــــوەدە ري •
ڤژک بچـــوکێ ڤژە • ڤژین
ژێـــدەرە • فـژفـژ ژبـــۆ
ژێدەبونە •
(ڤرر) دەنگێ آڤێتنـــا کەڤرەکـــــي
ـ تشتەکی یە :ـ بارام گۆ ڤرر
وکەڤرەک دفەرهاد وەرکر •

بو فـرفرا كـــەڤرێ بارام • م دڤرينا ڤي قەولي ڤە •

(ڤرر) ـ ڨالن • ناڤێ دەردوێ يـە • بارام • ڤررا دكي ـ دەرەوا دكـــــى • بارام ڤرەكـــە ـ دەرەوينە ـ درەوچينـــە • ع ( كنية الكذب ) •

(ڤر) ـ هر ـ ائره :ـ بارام لڤرە ـ فەرهاد نەلڤرە ـ نەلهرە يە ـ نە لائرەيە • لڤر رونشـــتيە ـ لهرە رونشتيە ـ لائيـــرە دانشتي يە • ع (هنا) •

(ڤڤ) ـ گەرم ـ توژە • ژن دەمـا زارۆكێ خـــوە ژشـــير ڤەدكن دەرمانێ گەرم دمەمكێ ـ خوە ـ دچچكێ خوە ددن وژزارۆكا خـــــوەرە دبێژن ـ ڤڤێ يە ـ ڤڤ ـ ڤڤكێ يە • يانى بڤێ يە ـ گەرمە ـ توژە نكاري بخـــوى ـ دورى هەرە • ع (عملية في منع الطفل عن حليب الام وتخويفه ) •

(ڤرق) ـ كەتنا تشـــتەكى دتشتەكي شل وڤرەدە • لنگێ بارام گۆ ڤرق وكەتە ڨولێ ـ كـــەتە ناڤ آڤێ ـ كەتە ناڤ چراڤێ• ڤرقين • ژێدەرە •

(ڤلق) ـ وەكە ڤــرقە • تەنێ نەڤ دەنگێ خستنا تشتەكىدتشتەكى بقول وشــل دە وتێدە لێدان ولێخستن هەيە • ع (كلاهما صوتية •

(ڤك) ـ ڤنـــگ • دەرباس بويە • ڤكىڤالا ـ ڤنگىڤالاـبجارەك ڤالايە ـ هيچ تشـــتەك تـێ نەمايە • ع (فارغ بالمرة) •

(ڤرك) ـ بچوكێ ڤرە • ريتنـــــا رۆهنە •

(ڤـــرەك) ـ زێـــدە دەرەوين ـ ڤرۆكە • ئێكۆ گـــەلەك ڤرا دكى ـ ئێكۆ گەلـــەك دەرەوا دكى • ڤرر كۆكا وێ يە • ع (الكذاب) •

(ڤرۆنەك) ـ وكە ڤرەك • هاتيە• ئێكۆ گـــەلەك ڤرا دكي ـ گەلەك دەرەوا دكى •

(ڤزك) ـ ريتنا گـــەلەك رۆنە • زڤركێ رۆنترە•ع(الاسهال)•

(ڤنگ)ـ دەنگێ مێشا هنگوڤە ـ دەنگێ مێشێ یە • جارنا دەنگێ پۆزێ مرۆڤە • ڤنگ ڤنگ • ڤنگ‌ڤنگ ژپۆزێ بارام تێ • آرسمي بویە ـ ـ باهۆري بویە • زەکەمي بویە • ( صوت الذباب وصوت الأنف المذکوم ) •

(ڤل) ـ قولە • ژبۆ دژون وغەید دبێژن :ـ ڤلۆ ـ قلۆ ! یاني هنگي تە خوە دایە بەر هەرکەسي ، فرەبویە ـ بویە ڤل ـ بویە وەک قولا ڤرە • ڤلێ ، ژبۆ ژنارە تێگۆتن • ڤلک قونە • ع (جحر) •

(ڤزین) ـ ژێدەرێ ڤزە دەرباس بویە • ڤزینا گولە ـ دەنگێ وي یە •

(ڤن) ـ دەنگێ بدزی وبێ داخوازە دبێژن :ـ چە ڤن‌ڤنا بارامە ؟ وەکە چن‌چن ـ پست‌پست • خویایە دکۆکا خوەدە دەنگێ مێشێ یە • مێشەکێ گۆ ڤن وهاتە سەرێ دارێ وەختە بمن ڤەدا • ع ( صوت غیر مفهوم ) •

(ڤرین) ـ ژێدەرێ ڤرە • گۆ ڤرر وکەڤرەک آڤێتە بارام • دەرباس بویە • رەنجبەر جارنا دبێژن :ـم دڤرڕینا في ڤەولي ڤە • یاني ئەزێ في ڤەولي بێ ڤرر وباڤێژم ـ بڤرڤرێنم • ع ( الرمي ـ صوت الرمي ) •

(ڤزین) ـ وەکە ڤرین • هاتیە آڤێتنە • دەرباس بویە •

## ( ڤە ـ ن )

(ڤەدان) ـ کۆلان وڤەدان :ـ بارام چال دکۆلا وفەرهاد ڤەددا • م دافک لبەر کەو ڤەدان • شێرۆ کۆرتکێ رەزێ خوە ڤەدانە ـ کۆلانە • ع ( الحفر ) •

(ڤەبون) ـ ژێدەرێ تێنەپەرە • ڤەکرن • تێپەرە • دەري ڤەبو ـ من دەري ڤەکر • دەرێ ڤەبو • بخوە ڤەبو • دەرێ ڤەکر ـ یەکي دي ئەو

ڤه‌کر • هاته ڤه‌کرن• کرۆک
نه‌ناسه ـ نه‌پەنـدي يه •
ع ( الفتح ) •
(ڤه‌پەخـراندن) ـ في آكـري
ڤه‌پەخرێنه ـ لهەڤخه •
(ڤه‌تراندن) ـ پالدانا سەر قادێ‌یه •
ژکەوي‌تي يه :ـ بارام تـۆر
خوه ڤـەتراندیه سەر قادێ
ـ سەر ئەردێ ، نه‌غـەما وی
يه • ع ( المد والتمـديد على
على الارض ) •
(ڤه‌سهاندن) ـ پالدانا بەر سهێ يـه
ـ بەر سيبەرێ يـه :ـ بارام
خوه ڤه‌سهاندیه • لبەر سهێ
ـ سيێ ـ سي‌بەرێ پالدایه •
ع ( التفيء ) والاستظلال •
(ڤه‌چراندن) ـ ژهەڤ خستنا هـری
ومو • ڤێ هری‌یێ ڤه‌چـره •
ژهـەڤ بکه ـ ژهـەڤ
بچرێنه • ع ( الندف ) •
(ڤه‌خوارن) ـ ژبۆ تشـتێ رۆنـه
ـ رۆهنه ـ رۆحنه • وکه :
شەراب ـ شەربەت ـ آڤ‌شیر
ئەڤ (ڤه) ـ (وه) دسـۆراني

ده هاتيه :ـ خـواردنەوه ـ
ڤه‌خوارن • جارنا ئەڤ (ڤه‌ـ
وه) ژ بۆ جارەکه دي تێ‌کۆتن
هاتەڤه ـ گەراڤه ـ هـاتەوه
گەراوه • ڤه‌گره ـ ڤه‌گەريا ـ
ڤه‌ناگـەري •• ئەم دبێژن :ـ
هات ، لێ‌هاته ڤه نابێژن •بەلام
بەهدينا وبـۆتا دبـێژن:
هاتەڤه • ع ( الشرب ) •
(ڤه‌دراندن) ـ ڤه‌چراندن • کوچکێ
کراسێ بارام ڤه‌دري ـ دراند
چراند •• ئەزێ گۆشـتێ
لاشێ دژمن بدرانێ خـوه
ڤه‌درم • ع (التمزيق) •
(ڤه‌رەشاندن) ـ دخـوارنا زکـێ
مرۆڤ ده (ڤه‌رەشاندن) ئەوەکۆ
باڤێژي دەرڤـه • دوەريس
وبەن وتەژ ده ، ڤه‌رەشاندن •
ڤه‌کرنه • ع ( الاستفراغ ) •
(ڤه‌زلاندن) ـ پالدانه ـ خوەدرێژکرنا
لسـەر تشـتەکي يه •
خوەڤه‌زلێنه ـ خـوه درێـژ
بکه • وي چەرمي ڤه‌زلێنه ـ
درێژ بکه • ع ( الشـطح

والتشطح ) •

(ڤەژەندن) ـ ژەندنا پەمبو بدەستایه• وەکه ڤەچراندنا هري ومویه• ع ( ندف القطن ) والتمزیق في الأحجار وغیره •

(ڤەژاندن) ـ راکرنا مریایه • ساغ کرنا مریایه :ـ ڤەژین• ژیدەرێ تێ نەبەره • ڤەژاندن تێبەره • ع ( البعث أو أحیاء الاموات ) •

(ڤەژین) ـ تێنەبەره • بارام مربو لێ ڤەژی ـ ساغ بو •

(ڤەشوشتن) ـ دبێژن ـ خوه بشو وڤەشۆ • ڤەشوشتن ـ دوجار بونه • جارەکه دي خوه بشۆ • ع (الغسل مرةأخری)•

(ڤەشاندن) ـ شاندنا هنا ژبۆ جهکی یه • ڤەشاندي ـ ڤەنارتي • ع ( المبعوث ) •

(ڤەشارتن) ـ هلانینا تشتەکی بدزی یه • ڤێ کاغەزێ ڤەشێره ـ بەره کەس نەبێني ـ بدزی هلێنه • ع ( اخفاء ـ الاختفاء ) •



(ڤەڤەتاندن) ـ پەزێ خوه ژناڤ پەزێ بارام ڤەڤەتێ نه • جدا ـ جدوا ـ جیا ـ جیاواز بکه • ژهەڤ بده الي • ع ( عزل الشيء عن غیره ) •

(ڤەڤەلاشتن) ـ چراندنا لاشەکی ـ دارەکێ ـ تشتەکي یه • ڤێ دارێ ژمەره ڤەڤەلێشه • ژهەڤ بچرێنه ـ پەرچه بکه • ع (شق الشيء وتمزیقه)

(ڤەکوشتن) ـ ژبۆ آگره ـ ژبۆ تشتێ وەکه آگره•ع(الاطفاء)•

(ڤەکرن) ـ دەر ـ دەري ـ دەرگه • ڤەکه ـ ڤەکریه :

دەرگهێ لطفا ته خانم !
گەر لمحرومان ڤەبي ؟
أحمد عبد ضعیف
واقف بین العبید ••

ڤەبون • ژێدەرێ تێنەبەره • ڤەکرن تێبەره • ع ( مصدر متعدی من فتح الباب ) •

(ڤەگەراندن) ـ گەرانەڤه گەرانەوەیه بەلام بسۆراني ژێدەر وکۆم وکه هەڤ تین • گەرانەوه

ـ كۆم ـ كەرانەوە ـ ژێدەر، بەهـــديني زي ولـــۆيە . گەرانەڤە ـ كۆم . گەرانەڤەـ ژێدەر لێ لجەم كـورمانجێ ،ایێ :ـ ڤەگەراندنـ ژێدەرە، ڤەكەران ـ ڤەگەريانـكۆمە، (ڤەگەر) ژێدەرێ تێنەپەرە ـ ڤەگەراندن . ژێدەرێ تێپەرە: بارام ڤەگەريا ـ ڤەگەرا . من بارام ڤەگەراند . ع ( مصدر من أرجعه ) .

(ڤەمراندن) ـ ڤەكوشـــتنا آگرە :ـ آگـــــــر فـــەمرێنـــە ـ آگر ڤەكوژە . ع (الاطفاء) .

(ڤەهەراندن) ـ بەردانا پەز لـســەر آڤێ ـ لـسەر خوێ يە . پەزێ خوە ڤەهــــەرێنە ـ بەردە ـ بشێنە . لێ نەبهەڤرە ـ بۆل بۆل بەردە ســـــەر آڤێ . ع ( ارسال القطيع من الاغنـام الى الماء أو الملح ) .

## ( قا ـ آ )

(قاقم) ـ ناڤێ هێـكێ يە . زارۆك بچوكاي ژهێكێ رە دبێژن:ـ قاقا . ع ( اسم للبيض بالنسبة للاطفال ) .

## ( قا ـ ئه )

(قاســـە) ـ صـــــندۆقەكە . ژهاسن وپۆلا چێدكن ، دەولەمــەند پەرێ خوە تێدە هلتينن . لێ نەكـوردي‌يە ، هاتيە ناڤ زمانێ مە .

(قاله) ـ لدەهما سليماني‌يێ ژ(قادر) رە تێگـــــۆتن :ـ قاله . وژ(مەحمــــود) رە دبێژن :ـ خولله .

(قامه)ـ ژخەنجەر درێژتر وفرەهترە، كوردێ سەرحەدا دخن بــەر خوە . ع ( الغدارة ) .

(قاوه) ـ ياقەهوە . ناڤـــــــدارە ، بازرگاني پێدكن . قاوەچي ، ئي‌كۆ قاوێ دگەرێني ـ ددێ خەلكێ . چە بفرۆتن بي وچە بەلاش‌بي . ع ( القهوة ) .

## ( قا ـ ئۆ )

(قادۆ) ـ ژقادر سڤك بويە . قادێـ

قادۆ بونه ناڤێ مرۆڤا • قادێ سعدون • سترانه‌ك لسه‌ر هاتیه چێكرن • گه‌رناسێ سه‌رپێهاتیه كه خوینداره • لچیایێ مازی چێبویه •

(قاسۆ) ـ دبي ژقاسم ـ گاسم • هاتبي • ژبه‌ركۆ گاسۆ ژی تێ گۆتن • مالا قاسۆ ، لناف بوبلانا ومالا گاسۆ ، لهێلا شێب وعه‌ره‌بان ناڤدارن •

(قاشۆ) ـ دروسته ژكه‌شه ـقه‌شه‌ـ قس • هاتبي •

(قاڤۆ) ـ دبي ژقاق ـ قاقا ـ هێك هاتبي • ناڤێ مرۆڤایه •

## ( قا ـ ئي )

(قازي) ـ ژ (قاضي) هاتیه•عربي‌یه• لێ كورد وعرب وترك ••• هه‌مي دبێژن :ـ قازي • ع ( معروف ) •

(قامچي) ـ ژچه‌رم وهاسن چێدكن• پێ لسه‌وال ول دژمنێ خوه ددن • دزنزانێ دژمن ده قامچي آلافه‌كي ناڤداره •

وه‌لاتپارێزا پێ دهنگێڤن • ع ( السوط ) •

(قامشلي) ـ قامشلۆكێ • بازاره‌كي كوردستانا بن‌ده‌ستێ سوریه • بیاژارێ (نصێبین) ڤه هاتیه گرێدان • ته‌نێ ( نصێبین ) دبن ده‌ستێ ترك و (قامشلي) دبن‌ده‌ستێ عرب ده‌یه • دقامشلي ده هنك سوریان وآشور وأرمن وعرب ژي هه‌نه • لێ پرێ وان كوردن وهاویرێ بازێر ژ سه‌دي حه‌شتێ كوردن • ع ( مدینة جمیلة في شمال الجزیرة ) •

## ( قا ـ ئێ )

(قادێ) ـ ناڤێ مێرایه • ژقادر ، هاتیه •

(قارێ) ـ ( وه‌ندێ‌قارێ وزه‌رمحه‌ما) ناڤێ سه‌رپێهاتیه‌كه كورمانجي‌یه بشه‌ر وستران تێ‌گۆتن •

(قارێ) ناڤه ژبۆ مرۆڤا ـ مرۆڤه‌كي •

(قاب) ـ هه‌ردو روێ نقشت وكتێبانه•

قابا كتيبا بارام رەشە • جـارنا
بداخوازا كەڤانێ پاچێ هاتيە•
ع ( جلد الكتاب ) •
(قالب) ـ قالبێ بسكا ـ قالبێ غارا ـ
قالبێ گولا ••• عـــرب ژي
دبێژن•لێ اشتقاق ژێ فەماكەڤي•
ژلەورا نكارم بێژم ژعـــربي
هاتيە •
(قات) ـ پەرچەيە • دەهقات ل حەقێ
خوە ستاند ـ دەه جارا وەكە
حەقێ خوە ستاند :ـ
من گۆ بەلێ ئەڤـــەندم
قاتەك بسەد قاتي يە •
ترك ژي ولۆ دبێژن • پــر
نێزيكە كۆ تركي بي•ع(المثل)•
(قاريت) ـ مرۆڤێ وەزا وبێ گۆشت
وبێ هێـــــزە • قاريتـــك
بچـــوكێ وي يە • بـــارام
بويە قاريت ـ قاريتكي يـــە •
ع ( الضعيف ـ النحيف ) •
(قاويت) ـ ژآردێ قەلاندي ودۆشاف
وشەكر چێدكن • هن رون
دخن ناف وهن بێ رون دخون•
ع ( نوع من الحلويات ) •

(قاس) ـ دەمە :ـ قاسەك وەرە مالا
مە • دەمناڤە :ـ
قاســكێ وەدر مالا مەيە •
تشتكي بكە مەهنەيە ••
ـقاس ـ قاسە • دەرباس بويە•
تێدە دەولەمەند پەراڤەدشێرن•
ع ( الوقت ـ المدة ـ اللحظة )•
(قاجوج) ـ بچوكێ ژێ قاجوجكە •
ژآخێ چــــێدكن وپێ آف
ڤەدخون • كاس ـ پيــــالە ـ
كاخك ـ قاجوج ، نێزيكـــى
هەڤن • ع ( كأس من الفخار)
(قاچ) ـ قاچك ـ قارچك • دوڤكێ
جـــانداره • وهـــارەنگە ناڤێ
نەخوەشي يە كـــێيە • بارام
قارچكي ـ قاچكــــــي بويە ـ
قاچكا وي كەتيە • ژبـــــەر
دوڤكێ خـــوە گازنا دكـــي •
ع ( الذنب ) •
(قاچ) ـ بسۆراني ، چەنگ ـ ملە•
كورمانج دبێژن :ـ قـــەلاچ •
لێ قەلاچ بفرەهيا هەردو ملايە
لجــــەم كورمانجا • دبيڤانێ
دە خويا دبي • دبێژن :ـ چالا

وه چه‌ند قــه‌لاچا كــوره ؟ شه‌ريتا مه چل قه‌لاچ هه‌يه • لێ قاچ ـ قاچــك ، دوف ـ دوفكه •

(قاروچ) ـ وه‌كه قاريت ـ قاريتك• ئێ گــــه‌له‌ك زراف ووه‌زا وبێ گۆشته • بارام قاروچكي‌يه ـ قارچي يه ـ بێ گۆشــته ـ وه‌زايه • ع ( الهزيل ) •

(قالوچ) ـ قالوچك • داســــه‌كه بچوكه پێ گه‌يا دچنن • جارنا ژ نبێ پالــه‌يێ دكـــــن • ژ داسێ بچوكتره • دۆخا وێ بداره • ع ( منجل صغير ) •

(قاد) ـ دشيوه‌كي كــورمانجي ده ـ دشــــيوه‌يێ شــنگالێ ده بداخوازا ئــــه‌رد ـ (أرض) هاتيه • ژله‌ورا گه‌له‌ك جـارا ئه‌ز (قاد) لشونا ئه‌رد ـ أرض• دنفيسم • دبێژن :ـ قاد قــادا خوه‌دێ يه ـ أرض ـ ئه‌رد ـ ئه‌ردا خوه‌دێ‌يه •

(قار) ـ بارام هنك قار بويه • يانى هه‌و زاري وهاوار وقيــرين دكي • قاربويه ـ هاشت‌بويه• ع ( السكوت والهدوء ) •

(قارقار) ـ زارزار ـ هاوار وقيرينه• قارقارا بارامه ، بارام دكـــي قارقار • آزارى وهــاواره ، فرياد وفيغانه • ( الصـــياح ـ التأوه ـ الصراخ ) •

(قافور) ـ ژگويرز ـ گورز •چێ دكن پێ كارێ خوه دكن :ـ گورز ، گه‌ياكه بستري‌يه ، په‌لێ وێ پان ودريــژن • دكـــــوتن ودخن سه‌ر لودكێ حه‌ري‌يێ، تاكۆ لبه‌ررۆژێ زوا دبي‌رادكن وبكلسێ پتپت ونه‌خشـــا لێ دكن • وكارێ خوه پێ دكن• دبێــــــده‌رێ ده گـــه‌له‌ك خويادكي •

(قافورۆ) ناڤێ مرۆفه‌كي يه له‌ێــلا ( آموده ـ عامودێ ) هاتيــه كوشتن به‌لام لسه‌ر كوشـتنا (قافورۆ) گه‌له‌ك سه‌رگێژي جێ‌بويه • ژله‌ورا گۆتــــه :ـ ( هه‌چي هات وگۆ قافـــورۆ ! براوۆ ! ) ـ ع ( ماعون مصنوع

من النبات ) •
(قامر) ـ گەیاکە لبەر آفێ شیندبي•
شەریتێ قامر کورد چێدکن •
وەکە کندوە لێ هنک زەرە •
ع ( نوع من النبات ) •
(قانتر) هێسترە • دیا وي مەهینە
وبافێ وي کەرە ، دورەهي‌یە•
دبێژن :ـ ژقانترێ رە گۆتن
بافێ تە کیە ؟ گۆ خالێ م
هەسپە • ع ( البغل ) •
(قاوێر) ـ دۆرا هەرتشتي‌یە •
قاوێراکوم ـ دۆرا وي‌یە ،
قاوێرا نان ـ دۆرا وي‌یە •
هاوێرە ـهاویرە ـ دار مادۆرە•
ع • ( الأطراف ) •
(قاز) نفشەک ژتلور وچقیکێ
کەدي‌یە • قاز وئۆردەک
وەکە هەڤن قرکا قازێ جوان
وخوەشک وناڤدارە :ـ
قرکا تە زراڤە قرکا قازێ
سینگ وبەرێ خەلکا تێلي
مینا بەرفا ل بۆغازێ ••
قاز وقولنگ جارنا لبەي هەڤ
تێن • ع ( الوزة ) •

(قاژ) ـ ( قاژقاژ ) ـ دەنگێ مریشکایە
ژقیژ ـ قیژاندن ، هاتیە •
قاژقاژا مریشکایە ، مریشک
دکن قاژقاژ دقیژن ، لێ ژ
مرۆڤارە ژی تێ گۆتن •
چەقیژقیژا تەیە ؟
چەقاژ قاژاتەیە ؟ قیژ
ـ قیژین ـ قاژین ـ قاژ ـ
قاژقاژ ـ قژ ـ قشت ـ
بداخوازەکێ نە • ع ( صوت
الطيور وبصورة خاصة صوت
الدجاج ) •
(قاش) ـ نافێ وی گەوهەرێ ـ وێ
مۆرکا کۆ دخن ناف ژۆرێ
گوستیلێ :ـ
گوستیل زێرێ ! گوستیل زێر
گوستیل زێرێ!قاش مەرمەرە •
ع (فص الخاتم) •
(قامیش) ـ گەیاکە • دناف آفێ دە
شین دبي بنێ وي شێرینە •
زارۆک دچنن ودخون •وەکە
ترکي خویادکي ، بەلام
دکورمانجي دە گەلەک هاتیە:
گۆلا بقامیشە

مـــارا فيشـــــەفيشه كەكێ م چاويشـــە ••• زارۆك ولۆ دبێژن • لێ چاوا گهايه دەڤێ زارۆكـا نزانم • ع ( نوع من النباتات المـائية سكري الطعم ) •

(قايش) ـ يان قاريش • ژچـــــەرم چێدكن ولپشتا خوه دكن • گەلەك خــورت وبتينـــــه • ع ( المحزم ـ الزنارة ) •

(قيش) ـ جرر وبەربەري وركيتي يه • بارام وفەرهاد • ژقايشا هەڤره ولۆ دكن • ئەز بتــەره قايشێ ناكشينم • خويايه كــۆ ددەمێ كـــــەڤاره دە قايش ژدەستێ هەڤ دكشاندن ، كێ زۆرا كێ ببرا ئەو خورتبــو • ژلەورا قايش كشاندن بويـــە ناڤێ بەربەري ودژمناهي • بارام گەلەك بقايشه ـ گـــەلەك بجره • وەكــــە قايشـــــە • ع ( التخاصم ـ المعاكسة ـ المجادلة ـ العراك ـ ) •

(قاتغ) ـ قاتخ • ناڤه ژبۆ هـــــەمو تشتێ كۆ ژشيرێ دەردكەڤي • وەكه ـ شير ـ ماست ـ رون ـ نيڤشك ـ پەنير ـ قەيماغ ـ تو ••

(قارغ) ـ نەخوەشي يەكە دچـــاڤادە چێدبي • مرۆڤێ قارغي ـ ئێ كۆ باش نابێني چـــاڤێ وي ژ رۆژێ دشكێن • (شەفرەشكي) ئێ كـــۆ بشــــەڤ نابێني • ع ( مرض في العيون يأتي غالباً في الأشقر ) •

(قاف) ناڤێ تيـا (ق) ڤه • هن دبێژن: ئەڤ تيپ نەكوردي يە • لێ باوەرناكـــم كۆ ئـــەڤ آور درستبي • ژبەركۆ دڤەرهەنگا مەدە هاتە خوياكرن كۆ (ق) تيپكە تێر وەشەيە ، نەوەكـــە تيپا ( ح ـ غ ) يە • ع ( اسم احدى الحروف الابجدية ) •

(قاف) ـ گەلەك درسته كــــۆ ناڤێ قافقاس بي • چيـــايێ قاف ـ چيايێ قافقاسه • جـــــزيري دبێژي :ـ

دەريايێ (قاف) وقلزمي ـ

يان بەحرێ عەماني مەلا !
هن ژی دبێـــژن :ـ (قاف)
چیاکە کۆ لهاوير جهـــانێ
هاتیه پێچان لێ تا ایرۆ تشتکي
ولۆ خويا نەكـــريە • ناڤێ
(قاف) د (قرآنێ) دە ژي هاتيە•
ع (إسم جبل مجهول الهوية)•
(قاق) ـ قاقا ـ قاقێ ـ قاق • هێکە •
دەرباس بويە • زارۆك ولۆ
دبێژن • قاقۆ ناڤێ مرۆڤەكي‌يە•
قاقول ، ناڤێ گەياكي‌يە • قاقل
ـ قاشلە ـ هەستيێ سەري‌يە •
(قادولك) ناڤێ پەنەكێ يــە ، ژآخ
چێدكن ، بچەمبلە ، پەنەكي
تاڤێژن هەردو چــەمبلێ وێ
گەلەك جۆرا پارسەك تێدە
پارس دكـــن • گەرەكــە
(قادول) مــەزنێ وێ بي •
ع ( نوع من الأواني المصنوعة
من الفخار ) •
(قالك) ـ قاشلە • بەلام ژقاشـــل
فرەهترە • قالكێ سـەرێ وی
نەقاشلە • قالكێ كيسۆ ـ قالكێ
ژیژۆ • خوە كشاندە قالـك

ـ كەتە قێلك ـ قالكێ سەري
تەنێ مـــايە • ( جمجمة ) •
( ما يشبه الجمجمة او جلـــد
السلحفاة ) •
(قامك) ـ ژدار وحەرێبێ لســەر
خنێیا ژن چێدكن وايڤـــارا
خوارنا خوە بێتر مەهــــير
وشۆربە داتێنن سەر ، داكـــۆ
ساربي • جـارنا ژبەژنا مرۆڤا
رە تێ گۆتن :ـ لقامـكا وی ؟
وێ چاخێ ژقام ـ قامـــەت ،
هاتيە :ـ
مەلا ! مە ژقامەتا يەكێتا
ژنو سەد بۆسە ماين‌دەين •••
(قابيـــل) ـ ناڤـــێ گــەرناسێ
سەرپێهاتي‌يەكــە تاريخي‌يە •
ئێ کۆ ئــەڤ چـــيرۆك
نڤیساندي‌يە بمە دايە زانين كۆ
مرۆڤاني ژدەســـــتێكێ دە
ب جەنگ وشــەر وبێبەختي
وبێوژداني يە • چـــــەندا
چيرۆك ب خـــوە گۆمـــان
وساويرەكە جوان وهـــۆزاني
يە • (معروف) •

(قاشل) ـ قاشول • چەرمێ دار وبەرایە :ـ قاشلێ شەبەش ـقاشلێ ـ دارا ـ قاشلێ پەتیخ • هن دبێژن :ـقاشول• دبي ژ (قشر) هاتبي • بەلام قشر ، ژكو هاتیە نزانم • عرب گەلەك دبێژن ، لێ نەوەكە عربي‌یە • كورمانج ژي دبێژن ـ بقەشێرە ـ م قەشارت ناقەشێرم قەشارتن ژێدەرە•لێ عرب‌ژي ولۆ دبێژن•هەرچاوابي دكورمانجي دە جي‌گرتي یە • ع (القشر) •

(قاقل) ـ (قاقلێ مشكۆ) لیزەكە ، زارۆك لۆدكێ آخێ برێز چێدكن جارنا بداخوازا (كاكل) هاتیە :ـ قاقلێ هێكێ ـ قاشلێ وێ‌یە • ع ( قشر البیض ) •

(قام) ـ قامەت • بەژن وبالە :ـ قاما رەوشێ ـ بەژنا وێ‌یە•قامك، بچوكێ وێ‌یە جزیری دبێژي :ـ

دو سجدە فرضن
في الحال بیم بەر
دەما خویابت ئەو
قد وقامت •
دێم وەكو فصلا بهاري
لێ قیامت قد وقام ••
یا من یری خلي فهل ؟
یشبه بشيء قاماه ؟ ••

وادیارە ( قام ـ قامت ) ژعربي هاتیە زمانێ كوردي • لێ قام بویە كوردي زبەر كۆ جي گرتیە • ع ( القد ) •

(قاقم) ـ كوركێ قاقم گەلەك گرانبهایە • مەزن بدیاري زهەف رە رێدكن •

(قان) ـ بداخوازا دەین وجار ، هاتیە :ـ بارام قانێ خوە خیش كرنە • بارام چەند قانا بفەرهاد رە لەیزت ـ لیست • فێ‌قانێ ژي بلیزە • ئەڤ قانا منە ـ ماتا منە ـ دۆرا منە ـ جارا منە • ( مرة وكرة ) •

(قاپان) ـ دكێشانێ‌دە ناڤدارە • عرب ژي دبێژن :ـ ( قبان ) لێ

ئەعربي يە •

(قاپان) ـ پایە وكوباري ودفـــــرە وژخوەحسـكرنە • دبێژن :ـ بارام بقاپانە ـ بپایەیە ـ گەلەك زخوە حسكري‌يە • ع(الانانية وحب الذات ) •

(قارون) ـ ناڤـــەكي تاريخـــي‌يە ، بدەولەمەندي ناڤ‌دایە •

(قالون) ـ چغـــارە ڤەخـــوەر ـ چغارە كێش باش ناس‌دكـن • قالون ژ ســـەرك وتـــيرك هاتيەهەف • سەرك زحەري ـژكەڤر ـ زدار چێ‌دكرن • بەلام تيرك ، ژبەلالـــوك چێ‌دكرن • ايماموٚكا ســەرێ تيركێ دەولەمەندا كارەبان بوە • لێ ژكـــو هاتيـــە نزانم • ( الغليون ـ پيپ ) •

(قالن) ـ ســتورە • دبي ژتركـي هاتبي • ع ( غليظ ) •

(قانون) ـ دەستورا وەلاتەكـــي ـ ملەتەكي يە • چەند مادەنە كۆ باوەردكن ژبۆ دەستورا وەلێت باشن ولەســـەر ڤان مادا دان وستاندن ، گرتن وبەردان چێ دبن ـ ملەت پێ زسەر هـەڤ ڤەدگەرن • ژئەوروپا هاتيە •



(قانون) ـ سازەكە ناڤدارە • جزيري دبێژي :ـ

ئەم بەزنا تـە دخـوێنن
ئەي وقانون وربـــاب •

(قاوان) ـ ناڤدارە • دەنگێ دەنگێژ دخوە دە دگري ژكەسنەدي‌يێ ڤرنێ بيستەمە •

(قاون) ـ نشەك ژبەتيخە • قاونێ ( دياربەكر ـ آمەد ) ناڤدارن• ع ( نوع من البطيخ ) •

## ( قە ـ آ )

(قەبا) ـكەوا ، خەفتانەكەـ ميتانەكە، ژقوماشێ گرانبها چێ‌دكـن • ژن ومێر بسەر كنجێ خوەدە وەردگرن جزيري دبێژي :ـ

چين چين كرن زولفێ سيا
كەسك ئەتلەسا ديبا (قەبا)

قەبا ـ كەوا ـخەفتان ـ ميتان ـ پاچ ، بداخـــوازەكێ هاتنە • ع ( ملبوس مفتوح الصـــدر

يلبسونه فوق لباسهم ) •

(قەبا) ـ بلندكرنا دەنگه ـ يان بلندكرنه • قـەبا دپەيڤي ـ دەنگێ خوه بلند دكي •

(قەتا) ـ ئەو كنجێ ـ ئەو شـەليق وگەمارا كۆ بسەر چـاڤ دكەڤي ددەما كول‌بونێ دە • چاڤێ بارام قەتا گـرتنه ، كەنيشت وشەليق گرتنه ـ كول بونه • ع ( نوع من الوسخ في العيون في حالة المرض ) •

(قەتا) ـ قەتاكرن ، ژێدەرێ وێ يه ، پاقژكـرنا زاد ـ دەخـل ، ژگـەرش وگـەمارێ‌يه : رەوشێ گەنمێ خوه قـەتا دكي ـ پاقژدكـي بيژنگێ • ژن باش ناس دكن • زەهەڤ قەتاندن هاتيـه ـ زەهـەڤ جداكرن ـ جياوازكرن هاتيه • ع ( تنظيف الحبوب ) •

(قەدا) ـ ژ (قەدەر) هاتيـه • يان ژ (قضاء) هاتيه • دبێژن :ـ قەدا بدنيايێ كەڤي ! ( بەلا ـ قضا ـ قدر ) • لێ ( قـەدێ ) ناڤێ دەستبراكێ (سيامەدە) بداخوازا قەدەر هاتيـه • دچـيرۆكا (سيامەد) وخەجێ دە وێ باش بێ ڤەوەژارتن • ع ( القضـاء والقدر ) •

(ئەسرا) ـ ناڤێ دو گوندايه :ـ يەك دسينۆرێ ( دارا ) ونصێين دە يه ويەك دسينۆرێ ( دارا ) وماردين دە يه ، وا خويايه كۆ ئەڤ هەردو گوند سـينۆرێ دەرەبەگي‌يا بژارێ ( دارێ ) بون • هەر يەك ژڤا هـەردو گوندا قەسرەك مەزن وبلنـد تێدە هەيه • يا رۆژهـلات قەسرا بوبلانا ، ويا رۆژآڤـا قەسرا قەلەندەرا يه •

(قەلەندەرا) ـ ناڤێ ايلەكه كوردە ، ل رۆژ هلاتێ ماردين دكەڤي • قەسرا قەلەندەرا جهێ آغێ يه ـ مەزنێ ايلێ تێدە يه ـ مالا حسـين‌آغـا تێ دەنـه • دكۆكا خوەدە ( قەلـەندەر ) بداخوازا فەقير ـ پەريشـان ـ بێوار هاتيه • ع ( عشـيرة

كوردية شرقي ءاردين ) •

(قەزا) ـ ژقەدا ـ (قضاء) ، هاتيـه :ـ قەزا كەرجۆسێ ، قـــەزا هەسارێ ، قەزا ئۆمەريا ، قەزا هەڤێركا ، قەزا هەبزبنيا ••• بداخوازا (عشير) وائِل هاتنه • ژعربي هاتيه ناڤ زمانێ مه • ع ( القضاء والناحية ) •

(قەشا) ـ قەشەم ـ سەخت • ئەو آڤ كۆ زڤستانا دبي بوز ـ هنك دبي :ـ ايرۆ آڤ بويه قەشا ، قەشا حەلِيايه :ـ قەشەما سـەر دلێ دژمن ونەيارا دحەليـا • (قەشـــەمێ) بويه ناڤێ ژنا • ع (الجليد) •

(قەنا) ـ بداخوازا ( هـــەرنەبي ) ، قه ـ نا ـ نه • قه نەبي :ـهەي حەقێ م نادي قەنا بێژه :ـ مالا ته آڤا • يانى هيچ نەبي بێژه:ـ مالا ته آڤا • آريكاريا من ناكي قەنا آليكاريا دژمنێ م مەكه ـ آليكاريا دژمنێ خوه مەكه ؟• ع ( بمعنى :ـ على الاقل ) •

( ئه ـئه )

(قەبه) ـ وەكه (قەبا) بداخوازا بلند وپايه ، هاتيه :ـ بارام گەلەك قەبه يه ـ گەلەك بپـــايه وبنەفسه • پارام گەلەك قەبه لێ دخي ـ زێده خەرج دكـي ـ خوه گەلەك بلند دبێني • ع ( التكبر والتعالي ) •

(قەتاره) ـ ل پاش بارێ دەڤا بـەنك هەيه ، ناڤێ وي قـەتاره يه ، بارێ سڤك پێ گـرێددن ـ دا دلەقێنن • يان ئەو تشـــت بـخوه قەتارەيه • (كەپەنەك) لپاش باره • ع ( حبال يشدون بها بعض اغراضهم وراء الحمل)

(قەديفه) ـ ناڤداره • هنك ژقوماشێ گرانبهايه • بەرێ مالمـەزنـا لخوەدكر•لێ ايرۆ هەركەس لخوه دكي • ع (معروف) •

(قەرپينه) ـ دەمانچه ـ دومانچه ـ شـــەش‌آر ـ شـــەش‌آگر ـ شـــەش‌دەرب ـ پشـــتۆ ـ بداخوازەكێ هاتنـــه ، لـــێ (قەرپينه) ددەمێـــن بۆرىءده

دەربەک تێدە هەبو ، خویایە ژدەنگێ خوە دەرکەتیـــە ـ بدەنگێ خوە هاتیە نافـــدان ـ ژ(قەرپ) هاتیە • قەرپ ـ قەرپقەرپ • دەنگێ تفنگایە ـ دەنگێ شـــــکەستێیە • هن دبێژن :ـ (تەک) ـ یاني یەک، دەرب • ع ( مسدس قدیم ذات طلقة واحدة ) •

(قەراسە) ـ دارەکـــە • ژێرێ وي زراف وژۆرێ وي ستورە • دخن بن کەڤر وقورمێ مەزن ورادکن • جهێ کۆ دخن بن کەڤر ـ بن قورم زراڤە وجهێ کۆ بدەستێ خوە دگـــرن ستورە ، ژبۆ کۆ خـــورتی وهنەرا وی ژکەڤر وقـــورم بێتربي • گـــەلەک جـــارا ژمێرێ چێرە دبێژن :ـ بارام قەراساکي مێرایە •

(قەرە) ـ بداخوازا مەزن وگەرناس هاتیە :ـ قەرە بێنباشێ دەولەتێ، قرە ئۆسمان • لێ دبي ژترکي هاتبي ، دترکيدە بداخـــوازا رەشـــە علێ دکـــوردي دە نەبداخوازا رەشە • (پەزاقەر) دناڤبەرا سۆر ورەش دەیـــە • (قـــەرەقونلو) (آققونلو) دو مالبـــاتێ ترکـــن دەمـــەکێ لوەلاتێ کوردستانا رۆژآڤـــا فەرمانداري کرنە • لێ دناڤ کوردا دە پشقینە ، وندابونە • تەنێ قەر دگەلەک جي وشون ودەرا دە مایە • ع ( لـــون بين الاسود والاحمر ) •

(قەرادە) ـ آوارە ـ عەویری یە • یاني بکێر تشتەکي نایێ ـ تین ـ هێز ـ قوة ـ تێ دە نەمایە • ع (يقال لكل شيء لانفع فيه) •

(قەمبەرە) ـ ناڤدارە ژزۆردە بسەر دژمن دە بەرددن ، گەلـەک نفشێ وێ هەنە • ع (القنابل) •

(قەنەپە) ـ کورســـيێ یايلينە • نەکوردييە لێ هاتیە زمـــانێ مە • کورد وعرب وترک ولۆ دبێژن • لێ بهنا ترکـــي ژێ تێ •

(قەشە) ـ کەشە ـ قاشـــۆ ـ قس ،

بداخوازەكێ نە • رێبـــەرێ
ئۆلا فلەها يە • ژ ( خوري )
بچوكترە • ع (القس) •
(قەزاتمە) ـ گۆشـــتێ كـــەلاندي
وبـــــدۆنێ خــــــوە
قەلاندي يە ، خـــــوارنەكە •
ژتركي هاتيە كوردي وعربي•
ع ( معروف ) •
(قنارە) ـ ژتركي هاتيـە • گۆشـت
پێڤە بدارڤەدكن • ع(معروف)
(قەندرخە) ـ ناڤێ گەياكيێيە ، تومێ
وي فرە وبلند دبي • ئەوجهێ
كۆ قەندەرخە تێدەشێن دبي،زاد
تێدە شـێن نابي • ژلـــەورا
كورمانج بدەست وكـــۆتان
رادكرن ، لێ ايرۆ بدەرەكتۆرا
خوەش رادبي • ع ( اســـم
نبات تشبه الحنطة لكنها بدون ثمرة)

## ( قه ـ ئي )

(قەچانچي) ـ گۆتنەكە تركـي يە ،
لێ كەتيە ناڤ كوردي ـ بويە
كوردي ، ئەو مرۆڤێ كــۆ
بازرگاني دكـــي بدزي ـ بێ
پاســــــپۆرت دســـــينۆرا

دەرباس دبي • زقاچ ـ قاشت،
دەركەتيە ، بداخوازا رەڤە •
ع ( المهرب ) •
(قەرەچي) ناڤێ هنك مـــــرۆڤن ،
دكۆنادە دگــــەرن ، زێ وا
پارس ودزيێ دكــــن ، بێ
وەلات وجي نە لـهــەر دەري
دگــــــەرن ، پێژنگ ومۆخل
وسەرادا چێدكن ، زمانەكـي
وا هەيە لێ تا ايرۆ نەهاتيــە
زانين ، نزانن ژچە ملەتي نە•
چـــــەهرێ وان ئەســـمرە •
قەرەچي ـ قرەچهرە • دخوازم
دبوارا وادە تشتەك بنڤيسم ـ
بكۆلم • ع ( الكاولية ) •
(قەرمچي) ـ روێ بەرام قەرمچـــي
يە ، ب سەر هە ڤدە هاتيـە •
قەرمچـــاندن ژێـــدەرە •
ع ( التقلص ) •
(قەلي) ـ گۆشتێ قەلانديێيە • ايسال
مالا بارام سێ تەنەكە قـــەلي
چێكرنە • لناڤ كـــــوردا
ناڤدارە • ع ( اللحم المقلي ) •
(قەلسي) ـ بندەستي وپەريشـــاني

وكيماسي يه :ـ بارام قەلسەـ نكاري لبەر دژمنێ خـــوه بپەيقي ـ بندەستە ـ ئـەڤ دارا مە قەلسە ـ زەعيفــە ـ ضعيفە قەلسەمێر دهەمبـــەر خـــــورتەمێردە هاتيـــە • ع ( الضعيف ـ المغلوب ) •

(قەمەرى) نافێ پەراكي بچوكە ، دبي لشونا فرنگ ـ چـەرخي ـ آنه • هاتيي • تا ايرۆ ژي بۆتا دبێـــــژن :ـ بارام نەهێژايە قەمەرييەكي • ع ( فرنگ )•

(قەنجي) ـ چاكي ـ باشي يە :ـبارام قەنجە ـ بارام چاكە ـ باشە • قەنجۆ ـ نافێ مێرايە ، قەنجێ نافێ ژنايــــە • وهارەنگــــە بداخوازا دانا پر هاتيـــە :ـ گەلەك قەنجييێ بارام لسەر مە هەنە ، ئەز قەنجييا بكێ بكم دبن خەرابي ، قەنجي دهەمبەر خەرابي دە هـــاتيە :ـ بارام قەنجەـنەخەرابە•ع (الاحسان)

(قەيسي) نفشـــەك مشمشــــە • ع ( نوع من المشمش ) •

(قەيسەري) ـ چــارچي يەكـــە سەرگرتي يە ، تێدە كـرين وفرۆتن دبي • واخويا يە كۆ ددەمێن كەڤارە دە تشتێ كـۆ دڤێ چارچــي يێدە بهـــاتا فرۆتن پارا قەيسەر تێ هەبو ـ ياني ژسەدى هنك ددانــە قەيسەر ـ قيصر • ژلـــەورا نافێ وێ بويە قەيســـەري • ع ( أسواق معروفة ) •

(قەبقاب) ـ نافەكـــي دەنگـــييە ، ژ(قەب) هاتيە • دخنلنگێخوە ـپيــێ خوە • عرب ژي دبێـــژن :ـ قەبقاب ـ قباقيب ) •

(قەبقەب) ـ دەنگێ كەوە ـ دەنگێ• دێـــرێ چێيە :ـ قەبقـــەبا سەيدايە ، وەكە كەوێ ربات كـــــەوێ نێـــر دكـــي قەبقـــــەب • (قـــەبۆ) نافێ ديلانەكە كوردىيە :ـ لۆ قەبۆ ! ئەز قەبێ تەمە دچن وتێن ودەستێ خـــوە لهەڤ دخن • ئەز قەبێ تەمە ـ بەربەرێ تەمە ـ هاتمـــە

شه‌رێ ته • ع (صوت‌الحجل)•
(قه‌لب)ـ بداخوازا چروکه ـزه‌غه‌له•
(قه‌لبۆ) ناڤێ مێرایه :ـ کابا ته
قه‌لبه ـ پەرێ ته قـــه‌لبن ـ
چروکن • ناچـن ـ پێ دان
وستاندن نابي • ع (مزيف) •
(قه‌تاب) ـ قه‌تابکرن ، دگیســـن ده
خویا دکي ، ده‌ما ســـــه‌رێ
گیسن ژ آژۆتن کۆ دبي جوتکار
گیسنێ خـــوه دبي جــــم
هاسنکه‌ر وسه‌رێ وی قــه‌تاب
دکی • هن پولا بســـــه‌رڤه
داتینی : گیسنێ بارام ژقــه‌تاب
که‌تیه ، بارام گیسنێ خـــوه
قه‌تاب‌کریه • ع ( تجــديد
وترقيع وتحسين‌في‌سكةالفلاحة)
(قه‌تریب) ـ آلافـــه‌که دناڤ آلاڤێ
جۆتکرن ده‌یه •
(قه‌سپ) ـ کابا بارام قه‌سپه (قه‌سپ)
ئه‌وه کۆ که‌ڤن وشوت ولوس
بي • هنک ب‌هێز وخورته •
(قه‌رپ) ـ قه‌رپین ژێدەره ، ده‌نگێ
شکاندن ـ شکه‌ستن ـ شکانه:ـ
دارێ گۆ قه‌رب وشکه‌ست ،
بارام گۆ قه‌رپ ودار شکاند •
قه‌رپین ژڤي دارێ مه هـــــات
قه‌راپ ـ قرپ ژی تێن گۆتن•
ع ( صوت الكسر ) •
(قه‌رپ‌قه‌رپ) ـ وه‌کــــه قه‌رپه لێ
فره‌تره : ـقه‌رپ‌قه‌رپا شمکا ،
وها ره‌نگه بێتر خورت وبهێزه،
چاوا گۆتن دوجـــــار دبي ،
داخوازێ ژي ولۆ دوجـار دبي •
ع(صوت‌الكسرولكن‌اكثرشدة)•
(قه‌رت) ـ بداخوازا ناڤســــه‌ره ـ
مه‌زن • یان په‌رگال وره‌وشه‌که
کۆ دکه‌ڤی ناڤبه‌را جـــــواني
وپیریتي :ـ ره‌وشێ هێژجوانه،
لێ سه‌یران قه‌رت بویه • بارام
قه‌رته مێره • ( قه‌رتێ ) ناڤێ
گونده‌کـــي یــه ، لراژۆرێ
ماردین دکه‌ڤی •
(قه‌رقیت) توفلێ په‌تیخ وهه‌رمي یێ
کۆ هشک دکن ـ زوا دکن •
(قه‌رقات) گونده‌که دکـــه‌ڤي
رۆژآڤــــایێ (که‌رجــــۆس)
وراسه‌ری ده‌شتا ( هسارێ )
یه • ع ( المجفف من البطيخ

والكمثرى وماشاكلها ) •
(قەرقوت) ـ هور وموریٚ بیٚ‌کێرن•
یان شکەستی ، یان کەڤـــارە
بونە • کار بوا نابي • هنــك
دبێژن:ـقەرقوت•ع(المهملات)•
(قەرمیت) ـ تابوگن • عـــربژي
دبێژن • لیٚ من کـــرنا ویٚ
دعربي دە نەدي یە•(قەرموت)
گـــوندەکە ، لدەشـــتا
(هەساریٚ) دکەڤي ، ژقـــەزا
هەساریٚیە •
(قەفت) ـ باقە ـ دەستەیە :ـ قەفتەك
گول ، قەفتەك گەنم‌ـفریك•
دەستەك گولە ـ دەســـتەك
گەنمە ـ دەستەك فریکـە •
قەفتا خەنجەریٚ دەستکیٚ ویٚ
یە ••• ع ( باقە ••• ) •
(قەمت) ـ بچوکیٚ ویٚ قەمتـــکە •
بەرستوکەـ بکراسافە چیٚدکن،
بمل وستوڤە هەنە • قەمتـــکا
دەستیٚ من تەنگە ـ قەمتـــکا
ستوویٚ‌بارام تەنگەع(الیاخة_یاقة)
(قەرس) ـ باژارەکي کوردستانیٚ یە،
دکەڤي سینۆریٚ ســوڤیتستانیٚ
شەریٚ قەرسیٚ دەرویٚشـــیٚ
کوردا دجەنگـــا یەکـــەم دە
بهلبستە دگۆتن ، گـــەلەك
دلشوات بو • ع ( مدینـــة
کوردیة بطلة شمال کوردستان)
(قەفقاس) ـ قۆقاز • دکەڤي پـاش
سینۆریٚ راژۆریٚ کوردستانیٚ•
گورجستان وأرمنستان دقەفقاس
دەنە ، سینۆرداشـــیٚ هەنە •
جیاییٚ قـــەفقاس ناڤـــدارە
هن دبێژن :ـ (قـاف) کـــۆ
دقرآنیٚ دە هاتیە قەفقاســـە
قۆقازە • ع (قافقاسیا) •
(قەلس) ـ ژێدەریٚ وي قەلسي‌یە ،
دەرباس بویە • قەلس ئـــەو
مرۆڤیٚ بن دەست‌وشکەستي‌یە•
قەلســـەمێر ئەو مرۆڤیٚ کۆ
دقەلسیا مرۆڤ دە دژمناهیـــا
مرۆڤ دکي • دەماکۆ مرۆڤ
خورت‌بي ، نەویٚري خـــوە
ئەشکەرا بکي • ع (المغلوب)•
(قەواس) ـ بەردەســـــت وبەیاییٚ
بەترك وخاچ‌پەرەســـتایە •
دەلامە تەکە •

(قه‌نج) ـ مروڤێ كۆ قه‌نجي‌يێ دكي٠ قه‌نجي ده‌رباس بويه زێده‌ره٠ (قه‌نجۆ) ناڤێ مـــرۆڤا يه ـ ناڤێ مێرايه ٠ ع ( المحسن ـ الحسن ) ٠

(قه‌رباچ) ـ قامچي يه ( كه‌رباچ ) ٠ ٠ دزنزانا ده ئه‌ڤ گه‌له‌ك بترس وساوه ٠ ژهاسن وچه‌رم‌ل‌هه‌ڤ هاتيه پێچان ٠ ع ( السياط )٠

(قـــه‌ره‌قوچ) ـ قه‌ره‌قوچـــــك ـ قه‌ره‌قيچك ، تليا قه‌ره‌قوچك ـ قه‌ره‌قيچكێ ـ تليا بچوكـه ده‌ست ولنگا ده‌ـدده‌ست‌وپاده٠ ع ( الخنصر ـ الاصبع الاخير في اليد والرجل ) ٠

(قه‌لاچ) ـ دۆادێ ده قه‌لاچ ئه‌و جهێ هنه‌ك بلند كۆ زبۆ چـاندني بكار نايێن ـ بانه‌كي بێ‌كێره ـ بێ‌خێره ٠ ع ( هضبات مـــن الارض لاتصلح للفلاحة ) ٠

(قه‌لاچ) ـ ديڤانێ‌ده ٠ ل‌درێــــژيا هه‌ردو ده‌ستايه ـ هـــــه‌ردو مــــلايه ٠ دبێژ وچـــالا ده ، دوه‌ريس وشــــه‌ريتا ده تێ خوياكرن :ـ چالا مه چـــــل قه‌لاچي كوره ، وه‌ريسێ مـه سێزده قه‌لاچه ٠ ع ( الكيـل بطول الذراعين من اليدين ) ٠

(قه‌ند) ـ سه‌ريك‌شه‌كره‌٠فارس ژي ولۆ دبێژن ٠ ع ( السكر ) ٠

(قه‌ند) ـ دكوردمانجي ده دبێژن :ـ بارام قه‌ندێ مالێ يه ـ قه‌ندێ وايه ٠ سه‌رێ وايه ـ مه‌زنێ وايه‌ـزانايێ وايه٠ع(الرئيس)٠

(قه‌ر) ـ توزه‌كه ، دناڤ به‌را ره‌ش وسۆرده‌يه ٠ په‌زا قـــــه‌ر ، به‌رانێ قه‌ر ـ هه‌سپێ قـه‌ر ـ قه‌رۆ ٠ قه‌رێ ، ناڤێ مێر وژنا يه ٠ ع ( لون بين الاســـود والاحمر ) ٠

(قه‌رقه‌ر) ـ قه‌لقه‌ل ٠ كفه‌فه‌نه :ـ مريێ گۆرستانا قه‌رقه‌رێ خوه ل‌سه‌رێ خوه گه‌راندن ول‌سه‌ر تربێ خوه رونشتن ع ( الكفن ) ٠

(قه‌شمه‌ر) مروڤێ كۆ قه‌شمه‌ريا دكي ـ تنازا دكي ٠ خـــه‌لك پێ دكـــه‌نن ـ بێ رومـــــه‌ت

دبێنن • ژتركي هاتيــــه •
ع ( المضحكك ـ الهزلي ) •
(قەلێر) ـ گەمارە • دەست بقەلێر ـ
دەست بگەمارە • قـــرێژە •
ع ( الوسخ ) •
(قەمەر) ـ وەکە قەرە • دناڤ بـەرا
ســۆر ورەش دەیە : هەسپێ
قەمەر ، مەهینا قەمـــەر •
(قەمەرێ) ـ ناڤێ ســترانەکە
کورمانجي یە:ـ
لێلێ قـــەمەرێ جـانێ
ژبۆنا تــە تێـــم •••
(قەز) ـ نڤشـەک ژهەڤرمێشـــە
هەڤرمێشە • پشـتا قـــەز
ناڤدارە • ع (نوع من الحرير)•
(قەوقاز) ـ قەڤقاسە • دەرباس بویە•
درازۆرێ کوردستان دەیە •
(قەرێژ) ـ یان قرێژ • گـــەمارە •
قەلێرە • ع ( الوسخ ) •
(قەرراش) ـ آشڤانە ـ آشـەوانە •
ئێکۆ لبەر آشە ـآشگەرینە:ـ
دەردێ قەرێش آڤ بێ ســەر
ئێش ، ( قەراشیک ) گوندەکە
لرۆژهلاتێ ماردینە • ـ دبي

ژگـــەرراش ـ گـــەر ـ
آش هـاتبي • ئێکـــۆ آش
دگەرێني • یان ژقـــەرراش
بداخوازا عربي ( قرش یقرش
ـ قرشـــا ) هاتبي • ئێکـــۆ
آش دگەرێنی • یان ژقەرراش
آشگەر ـ گەرآش خوەشترە •
ع ( طحان ) •
(قەرتیش) ـ نڤشەک ـ قــەلشــە
ژهەڤ چریایە :ـقەرتیش دنگێ
بارام ڤەبونە ـ قەلشێ مـەزن
دنگێ وي ڤەبونە • (التشقق)•
(قەرەباش) ـ ناڤێ هنەک فلەنـە ،
لهێلا ( دیاربەکر ـ آمـەد )
رودنن •بداخوازا ســەررەش
هاتیە • ع ( طائفة مسیحیـــة
بأطراف دیار بكر ) •
(قەرواش) ـ بەردەستي ـ کارکەر ـ
رەنجبەرا ناڤ مالێ یە ، ژنە•
ع ( الخادمة ) •
(قەلاش) ـ بداخوازا گـەرناس ـ
ولاشچرین هاتیە • ژقەلش ـ
قەلاشتن • هاتیە • دبي عرب
ژي ولۆ بێژن ، لێ کوردیە •

ژبه‌ركۆ (قه‌لش) گـــه‌له‌ك
وه‌شه دكورديده هاتـــــه •
ع (البطل ـ الجراح) •
(قه‌واش) ـ بچوكێ وێ قه‌واشكه •
سه‌ريكي وێ پان وقولقوليه،
كوتلك وگۆشــــت وغارك
ژناڤ آڤێ پێ ده‌ردخن • ) •
(قه‌لش) ـ جه‌لغ وچراندنا تشته‌كي
يه • ع ( الشقوق ) •
(قه‌رف) ـ تناز وحه‌نه‌ك وگالته‌يه•
دبي ژعربي هاتبي • لێ بويه
كوردی لێ بڤێ داخــــوازێ
نه‌هاتيه •
(قه‌رقه‌ف) ـ وا خويايه كۆ ناڤـه‌كي
شه‌رابێ يه جزيری دبێ :ـ
ساقي كۆ دێ مه‌هوش بتن
كاكل ژشـيڤا ره‌ش بتن
قه‌رقه‌ف بلا آتـه‌ش بتن
ئه‌م دێ بوێ دل كن علاج
(قه‌پاخ) ـ يان قه‌لپاغ • كومكا سه‌ره
ـ په‌رچاكي لسه‌ر به‌رۆشــێ
يه • يانی ئه‌و تشـتێ كۆ پێ
ددڤێ پـانه‌كێ ـ تشـــته‌كي
دگرن • وه‌كه (ده‌رخـــون)

هاتيه • بهنا تركـــي ژێ تێ
ع ( الغطاء ) •
(قه‌ره‌ژداغ) چياكي كوردستانێ يه،
دكـــه‌ڤي رۆژآڤايێ ماردين،
چيايێ مه‌تينايه • مالا دريـّعـي
پاشا مه‌زنێ قه‌ره‌ژداغێ نـه •
ع (جبل مشهورغربي‌ماردين)•
(قه‌يناغ) ـ ژچه‌رم وهاسن چێ دكن
وپاله دخن تلي‌يێ خوه داكـۆ
ستري وقلچغ نه‌كه‌ڤن تلي‌يێ
وا • ژبۆ ڤي آوايي ( قه‌ينـاغ )
و ( تار ) هاتنه چێكــرن •
( آلات للحصاد يضـــعونها في
أصابعهم ) •
(قه‌يماغ) ـ لسه‌ر ماست چێ‌دبي،
لێ (تو) لسه‌ر شير چێ‌دبي :ـ
سينگ وبه‌رێ ته گه‌ورن
مينـا قه‌يماغێ ميـا •••
قه‌يماغێ كامێشا گه‌له‌ك ستور
دبي • ع ( القشطة ) •
(قه‌ربك) ـ وه‌كه قه‌فتكه • ژگێريا
ستوێ مـــرۆڤا ره تێ گۆتن •
وهاره‌نگه ژ گـــه‌وريا كراس
وقوتك ره تێ گۆتن•ع(العنق)•

(قەديشك) ـ (كەچكافەديشـــكێ) زيارتەكـــە مريشكەكێ زێرە سەرزێدكن وداخوازا خـوە ژێ دخـــوازن • دكـــەڤي بەرچەمێ دجلە ، لجـــــەم كەلەها ( علودين ـ علاءالدين ) دناڤ ايلا هەســـارێ دەيە • ع ( مزار اشتهر بقبـــول الدعوات تقع على نهر الدجلةفي منطقة (حصكف) •

(قەولك) ـ تورەكي قماشي نقشتكي يە ، قـورآن وكتێبـــا تێدە بجيدكن • لێ پاشێ بويـــە تەڤايي :ـ قەولكێ مصـحفێ ، قەولـــكێ كتێبێ ، قەولـــكێ كەڤروهەســـتە ، قەولـــكێ بازبەندێ •• ع ( كيس مـــن القماش يحتفظ به بعض الاشياء)

(قەيك) ـ وەكە (كەلەكێ) يەەلێ كەلەك دار ومەشكن وقەيك تەنێ دارە • ع ( الشختورة ) ـ القارب •

(قەرپال) ـ يا قەپال • كنجێ كەڤن وخلمەتن • گەلەك جـــارا لسەر آڤێ تێ گۆتن : ڤـايە لاشەك بسەر آڤێ كەتيـــە بويە قەرپال • ع (الخرق) •

(قەرتەل) ـ ناڤێ تەيرەكي يە ،لسەر برهانا داتینی ، مەزن وبقلافەتە• ژخوارنا بەلەتا وبرهانا پێڤـــە تشـــتەك پێ نابي • دەرەنگ دفري • ع ( طير كبير الجسم لايمكنه الطيران بسرعة يطلب الجيفة عادة ) •

(قەفل) ـ گورز ـ باق • لێ قەفـــل بداخوازا ( مەلو ) تێ • گورز وباق ژقـــەفل ـ مـــەلو • بچوكترن • دپالەيا دەخـــل وگەيا دە ( قەفل ـ مل ـ مەلو ) خويادكن • ع ( الكـــومة ـ شدة ) •

(قەنديل) ـ ناڤێ لەمپاكـــێ يـــە • لمزگـــەڤتا بدارڤە دكن • ع ( الثريات المعلقة بالجوامع )•

(قەوال) ـئێ كۆ قەولا ـ شـــعرا دبێـژن • قـــوالێ ايزيـــديا ناڤدارن • ع ( من يتقـــول بأقوال الناس ) •

(ڤەشەم) ـ ڤەشا ـ سەختە • دەرباس بویە • ڤەشەمێ ناڤێ ژنایە •
ع ( الجليد ) •

(ڤەلەم) ـ کەلەم ـ خامەیە • دعربي دە ڤەلەم ناڤدارە ، لێ دکوردي دە ڤەلەم بداخوازا ( کـەلەم ) هاتیە • یاني (کەلەم) بجارەک شـونا ڤەلـەم ستاندیە • تەنێ (کەلەم) نەژبۆ نڤیساندنێ یە• درستە هەردو دکۆکا خـوەدە یەک بن یان یەک کۆکـــا هەردوا یە • یاني درســـتە (ڤەلەم) ژ (کەلەم) هاتبي ، یان (کەلەم) ژ (ڤەلەم) هــاتبي •
ع (معروف) •

(ڤەتاندن) ـ ژێکرنە:ـ ئەڤ تا ڤەتیا ، من ئەڤ تا ڤەتاند • ڤـەتاندن ژێـــدەرە • ( ڤـــەتەک ) ژڤر دەرکەتیە •

(ڤەشارتن) ـ ژێکرنا ڤاشلایە :ـ في پەتیخي بڤەشێر ، من ئـەڤ پەتیخ ڤەشارت •

(ڤەلاندن) ـ رەوشێ رونێ خـــوە ڤەلاند •

(ڤەڤازتن) بارام خوە دسەر گۆلێ ـ برکێ رە ڤەڤازت ـچەنگ کر •

(ڤەلاشتن) ـ بارام دارێ مە ڤەلاشت چراند •
:ـ ئەڤ چەند ژێدەر هـــەمو ژعربي هاتنە • تەنێ ڤەلاشتن دکوردي دە گەلەک پەرچـە وەشە تێدە هاتنە • ع ( هذه مصادر عربية دخلت في لهجتنا)•

(ڤەلەن) ـ ڤەلەنێ رەوشێ گـــرانە هەزار زێرە • ع (الصداق) •

(ڤەیتان) ـ چەند تا وشەریتن هاتنـە هوناندن وبونـە ڤـــەیتان • لشونا نیشـــان هاتنــە •
ع ( النواشين ) •

(ڤەلەو) ـ ستور وتێر گۆشـــــتە ـ بەزگرتیە • بارام ڤـــەلەو بویە ـ گۆشـــــتگرتیە ـ
ع ( السمين ) •

(ڤەي) ـ دکورمانجي دە بداخـــوازا (بۆچي) هاتیە :ـ ڤەي بـارام ناچـــي خوەندەگــــەهێ ـ مەدرەسێ ؟ لێ بسـێـــۆراني (ڤەي) وغەم بداخوازە کێنە:ـ

قەي ناكـــى ـ غـــەمناكي •
قەيناكي با بـــارام برۆي ـ
بروات ؟ غەم ناكي بەرە بارام
هەري ؟ ••• ع ( أداة بمعنى
لماذا ـ لا بأس ) •

(ڤيقي) ـ دەنگێ بانگا ديكە ـ بانگـا
كەلەشێرە • ع (صباح الديك)•

(ڤيپ) ـ چيپە ـ ڤيك بچوكێ وێ
يە • ژچـــۆكێ وبەرژێرن •
ژچيمێ ستور وقـــەلەو رە
تێ گۆتن •ع (السيقان الغليظة)•

## ( ڤي )

(ڤيت) ـ ڤيتك بچـــوكێ وێ يە •
دليستكا زارۆكا دە خويا دكي•
داركە بچوكــە پێ بدارپەلك
دليزن • بچۆكانێ دەســـتێ
خوە لڤيتكێ دخن وبلند دكن•
ع ( خشبة صغيرة في لعبــــة
للاولاد ) •

(ڤيچ) ـ بداخوازا (ڤچ) هاتيـــــە :
ڤيچەك بەنيشت بدە رەشـــێ
ڤچـــەك • هـــن دبێژن :ـ
ليچك ـ پيچك ـ ڤچـك ـ
پچك • (ڤيچ) بداخوازا بـەل
هاتيە :ـ بارام دران ڤيچـە ـ
دران بەلە•( بعض أو أصفر )•

(ڤير) ـ ناڤدارە • تێ كرين وفرۆتن•
(ڤيرێ) گوندەكـــە ، لژێرێ
قامشلي دكەڤي • (بانێ ڤيرێ)
جياكي بچـــوكە لدەشـــتا
بشــــێرييێ دكـــەڤي ،
(فەليتێ قوتۆ) لبانێ ڤـــيرێ
هاتيە كوشـــتن ، ســـترانەكە
بشـــەوات ديا وي لســـەر
گۆتيە •
عـــرب ژي ولـــۆ دبێژن •
ع ( القار ) •

(ڤير) ـ ڤيرڤير ـ ڤرين ـ ڤيرين ـڤر ـ
ڤرڤر • هەمو نێزيكي هەڤن:ـ
گهـــام گـــوندەك
لوي ڤـير وهـــەوارا
چە بێژم ئـــەز ژڤـــێ
كۆما كـــەرا را •••
:ـ دەنگێ بلنـــد وهـــاوار
وگريان وگازي يە•ع (الولولة
والصياح) •

(ڤيڤار) ـ ڤۆراتێ هـن گـــەيانە ،
بشيني تێنە خوارن •

(قيرتير) ـ ژقير مەزنتر وپێتره •
قيرين ژێدەرێ هەردوايە •

(قيز) ـ كيژ ـ چيژه • تـرك ژی
دبێژن :ـ (قز) • لێبكـوردیا
راستي كەچە ـ كچە •

(قيژ) ـ قيژقيژ • دەنگێ چـوك
وچقيكايە ، پاشێ بويە دەنگێ
مرۆڤان • دەما چوك وچقيك
ايريشي هەف دكن • دكـن
قيژقيژ ، ژلەورا دەنگێ ژنـا
ژي بقيژقيژ ناڤ دايە دەمـا
كۆشەر دكن ـ پەڤـدچن •
ع ( كلمة صوتية ) •

(قيش) ـ هن چيايێ نەگەلەكبلندن•
ع (الهضبة) •

(قيق) ئەو مرۆڤێ كـۆ گـەلەك
زراڤ وەزا بويـــه :ـ
بارام قيق بويە • زراف وژار
وپەريشـــان وەزا بويە •
ع ( الضعيف ـ الهزيل ) •

(قيل) ـ درانێ درێژ ومەزن وبەلن •
دو درانێ درێژ وبەل ومـەزن
لپێشيا دەڤ ودآرگوشبگا ژێري
دە هەنە ، ژوارە دبـێژن :ـ

(قيل) ـ دتەبايێ خـوين خـوەر ـ
گۆشتخوەر دە خـويادكن •
ع (الأنياب) •

(قيم) رازي بون ودلخوەستنه :ـ
قيما تە نايێ مالا خوە باركە •
قيما تە نايێ ژڤر هـــەره•
ع ( بمعنى التحبذ والقبـــول
والتحمل ) •

(قيرين) ژێدەرێ قير ـ قيرقيره•دەرباس
بويە •

(قيژين) ـ ژێـــدەرێ قيـــژ ـ
قيژقيژه • دەرباس بويە •

## ( ق ـ ئه )

(قسه) ـ گۆتن ـ پرس ـ خـەبەر •
بداخوازەكێ نه :ـ بارام قسه
دكـــي ـ دبێژی ـ دپەيڤی ـ
خەبەر ددي ـ گالگال دكي•
لێ ژهەموا گـــۆتن راسته •
ئەوێ دي هـــەر يـــەك
داخوازەك جدا هـــەيه •
(قسه) دبي ژ (قص) عـــربي
هاتبي • (پرس) بداخـــوازا
(سؤال) هاتيه • (خـــەبەر)
بخوە عـــربي يه • (گاگال)

دبي ژ ( قال قال ) هـاتبي ٠
بێژ ـ دەلێ ـ ئەلێ ٠ ژێدەرێ
تەڤا (گۆتن) ٠ ٠ ع ( القـول ـ
الكلام ) ٠
(قژله)ـ لەشكەرگەهە ٠ ژترکـي
هاتيه ٠ ع ( الثكنة العسكرية )٠
(قژۆله) ناڤێ چوکـەكي يان ناڤێ
چڤیکەکێ‌یە ، گۆشـتێ وي
تێ خـوارن ٠ وكـه
زەرزوورە ٠ ع ( اسم طـير
صغير ) ٠

## ( ق ـ ئي )

(قتي) ـ نفشـەك تورۆزي يـە
ـ دناڤ بەرا خەيار وتورۆزی
دەيە ٠ ع ( نوع من الخيار )٠
(قرني) ـ ژقژنك مەزن ترە ٠ خوە
ب‌لاشێ سەوال وتەبا ڤە دكي٠
خون‌مژە ٠ ژمرۆڤێ دەولەمەند
وچـكوس رە دبێـژن :ـ
فلان‌کەس وەکـە قرني‌يێ
خوينا ملـەت دمژي ٠ ئـەم
دبێژن :ـ (گەن) ٠
(قزلجي) ـ ناڤێ پێزانەكي كـوردێ
ايرانه ، دخـوندنا عربي‌دە
ناڤداره ، نڤیسـارێ قزلجـي
لسەر نفشت وکتێبا هـەنه ٠
ع ( عالم كوردى ) ٠
(قرمقات) ـ كش‌وماته :ـ سـباتێ
قرمقاتێ كەڤن چو نو نەهاتێ٠
يەك ژسۆرۆ دپرسي : ايسال
حالێ وە چاوايە ؟ دبەرسـڤا
وي دە دبێژي ـ قرمقاتە ـيانى
دەستەڤالا مانە ـ بجارەك
تشتەك نەمایە ـ كش‌وماتە ـ
تالاني‌يـە ٠ ع ( الافـلاس
ـ اللاشيء ـ المعدم ) ٠
(قيچ) ـ وەكـە (پچ) بداخـوازا
هندكە ٠ (قچك) ٠ بچوكن ـ
زارۆكن ٠ كورداغي ولـۆ
دبێژن ٠ قچك نان بدە بـارام
ـ پچـك ـ نان بدە بارام ٠
ع ( القليل من الشيء ) ٠
(قرچ) ـ قـرچقـرچ ٠ دەنـگێ
شكەستنێ يە ـ دەنگێ جوتنـا
بەنيشـتە ـ دەنگـێ
ب‌هەڤ‌خوەراندنا درانايە ٠٠٠
قرچقرچ زڤي دارێ مـە تێ ،

قرچقرچا بەنیشتێ رەوشێ یە ،
قرچقرچا درانێ بارامـــــە •
ع ( صوت الكسر وصـــــك
الأسنان ) •

(قدقد) ـ دەنگێ مریشكا یە :ـ
بو قـــدقدا مریشـــــكا
دیكا خوە دا ئەنیشـــــكا
گۆ فەرمـانا مـــە رابو
كۆما وا زهـــەف بەلا بو
وان ژی وەكە مەكوردان
دەستێ خوە ژبەر خوەبەردان
ع ( صوت الدجاج ) •

(قرد) ـ بەخت ـ حظ ـ شـانس ،
بداخوازەكێ نە :ـ
بەختێ مە رەشە قردێ مەكۆرە
ئەم تم لژێرن ، دژمن لژۆرە

(قر) ـ سەرما وخویسي وسەختە :ـ
ایرۆ قر كەتیە ، قر تێ ، قر
وسەرمایە •

(قرقر) ـ قیرقیر وقۆرقۆر ـ قارقار••
نێزیكي هەڤن :ـ چە قرقـــرا
تەیە ؟ چما دكـــي قـــرقر ؟
ع ( الثرثرة والولولةوالصیاح)•

(قژ) ـ قژقژ ـ قشـــــت ، دەنگـــێ
چوك وچڤیكا یە •ع (صوت
العصافیر ) •

(قژ) ـ بشیوەیێ سۆري گژـگژكە:
قژی نەسرین جوانە ـ پۆرێ
وێ خوەشكە ـ ژگژـگژك•
هاتیـــە ، یان گژ ـ گژك ،
ژ قژ هاتیە •

(قرش) ـ قرشـــــك • پەژك ـ
پەژالـــــوك وپوش ودارك
وپەژكێ كۆ دكەڤن بەر پێ •
رەوشێ چـــــویە قرشكا بدي
هەڤ :ـ
لەیلۆ چویـــە قرشـــكا
بو شـــەقشەقا شـــــمكا
ع (الهشیم) أو المكسورة مـن
الاشجاروالاحطاب الخفیفة ) •

(قراغ) ـ كەڤي :ـ قراغا چـــــم
ـ قراغا آڤێ ـ كەڤي‌یا چـــم
وآڤێ یە • قـــراغا نان ـ رەخ
وطرفە ـ كەڤي یە :ـ
ئەي دل ! لقراغا چەمێ (آمد)
رونە ســـــەرگەردان •
ع ( حرف النهر والجـــانب
والطرف ) •

(قغ) ـ دەنگێ هنك تەیر وچوك وچێك ومریشكە • ع ( أصوات الطیور ) •

(قلغ) ـ دلقە ـ قلغێ بارام وەكە ئێ پارسەكا یە ـ پەرگال ودلق ورەوشە • بهنا تركي ژێ تێ • ع ( الوضع السيء الرديء ) •

(قرك) ـ بۆغازا قركێ • گەردەن وگەوري وقرك ،بداخوازەكێ هاتنە :ـ

قرك تژە مرجانێ
لێ جانێ !
مەمك وەكە فنجانێ
لێ جانێ !

(قراك) ـ نافێ طەیرەكي ـ چێكەكێ یە ، بێ قدۆشە • ع (الغراب)•

(قردك) ـ نافێ شاهي یەكە كۆ دسەرسالێ دە چەند مرۆڤێ نخوماندی ـ متنكر ) لناف مالا دگەرن ـ دیلان وگۆڤەندێ دكن • پرێ جارا خوە دخن رەنگێ بوك وزاڤێ • ژوان مرۆڤێ ڤەشارتي ـ خوەگوهەراندی ـ متنكر رە تێ گۆتن : ـ قردك • دبي بچوكێ (قرد) زعربي هاتبي • ع ( أناس متنكرون في أعياد رأس السنة ـ الكرنڤال)

(قژك) ژقراك بچوكترە • بدەنگێ خوە هاتنە ناڤدان • ع ( أصغر من الغراب ) •

(قژنك) ـ ژ (قرني) بچوكترە • خونمژە ، خوە بتەبا ڤە دگري •

(قرال) ـ پادشاه ، قرالیچە ، پادشەها مێیە ـ ژنە • نەكوردي یە •

(قرام) ـ نافێ گەیاكي یە ، دناڤ آڤێ دە چێدبي ، شەریتا ژێ چێدكن •

(قن) ـ كاكل وناڤكا گوز وبەهیڤایە • ع ( اللب ) •

(قرتین) ـ دەنگێ شكەستنێ یە • ع ( صوت الكسر ) •

(قرپین) ـ دەنگێ تەقاندن وشكاندنە •

(قرن) ـ سەدەیە • سەدسال قرنەكە • لێ زكو هاتیە نزانم • تەنێ عرب ژي دبێژن :ـ قرن • لێ بویە تەڤایي :ـ كورد وفارس

وعرب وترك هممي ولـــۆ دبێژن • ع ( معروف ) •

(ڤرنەو) ـ دەنگێ پسیکا ـ پشیکایە • دەما گۆنێ وان تێ دکن نەونەو ڤرنە وي بویە هاتیــە گۆنـا ـ دەما شۆکرنا وێ هاتیــە ـ وي هاتیە • ع ( صوت البزونه والهرر في شهر شباط غالبا ) •

## ( قو ـ ئه )

(ڤوبە) ـ دیڤانێ دە داگرتنا ( ڤوبە ) ئەوە کۆ نەمشت ونەبسەري‌بي یاني وەکە ڤوبەکێ بێ‌داگرتن ـ بێ‌بلندکرن ـ بێ‌خویاکرن• داگرتن چەند نفشێ وێ‌هەنە: دارکري ، مشت ، ڤـــوبە ، بسەري • دارکري ئەوە کۆ مشت‌بکی ودارەکي دسەرڤـــە بي ، مشت ئەوە کۆ بدەســتێ خوە راست بکي ، بەلام ڤـوبە هنـــك بلنـــــد دهێلي ، لێ بسەري بەرددی سەر تـا هەو لـســـەر راوەســتي • ع ( نوع من الکیل ) •

(ڤوڤجە) ـ یان ڤومجـــە • لبـــەر پێســـیرا کنچـــا ولبـــەر زەندکێ وا دخن ، هن دبێژن :ـ پشکۆك ـ پشـــکۆژ • ع ( الازرار ) •

(ڤولە) ـ بەلەکە • هەسپێ ڤـولە ـ هەسپێ بەلەکە • لێ بەلەکي‌یا وي نەگـــەلەك جـــوان وخوەشکە :ـ

سوارێ هەسپەکي ڤولە
باجـــاغی شـــێ‌یە
نالي ژحـــوڤێ یــە ،
بزماري ژتوختێ یە •••

ع ( الأبلق ) •

(ڤوندەرە) ـ بداخـــوازا ڤونا وێ بدەرڤەدە هنك بلندە ـ هنك بدەرە ، گەلەك نفشێ وا هەنە هەرکەس دخي بي‌یێ خـــوە ـ نگێ خوە • ڤوندەرەچي ) هۆستێ ڤوندەرایە ـ ئێ کـــۆ ڤوندەرا چێدکي • ع (الحذاء ـ أو نوع من الحذاء ) •

## ( ڤو ـ ئي )

(ڤوتني) ـ ژعربي هاتیە ـ ( قطن ) ـ قطنیة ـ ناڤێ ڤوماشـــەکي‌یە

ژپەمبو چێدکن • شام قوتني
ناڤداره :ـ
شامقوتني لبەژنا خوەکر گولێ
آمن بو خوەدێ نەکر گولێ •
ع ( نوع من الخام القطني ) •
(قومري) ـ ناڤێ نفشەك تەيـــره
دكورمانجـــيـده لپاش قـــاز
تێ گـــۆتن :ـ قازوقــــومري
پاشێ بويه ناڤێ ژنا :ـ
قومريكێ ئەز رۆمي مه
كوم سۆرم ئەفەندي مه••••
(قوندەرچي) ـ هۆستێ قوندەرايه •
دڤرده (چي) ژبۆ بالقـــەدانه
ـ نسبة • وەكـــه قاوەچـــي
ـ پينەچي ـ چايچي ـ خانچي
••• لێ دتركي ده ژي ولـــۆ
دبێژن • ژلەورا هن خـــۆرتێ
كـــورد ئێ خـــونگەرم
وسەرهشك دغەيدن ودبێژن:
نابي ئەڤ (چي) دناڤ رێزمان
ونڤيسارێن مەده بێ گــــۆتن
ونڤيسين • لێ ئەڤ آورا تەنگ
وهشك نكاري بگهێ داوي ،
ژبەركـــۆ هيچ زمـــانەك

ـ ملەتەك پاقـــژ نەمـــايه ،
وبەرەبەره زێده تيكەلاو دبن •
ع ( الاسكافي ) •
(قوب) ـ كومبەدەكه بلنده ، لسەر
گۆرا مرۆڤێ مەزن ودخانييا
ده چێدكن :ـ
م گەورێ ديبو لبەر قوبێ
سەر بزێرێ ، ستو بربێ ••
كورمانج دبێژن :ـ قوبێ سپي
هەمي نەزيارەتن • عرب ژي
دبێژن :ـ قب • (قبين) ـ
بازارەكه لبشێرييێ دكەڤي •
(قولپ) ـ خەلەكه • قولپا گوهارێ
گەورێ زێرينه •
: ـ راموسانكێ بـــده مـــن
ژبنيا قولپا گوهێـــره ••
بچوكێ وێ قولپكه ـ توقولپك
ددەستێ بارام نەمايه خوه پێ
بگري • ع ( الحلقة ) •
(قوت) ـ خوارن وهلانينا ســـالێ ـ
مەهێرييه • قوتێ مەهەيه ژعربي
هاتيه •
(قوتقوت) ـ هاوارو چاڤنەباري يه:
چه قوتقوتا تەيه ؟ بسەرمەده

دەنگێ بلندە :ـ قوتقـوتا ستراناوي يە ٠٠ ع ( الصياح وفيها نوع من الحسد ) ٠

(قوتک) ـ بداخوازا کورتە٠(قوتک)٠ بچوکێ وي يە ٠

(قورت) ـ فەخوارنەکە ٠ قورتەک٠ ـ يەک قورت ٠ ع (الجرعة)٠

(قوزلقورت) ـ ژترکـي هاتيـــە ٠ ( قزل ـ قورت ) ـ کـورمێ سـيـۆرە ٠ کورمـەکـي شۆر هەيە ، سەوال ـ تەبايێ گەياخودر پێ دمـرن ٠ نافێ وي ( قـوزل قـورتە ) ٠ ع ( دودة حمراء مسمومة ) ٠

(قوچ) ـ کێلکە ٠ ژکيستەک وشەل وکەفرا ، لسينۆر ولسەر ريا چێدکن ٠ ژهەڤ رە دبێژن : هەا ئەف قوچا تە ٠ يانی ئـەڤ ( مَنتاتَه هلناگرم ـ ئەڤ سينۆرێ من وتە ٠ (قوچێ) گوندەکـە ل ناڤ ميرسـنـا دکـەفي ٠ ع ( علامات الحدود ـ علامات الطريق ، اکـوام حجرية أو ترابية ) ٠

(قولۆچ) ـ سترەهـ ـ ستو ـ رەهە : قولۆچێ گا ـ قولۆچێ بەرانا ٠٠ هن دبێژن : ـ ستورەهـ ـ رەهێ ستو ٠ ع ( القرون ) ٠

(قورچ) ـ قورچک ـ کونجـە ـ کونجکە :ـ

کال کالێ قورچـــکێ
کال مێرێ کەچکێ ٠٠٠

ع ( الزاوية ) ٠

(قونج) ـ کونجە ٠ (قونج ـ قونجک) بداخوازا قورم ـ قورمـک ٠

(قور) ـ حەري وچراڤە ٠ سۆرانيیە

جاجي کەسيکە بێ کەس
بۆ ايوە قـور دبێـوي
گۆي لێ دەکن زەريفـە
ئايکەن بەلا لە خۆتان ٠٠

ترک ژی ولێو دبێـژن ٠ ع ( الوحل ـ الطين ) ٠

(قورقور) ـ گەلەک جـارا ژناڤ زکێ جانداز دەنگێ قورقـور تێ ٠ دبێژن :ـ قورقور ززکێ گايێ مە تێ ٠ هـن دبێژن :ـ غوغور ٠ ع ( القولنج ) ٠

(قونجر) ـ دبێ قـون ـ چر بي ٠

زبەرکۆ کراسێ مرۆڤ ـ کنجێ مرۆڤ دچرێني هەور وبستري نە ، دەما خوە بیەکي ڤە بگرن دەرەنگ مرۆڤ دکاري خوە زوان بپارێزي ـ رێزگار بکي • ع ( نوع من الاشواك الصغيرة ) •

(قوتنار) ـ ژێرێ چيا ـ بنێ چيا يە • ع ( أسفل الجبل ) •

(قوروش) ـ چل پارە يە • بيست پەرە ـ دەه پەرە ـ پێنج پەرە دایمپەراطوريا عثماني دە هەبون • هێژي ئەم ولۆ دبێژن • ع (كان أربعون فلسا)

(قوماش) ـ خامەکە رەنگاورەنگایە ، گەلەک نفشێ وي هەنە • ع ( الاقمشة ) •

(قورغ) ـ ستێراسپێ يە ـ گەلاوێژە •

(قونداغ) ـ بنێ تفنگ ودەماچێ يە • ع ( أخمص ) •

(قوبك) ـ بچوکێ قوبە ، (قوبك) ناڤێ گوندەکي يە ، لناڤ هەڤێرکا يە ، لژۆرێ ( تربەسپي ) دکەڤي •

ع ( القبة الصغيرة ) •

(قوپك) ـ ئەو مريشکا کۆ کەتيە سەر هێکا وتا چيليکێ خوە ـ چيچکێ خوە بەردي ناڤێ وێ قوپکە • بدەنگێ خوە هاتيە ناڤدان • ع ( الدجاجة ذات الفروخ ) •

(قوتك) ـ بچوکێ قوتە ـ کورتك ـ بچوکێ کورتە • بسەر کراس دە لخوە دکن • وەك چۆخکە • لێ نەتەنێ ژچۆخە • قوت • کورتە •

(قوفلك) ـ چەند رستە مۆري نە ، لدەستێ خوە گرێ ددن ، لشونا بازن : ـ

وەلە تو يارا مني

تو بقوفلك وبازني ••

ع(منظومة من الخرزوالاحجار الكريمة في سواعد النساء ) •

(قولپك) ـ بچوکێ قولپە • دەرباس بويە • (قولپ) بازارەکي کوردستانا بن دەستێ ترکيایە•

(قول) ـ کونە :ـ قولا رۆڤي ـ کونا وي يە • ع ( الجحر والثقب )•

(قول) ـ كۆلە ـ عبدە • (قولێ‌رەش) زيارەتەكە ل‌ناڤ ئۆمەريا دكەڤي خەلكێ مللێ خوە دخستە ناڤ ودرەڤيان ، لێ كەسي نەوێرابو ببي • بدەرەوا بێ سوند نەدخوارن •
ع ( العبد ) ـ عبد •

(قوم) ـ سێلە وخيزە • زوغورێ‌هور وبەر چەمن • • ع ( الرمل والحصو ) •

(قورم) ـ كۆك وبنێ دار ودەڤيا يە آر آرێ قورمايە • ولو زكالا دە تێ گۆتن • ياني مرۆڤێ‌كال زێدە آر تێ هەيە • ع ( جذر الاشجار ) •

(قون) ـ قول وبنێ مرۆڤ وهەن تشتێ دي يە :ـ بارام لسەر قونا خوە روونشتي‌يە • كون ـ قون ـ قول نێزيكي هەڤن•
ع ( الجحر والثقب ) •

(قوبين) ـ بارارەكي بچوكە لبشێري‌يێ دكەڤي • ع(مدينة كوردية ) •

(قوتاندن) ـ زێدەرێ ( قوت قوت ) دەرباس بويە •

(قويين) دەنگێ تفنگ ودەمانچايە • زێدەرێ ( قوپ‌قوپ ) • •

## ( قۆ ـ ئي )

(قۆزي) ـ گۆشە ـ گوهـ ـ كونج : قۆزيێ چاڤا ، قۆزيا خاني قوزيا ديوار • قۆزي‌بر •
ع ( الزاوية ) •

(قۆپ) ـ خوار وخوز وكويە :ـ پشت قۆپ ، دەست‌قۆپ ، لنگ‌قۆپ •• ع ( الأحدب )•

(قۆپ‌قۆپ) ـ دەنگێ قۆرتايە • دشەرادە دبێژن :ـ قۆپ‌قۆپا بارامە • دكۆزكێ دە شەردكي

(قۆت) ـ ئەوەكۆ تشتەك لسەر سەرێ خوە راوەستي • كابا بارام قۆت هاتيە ـ لسەر سەرێ خوە رابويە •
ع ( الوقوف على رأسه ) •

(قۆرات) ـ ستورێ زێرێ گەيايە :ـ بارام پەلا ناخوي ، لێ قۆراتا دخوي •

(قۆج) ـ قۆجە • بداخوازا مەزن هاتيە ، قۆج هەسار ـ هەسارا

مەزن ژتركي هاتیه • ع(الكبیر)

(قۆچ) ـ خوز وخواروب سەرهەڤدە هاتیە كوپ كرن :ـ بارام قۆچ بویە ـ خوز بویە •ع (الانحناء)

(قۆسار) ـ قۆج هەسارە • بازارەكە- یان كەڤنە بازارە ، لژێرێ (ماردین) دكەڤي • ع (مدینة كوردیة قدیمة جنوب ماردین)

(قۆش) ـ لپاش كورتانێ كەر وقانتر وبارگیرا قۆش هەیە :ـ كورمانج دبێژن قۆش سەنەدا بێرە • تاوەكو دسەر زێر وسەر ژۆرا دە كورتانێ نەشەمتي•

(قۆتڕەش) ـ ناڤێ مالباتەكەكوردە، لشام رونشتي‌نە • نافدارن • ژوان گەلەك سەردارێ لەشكەري رابونە • رەش‌قۆت ـ رەشكۆت • ناڤێ ائلەكە كوردە ، لناف خەرزا دكەڤي• هەردو ژي بداخوازا سەر رەش هاتنە •

ع ( رأس الأسود ـ أسود الراس ) اسم عائلة كوردیة بدمشق ) •

(قۆڤ) ـ جەر وشەربك وكویك وهەمو تشتێ كەڤن وشكەستي دڤي نفشي دە ژوارە دبێژن : قۆڤ • ع ( القدیم من الخزف والآجر ) •

(قۆتك) ـ سەرێ هەر تشتي یە • وهرەنكە نەخوەشي یەكە زو نەخوەش دكوژي.. قبۆتك دوەدە بێ ، یەكێ ژوە نەمێني! ع ( مرض الكولیرا ) •

(قۆلك) دارەكە پێ شبەردكن :ـ لێ دا قۆلك • ع ( آلة حرب خشبیة كالدبوس ) •

(قۆرك) ـ هەستي‌یێ پشتێ یە :ـ آخ ، پشت ، قۆرك وهەردو تەنشت • (قۆرێ) نافێ مرۆڤایە • ع ( العمود الفقري في ظهر الانسان والحیوان ) •

(قۆل) ـ قۆلان • قۆلێ زێرا ژن ددن بەر آنیا خوە :ـ
قۆلێ زێرا بسەر آنیكا منە گەور دە خوارە •

# چەوت وڕاست

| ڕوپەل | ستون | خێز | چەوت | ڕاست |
|---|---|---|---|---|
| ٣ | ١ | ١٥ | کیتە | کەتیە |
| ٣ | ٢ | ٣ | کوما | کۆمـا |
| ٣ | ٢ | ٦ | جێذێ | جێزێ |
| ٤ | ١ | ٨ | ناڤی | ناڤێ |
| ٤ | ٢ | ١ | هەمێ | هەمي |
| ٤ | ٢ | ١٧ | دەرکیتە | دەرکیە |
| ٤ | ٢ | ١٩ | دەنیە | دەینە |
| ٥ | ١ | ٨ | تورن | تۆرن |
| ٥ | ٢ | ٢ | عط | عـ |
| ٦ | ١ | ٢ | بەریەری | بەربەري |
| ٨ | ١ | ٩ | ایکەکە | اێلەکە |
| ١٢ | ١ | ٦ | کومانج | کورمانج |
| ١٣ | ١ | ١١ | چاتێ | چاڤێ |
| ١٤ | ١ | ٢١ | چاڤیتوک | چاڤینۆک |
| ١٥ | ١ | ٢٤ | گیم بها | گیم‌بها |
| ١٦ | ١ | ٢٣ | جەنەبي | چەلەبي |
| ١٧ | ١ | ٢ | رەنار | زەنار |
| ٢٢ | ١ | ٨ | دنفکێدە | دتفنگێدە |
| ٢٣ | ١ | ١٥ | تەڤایێیە | تەڤاییە |
| ٢٤ | ٢ | ١٠ | جاني | جانێ |
| ٢٤ | ٢ | ١٢ | جانی | جانێ |
| ٢٤ | ٢ | ١٢ | کوباری | کوبارێ |

| ڕویەل | ستون | خێز | چەوت | ڕاست |
|---|---|---|---|---|
| ٢٦ | ٢ | ١٦ | بێ داخوازا | بێ داخواز |
| ٢٨ | ٢ | ٢ | بارەکێ | بارەکي |
| ٢٨ | ٢ | ١٣ | سەریکێ | سەریکي |
| ٢٩ | ٢ | ٢٣ | چاو | چاو |
| ٣١ | ٢ | ١ | ئێکەکە | ئێلەکە |
| ٣١ | ٢ | ٢٠ | دکرن | دگرن |
| ٣٣ | ١ | ١٣ | چوك | چۆل |
| ٣٣ | ١ | ١٦ | چوتل | چۆتل |
| ٣٥ | ١ | ٢١ | گوتن | گۆتن |
| ٣٦ | ٢ | ٨ | لچێێ | لجییێ |
| ٣٦ | ٢ | ١٤ | گزێرێ | گزیرێ |
| ٣٨ | ١ | ١٦ | چارنا | جارنا |
| ٣٩ | ٢ | ٦ | وسور | وسۆر |
| ٤٠ | ١ | ١٣ | دائرێ | دارێ |
| ٤١ | ٢ | ١٨ | گوتن | گۆتن |
| ٤٢ | ١ | ٥ | آیلەکە | ئێلەکە |
| ٤٥ | ١ | ١٨ | پێێ | پیێ |
| ٤٥ | ١ | ١٩ | پێێ | پیێ |
| ٤٦ | ٢ | ١١ | دخاپێنێ | دخاپێني |
| ٤٧ | ٢ | ١٣ | دسوراني | دسۆراني |
| ٥١ | ٢ | ١٣ | خورانێ | خوارنێ |
| ٥١ | ٢ | ١٥ | خورائێ | خوارنێ |
| ٥٢ | ١ | ٢٠ | وغید | وغەید |
| ٥٢ | ٢ | ٢٣ | وائی | وانێ |

| رووپەل | ستون | خێز | چەوت | راست |
|---|---|---|---|---|
| ٥٤ | ١ | ٢١ | نەگوتیە | نەگۆتیە |
| ٥٥ | ١ | ١٠ | بعربي | بعەرەبي |
| ٥٦ | ٢ | ١٣ | بە | یـــە |
| ٥٧ | ١ | ١٢ | نافدا | نافدار |
| ٥٨ | ١ | ٢٣ | یەکێ | یەکي |
| ٦٠ | ١ | ٢٠ | رازۆێ | رازۆرێ |
| ٦٠ | ٢ | ٨ | بداخوازە کي نە | بداخوازەکێ نە |
| ٦٠ | ٢ | ١١ | تێزەکە | لیزەکە |
| ٦١ | ١ | ٣ | بەشتەوي | بەشتنەوي |
| ٦١ | ١ | ٢٤ | المبێن | المبـــین |
| ٦٤ | ١ | ٥ | خوشگ | خوشک |
| ٦٤ | ١ | ١١ | آغ | آغێ |
| ٦٤ | ١ | ٢٤ | یانێ | یاني |
| ٥٦ | ١ | ٢٣ | دخوت | دخون |
| ٦٥ | ٢ | ٤ | حەس مەسوک | حەس حەسوک |
| ٦٥ | ٢ | ١٩ | وزێ کر | وژێ کر |
| ٦٦ | ٢ | ١٧ | کوم | کۆم |
| ٦٦ | ٢ | ١٨ | کوم | کۆم |
| ٦٧ | ١ | ٢ | بارمە | بارامە |
| ٦٩ | ١ | ١ | وزوغوزە | وزوغورە |
| ٦٩ | ١ | ١٩ | ب جێ | ب جي |
| ٦٩ | ١ | ٢٢ | چۆنی | شوني |
| ٦٩ | ٢ | ١٤ | بێبێ | بی بێ |
| ٧٣ | ١ | ١٥ | وتەتگ تر | وتەنگ تر |

| روپەل | ستون | ریز | چەوت | راست |
|---|---|---|---|---|
| ٧٤ | ١ | ٦ | وفیفانه | وفیفانه |
| ٧٥ | ١ | ١٠ | وفیفان | وفیفانه |
| ٧٦ | ٢ | ١٥ | نشته کی | تشته کی |
| ٧٨ | ١ | ١٤ | باردام | باردام |
| ٧٩ | ٢ | ١٢ | وعراغێ | وقراغێ |
| ٨٠ | ٢ | ٣ | نوبەدازە | نۆبەداره |
| ٨١ | ٢ | ١٠ | شیسنێ | شینێ |
| ٨٤ | ١ | ٧ | سرا وخفیة | صوتیه |
| ٩٨ | ٢ | ١٣ | دەبدەبە | دبدبە |
| ١١٤ | ٢ | ٨ | الخشونة | الخشن |
| ١٢٥ | ٢ | ٧ | درا | داوا |
| ١٤٣ | ١ | [illegible] | یەیک رێی | یەکریی |
| ١٤٨ | ١ | ١٢ | ویەحرێ تاچیک | وبەحرێ تاچیک |
| ١٥٥ | ٢ | ٧ | رێز دبن | ورێز دبن |
| ١٦٤ | [illegible] | ١٣ | نقشتێ | نقشتێ |
| ١٦٥ | ١ | ٩ | گەلەل | گەلەک |
| ١٦٥ | ٢ | ٦ | کورانج | کورمانج |
| ١٦٨ | ١ | ٢٢ | عاموره | عامودة |
| ١٧٠ | ٢ | ٢ | لهەمبە | لهەمبەر |
| ١٧١ | ١ | ١٣ | شەرکیتاند | شەکیناند |
| ١٧٤ | ٢ | ٧ | دکەفێ | دکەفي |
| ١٧٧ | ١ | ٩ | ژێدە | ژێدە |
| ١٧٩ | ١ | ٦ | بادزا | بازدا |
| ١٧٩ | ٢ | ٢ | چێکرتە | چێکرن |

| روپەل | ستون | خێز | چەوت | راست |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١٨٢ | ٢ | ٧ | ودربەرە | ودبەرە |
| ١٨٣ | ١ | ٤ | شکەسکت | شکەست |
| ١٨٣ | ٢ | ١٨ | نە | تـە |
| ١٨٣ | ٢ | ١٩ | تە ـ تو | تـو |
| ١٨٤ | ٢ | ١٦ | دناق | دناف |
| ١٨٥ | ١ | ١ | لەف | لەق |
| ١٨٧ | ١ | ٣ | كوندي | گوندي |
| ١٨٧ | ١ | ١٠ | دکەفێ | دکەفي |
| ١٨٩ | ١ | ١ | درەبەکي يەکە | دەرەبەگي‌يەکە |
| ١٨٩ | ٢ | ١ | غەمکیرە | غەمگیرە |
| ١٩٢ | ١ | ١١ | ژکوندێ | ژگوندێ |

چەندچەوتی دفەرهەنگایەکێدە

| روپەل | ستون | خێز | چەوت | راست |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ٤٥ | ٢ | ١٩ | درۆژآڤایێ فرانسادەیە | دراژۆرێ فرانسادە یە |
| ٢٩٥ | ١ | ٢٠ | نافێ جهکيڵ هێـــلا سلیمانێ‌یە | نافێ‌چەمەکی ل‌هێـــیلا سلیمانێ‌یە |
| ٣٣٠ | ٢ | ١٤ | بەرچاك ژئەفریقا یـــە | بەرچاك ژئەمریکا یە |
| ٣٠٠ | ٢ | ١٦ | جزيرة أفريقية | جزيرة أمريكية . |

# فهرەست

# فهرەست